بسم الله الرحمن الرحيم

# مەملەکەتی عیشق

نووسینی: ماکوان کەریم

پێداچوونەوە: شەوبۆ جەلال


کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی



بەڕێوەبەری گشتی: موحەممەد خضر ئەحمەد 07824671394 - 07504671394
بەڕێوەبەری هونەری: موستەفا موحەممەد کوردی 07509998182
فەیسبووک: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی/ M.Ktebxana
ئنیستگرام: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی/ M.Ktebxana
لقی یەکەم: بەرانبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری
لقی دووەم: چوارڕیانی شێخ مەحمود - بەرانبەر مزگەوتی مەحمود عەلاف
ئیمێل: mdmaktaba@gmail.com

نەخشەسازی ناوەوە: موستەفا موحەممەد کوردی

نەخشەسازی بەرگ: برەو النجار

چاپی حەوتەم: ٢٠٢٥

پێوانە: ١٤ *٢١

تیراژ: ١٥٠٠

لاپەڕە: ٤٧٦

نرخ: ٨٠٠٠

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/ هەرێمی کوردستان

ژمارەی سپاردنی (١٣٧٦) ساڵی (٢٠١٧)ی پێدراوە.

## پێشەکی:-

ئەم بەسەرهاتانەی کە دەیخوێنیتەوە، بە شێوە و ئوسلوبی پەروەردەیی و پەروەردەکردن نووسراوە، بۆ ئەوەی خوێنەر کە دەچێتە ناو باس و خواستەکانی هەستبکات خۆی کارەکتەری ناو باسەکەیە.

ڕاستە نووسینە، بەڵام بە شێوەی فیلم و وێنە کامێرائاسا بۆتان وێنا کراوە، ئوسلوبی ئەدەبی زۆری تێدا بەکارنەهاتووە، بەهۆکاری ئەوەی خۆراکی هەموولایەك بێت و واقیعی ڕووداوەکان باسکراوە، وەك ئەوەی لەو سەردەم و جێگایانە دا چۆن گفتوگۆ کراوە، جۆری ئاخاوتنەکان چی بوون.

لەم بەسەرهاتانەدا ناوی زۆربەی کارەکتەرەکان گۆڕاوە، هەندێکیشیان کە هیچ کاریگەری کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئەخلاقی نەکەوێتە سەر (وەکو) خۆی باسم کردووە، شوێنی گیرانەکان، ناوی بەرپرسەکان، ناوی جێگا دیارەکان هەمووی وەك خۆی نووسراون، ساڵم لەهەندێ جێگادا دەستنیشان نەکردوە، چونکە بەئاسانی ناوی کارەکتەرەکان ئەدۆزرێتەوە، نووسەر _ نەیویستووە ئەو ناوانە ئاشکرا بێت، یان بەهۆکاری ئەخلاقییە، یاخود کۆمەڵایەتی و سیاسییەوە، تەنها ئەوە هۆکار بووە، بەڵام ڕووداوەکان هەموو ڕوویانداوە.

پێناچێت لەوە زیاتر پێشەکی بووێت، لەبەر ئەوەی ئەمە ئوسلوبێکی ڕاوی و گێڕانەوەی بەسەرهاتە، ئەم بەسەرهاتەش چیرۆکی بەرئاگردان نییە،

بەڵکو ڕاستی و واقیعە بۆ ئەوەی بونیاتی کەسایەتی خۆتی لەسەر بکەیت....

بەهیوای ئەوەی مەملەکەتی عیشق ببێتە هۆکاری ئەوەی تۆ پەروەردە بیت لەسەر ئەو ئوسلوبەی کە نووسەر دەیەوێت، کەسایەتییەکی بەهێز خاوەن ئیرادە، دوور لە تەمەڵی، هەوڵدان بۆ سەرکەوتن و فێربوونی مامەڵە و گفتوگۆ لەگەڵ دوژمنان، چاونەترسی، وەفا و پیاوەتی، شەڕەف و پاراستنی کەرامەتی خەڵکی، ڕاستگۆیی، واقیع بینی لە ژیاندا.

ماکوان کەریم
فرێدریکستاد/ نەرویج
٢٠١٧/٢/١٤



## پێشەکی چاپی دووەم

خۆشویستن ڕووداوێکە ئەبێ ڕووبدات

ئەگەر ڕوونەدات ژیان سارد دەبێت

ئەگەر ڕووبدات وردە وردە هەموو ژیانت ئەسووتێت

خۆشویستن حەدی وەسەتی نییە....

ئەگەر کەسێکت خۆش نەوێت شاد نابیت

خۆ ئەگەر کەسێکت خۆشویست غەمگین ئەبیت

تەنها مەگەر خوای پەروەردگارت لە هەموو کەس و هەموو شت خۆشتر بووێت ئەوکاتە دەگەیتە کەناری ئارامی.

کاتێك کە پێشەکی چاپی دووەمی مەملەکەتی عیشق دەنووسم خۆشحاڵم، بەڵام لەهەمان کاتیش ناڕەحەتم.

خۆشحاڵم کەوا لە ئەسەرێکی ئاوا جوان بەشێکی بچوکی بەمن دەکات، لەهەمان کاتیشدا ناڕەحەتم بەوەی کە ئەبوایە ماکوان خۆی ئازاد بوایە و پێشەکی چاپی دووەمی بنووسیایە.

بەداخەوە کە لە ئێستادا ئەو مەجالە نەبوو کەوا خۆی لە خزمەتی خوێنەرانیدا بوایە، هەرچەند داوام لێکرد خۆی شتێك بنووسێت، بەڵام





بەداخەوە بەهیچ جۆرێك ناتوانێت نامە یاخود نووسراوەکانی بنێرێتە دەرەوەی زیندان، بۆیە ئەم ئەرکەی بە من سپارد کەوا لە جیاتی ئەو لە خزمەتی خوێنەرانی ئازیزیدا بم.

هیوادارم کە کتێبی مەملەکەتی عیشق وەك ڕۆمانێکی عاشقانە تەنها بۆ خوێندنەوە و کات بەسەربردن نەبێت، بەڵکو لەم بەرهەمەوە فێری ئەوە بن کە کەسایەتی خۆتان پەروەردە بکەن، بەهێزبن و لەسەر پێی خۆتان بوەستن.

فێربن کەوتن و هەڵەکردن عەیب نییە، بەڵکو هەڵنەستانەوە عەیبە، فێربن هەرکات کەوتن، زۆر بەهێز و جورئەتەوە دەست بدەنە ئەژنۆتان و هەستنەوە، وە هەستانەوەشتان بۆ سەرکەوتن و بەئامانج گەیشتن بێت، هەرکاتیشبە ئامانج نەگەشتیت نائومێد و ماندوو نەبیت، بەڵکو ڕێگاکەت بگۆڕە و بەردەوام بە، چونکە هەموو کەوتن و شکستێك دنیایەك وانەت فێردەکەن کە هەریەك لەوانە دەبنە چرا بۆ ڕوناککردنەوەی ڕێگای داهاتووتان.

باران ئاریایی
فرێدریکستاد/ نەرویج
٢٠٢٢/٢/١٨



لە ماموٚستای ئایینیان پرسی: عیشق چییە؟
وتی: حەرامە!

لە ماموٚستای ئەندازیارییان پرسی: عیشق چییە؟
وتی: بازنەیەکە بەدەوری چەقی دڵدا دەسوڕێتەوە.

لە ماموٚستای مێژوویاب پرسی: عیشق چییە؟
وتی: ڕووخانی ئیمپڕاتۆرییەتییەتی دڵە.

لە ماموٚستای ئەدەبییان پرسی: عیشق چییە؟
وتی: پاکترین هەستە.

لە ماموٚستای زانستیان پرسی: عیشق چییە؟
وتی: تەنها ماددەیەکە بەبێ ئۆکسجین دەسوتێت.

لە ماموٚستای بیرکارییان پرسی: عیشق چییە؟
وتی: ژمارەیەکە هەرگیز بەتەنها نییە.

لە ماموٚستای کیمیایان پرسی: عیشق چییە؟
وتی: تەنها ترشەلۆکێکە کاریگەری دەکاتە سەر دڵ.

لە ماموٚستای فیزیایان پرسی: عیشق چییە؟
وتی: تەنها موکناتیسێکە دڵ ڕادەکێشێت.





لە مامۆستای دارِشتنیان پرسی: عیشق چییە؟
وتی: تەنها بابەتێکە ناتوانیت لەسەری بنووسیت.

لە مامۆستای وەرزشیان پرسی: عیشق چییە؟
وتی: تەنها تۆپێکە هەرگیز ئاوت نابێت.

لە مامۆستای رِێزمانیان پرسی: عیشق چییە؟
وتی: تەنها فەرمانێکە رِابردوو و ئێستای نییە.

لە مامۆستای زیندەوەرزانییان پرسی: عیشق چییە؟
وتی: تەنها میکرۆبێکە لەرِێگەی چاوەوە تووشت دەبێت.

لە ماکوانیشیان پرسی: عیشق چییە؟
فەرمووی وڵامەکەی لە مەملەکەتی عیشق دا بیخوێننەوە....

بۆ من بەسە کە لە نێوانی بۆنی خۆشی
هەناسەتدا، دەستەکانت بۆ من بێت...
لەگەڵ تۆ دڵۆپەکانی باران ئاسانە، فوارەی
بەورکانیش خۆشە!

# چیرۆکی یەکەم

## من و بەیان

لەم سەفەرەمدا کە لە نەرویجەوە گەڕامەوە بۆ کوردستان، ئێوارەیەك داوام لە پێشڕەوی برام کرد کە پێکەوە بڕۆین بۆ گەڕەکی کۆنی خۆمان کە زۆربەی ژیانی لاوێتی و هەرزەکاریم لەو گەڕەکە دا بردبووە سەر.

پێشڕەو ڕازیبوو و پێکەوە چووین لە بەردەم دەرگای ماڵە کۆنەکەی باپیرم دا ڕاوەستاین.

بە پێشڕەوم وت با تۆزێک بووەستین دەرگای دراوسێکەی بەرامبەرمان کرایەوە، لەپڕ ئەو کچە دەرکەوت کە ساڵی ١٩٩٣ خۆشم دەویست هاتنە دەرەوە بەدوایدا ٣ منداڵ هاتن دوو کچ و کوڕێك.

ناچار تەماشای ئاوێنەی سەیارەکەم کرد بە پێشڕەوم وت هێواش بڕۆ، هێواش هێواش ئەو دوور دەکەوتەوە و برینی من قوڵتر دەبووەوە، هەموو یادگارییەکانم دەهاتنەوە بەرچاو.

چوومە ئەو سەردەمە و یادگارییەکانی ساڵانی زوو وەک هەور دایپۆشیم، بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەم کچە کاتێك ماڵیان هاتە گەڕەک وەك هەموو دراوسێیەکی ئاسایی چووین بە دەم باوکییەوە و ماڵەکەمان لەگەڵ داگرتن.

بیرمە لەگەڵ هاوڕێیەکم بەناوی سەرباز هاتینە دەرەوە و وتی: خەسرەو بەخوا کچە گەورەکەیان جوان بوو.

بەخوا ناوەنجییەکەیان شاز بوو.

خەسرەو: من و سەرباز تەوزیعمان کرد کچە گەورەکەیان بۆ ئەو ناوەندییەکەش بۆ من!

گەڕەکی ئێمە هەموو خەڵکی ناوچەکانی پێنجوین و شارباژێر بووین، بەکورت و کرمانجی واتا هەموو عەشایەر بووین.

ئیتر بەگەڕەکدا بانگدرا کە کچە گەورەکەی کاک بەکر بۆ سەربازە، ئەو ٤ ساڵ لەمن گەورەتر بوو، ناوی ڕێزان بوو، کچە ناوەندییەکەش کە ئەوسەردەمە دەمان وت ناوەنجییەکە، ناوی بەیان بوو بۆ بەندە دانرا.

ئەم دانانە تەنها قسەی ناو گەڕەک بوو، هیچ پەیوەندی بەو کچە فەقیرانەوە نەبوو.

ڕۆژان ڕۆشتن و من و سەرباز هەر باسی ڕێزان و بەیانمان دەکرد، بەبێ ئەوەی ئەوان بەخۆیان بزانن، دە جار شەڕم کردووە لەسەر بەیان کە هیچ کوڕێکی گەڕەک بۆی نەبوو باسیان بکات.

بیرمە ڕۆژێک کەسێکی فێڵباز هەبوو لە گەڕەکەکەماندا ناوی سەردار بوو، پێمنا دەوت سەرەقەل، هات بۆ لای من و سەرباز وتی: دوو کوڕی گەڕەکی توی مەلیک فێربوون بە مێبازی لەگەڵ ئەو دووکچەی بەکردا، عەیب ناکەن ئێوەش قبووڵی دەکەن!



ئیتر منیش شێت بووم، وام دەزانی ژنی خۆمە، سەرباز لەمن خراپتر، بەبێ ئەوەی بەیان بزانێت و من هیچ باسێکیشم نەکردبوو، دوو کوڕەکە بە گەڕەکی ئێمەدا هاتن من و سەرباز ڕێگەمان پێگرتن و وتمان: بۆ دێن بەم گەڕەکەدا؟

ئەوانیش وتیان کاکە ئەمە زەوی خوایە، ئارەزووی خۆمانە خۆ نەتانکڕیوە، بەهەر حاڵ قسە لەمن و قسە لەوان بووبە شەڕ من ئەبو ئەڵقەم دەرهێنا و دوانم دا لەوان و ئەوانیش دەستی خۆیان وەشاند، دواییش بۆمان دەرکەوت سەردار درۆی لەگەڵ کردووین ئەو دوو کوڕە فەقیرە کاسب بوون بەدوای شتی ناوماڵدا دەگەڕان لە گەڕەکەکاندا، سەرداریش هەمان ئیشی ئەوانی دەکرد و لەو زیاتریان دەدا بەشت و خەڵکیش بەوانی دەفرۆشت، بۆیە سەردار ڕقی لێان بوو شەڕەکەی بە ئێمە کرد، بەڵام لە دواییدا چووین تێر و پڕمان لە سەردار دا و لەگەڵ دوو کوڕەکەی تردا بووین بە هاوڕێ.

شەوانیش لە دوکانی پیاوێک کۆدەبووینەوە و جاری واهەبوو گۆرانی و قسەی خۆشمان دەکرد، هەریەک لە ئێمە گۆرانی بەسەر خۆشەویستەکەی خۆیدا دەوت، ماوەی شەش مانگ بەم شێوەیە مایەوە، من گۆرانیم بە باڵای بەیان ئەوت و سەربازیش بۆ ڕێزان بەبێ ئەوەی ئەو کچە فەقیرانە ئاگایان لەهیچ بێت.

ئیتر ئیحترامەن بۆ من و سەرباز کەس سەیری بەیان و ڕێزانی نەدەکرد، ئێمەش تەماشای ئەو کچانەمان نەدەکرد کە کوڕانی گەڕەک وتبوویان حەزمان لێیانە.




ئەو سەردەمەش بە خۆشەویستەکانمان دەوت دەنکەکانمان.

من بەسروشتی خۆم هار و هاج بووم نەمدەتوانی پێنج خولەک لە جێگایەکدا خۆم بگرم، بەڵام لەگەرمای هاوین و سەرمای زستان لەسەر سەربانی خۆمان وەکو دار چەقیبووم، ئەوەندەش شەرمن بووم باپیرم داری کڕیبوو بۆ زۆپای دار بۆ زستان، ئەودەمە نەوت نەبوو، بۆخۆ مەشغوڵکردن دارەکانم لەمبەری سەربانەکە دەگواستەوە بۆ ئەمبەری سەربانەکە، وابزانم زیاد لە چەند سەد جارێک ئەو کارەم کرد، نەنکیشم هاتبووە سەربانەکە ئەیووت هەتیو تۆ شتێکت شاردۆتەوە لە ژێر ئەم دارانە دا، منیش دەموت دایەگەورە گیان ئەگەر دار لەیەک جێگادا دابنرێت بۆ موسەلەحەکە خراپە، ئەودەمە بە سەربانی کۆنکرێت دەوترا موسەلەح، قەناعەتم کرد بە دایەگەورەم.

منیش هەموو بەیانییەک دەچووم بۆ نان کڕین، بەڵام لەو کاتەوە کە ئەوان هاتبوونە گەڕەک دەچووم بۆ نانەوا نانم دەهێنایەوە بۆ نەنکم و باپیرم، پێش ئەوەی ئەوانیش بێنە ئەو گەڕەکە بەشەق خەبەرم نەدەبووەوە.

باپیرم دەیوت بەخوا خەسرەو بووە بە پیاو!ئێستا ناهێڵێت ئێمە بچین بۆ نانەوا نان بهێنین.

بەیانییەکیان _ بەیان _ هاتە دەرەوە بۆ مەکتەب دەچوو، منیش بەبەردەم ماڵەکەیاندا هاتم، هەر ئەوەندە وتی خەسرەو چۆنی؟ لە خۆشیدا نیو سەعات وەڵامی چۆنی و چاکییەکەیم دایەوە، ئەگەر وەک تەسجیل هەلبکرایەتەوە ١٠٠ جار هەڵم دەکردەوە ئەو چۆنی و چاکییە.



منیش لە خۆشیدا وتم نان نابەیتەوە بۆ ماڵەوە بۆ ئێوەم هێناوە، لە خۆشیدا هەموو نانەکەم دا بە بەیان و ئەویش سوپاسی کردم لە خۆشیدا وام دەزانی هەموو دونیا هی خۆمە، پارەشم پێنەبوو نانی تر بکڕم، چونکە تەنها سێ کەس بووین من و نەنکم و باپیرم چوومەوە بۆ ماڵەوە، باپیرم وتی: کوا بۆ نانت نەهێناوە؟

نەم دەوێرا درۆ بکەم خاوەنی نانەواکە ڕەفیقی باپیرم بوو، بچوایە دەیوت خەسرەو نانی هێناوە، ناچار وتم: هەندێک کەرم بینی بەڕەڵا کرابوون برسیان بوو نانەکەم دا بەکەرەکان.

ئەو سەردەمەش لە شاری سلێمانی کەری زۆر بەڕەڵا ببوون، منیش ویستم بیکەم بە پیاوەتی وتم: بەزەییم بەو کەرانەدا هاتەوە قەیناکە لە ڕۆژانەکەی خۆم بیبڕن، باپیرم وتی: بەزاتی خوا ئەم کوڕە زۆر گۆڕاوە، ئەی ئافەرین خەسرەو گیان، ئەو ڕۆژە ٧٥٠ فلسم وەرگرت ڕوبعێک زیاتر لە ڕۆژانی تری دامێ وەک پاداشت، خێرا ناردمیەوە بۆ نانی تر.

ڕۆژێک کاوەی هاوڕێم بینی لەگەڵ کچێکدا قسەی دەکرد لە ڕێگەی مەکتەب دەگەڕایەوە، لەسەر جادەی مەکتەبی بنار، منیش چووم بۆ لای کاوە.

وتم: کاوە گیان بە قوربان فێرم بکە کە چۆن قسە لەگەڵ کچ بکەم؟

کاوە: فێرت دەکەم، بەڵام دەبێ تێکەڵەیەکم بۆ بکڕیت، واتا مەحلەبی و شعرییە.

وتم: بەسەر چاو بەس فێرم بکە، هەر تۆ و تێکەڵە،






کاوە فێری کردم و وتی: بەیانی جوان خۆت بگۆڕە کە چوو بۆ مەکتەب لە ڕێگا بڵێ کچی باش بەیارمەتی، دەمەوێت پەیوەندیمان هەبێت و من هەموو شەوێک هەر بیر و خەیاڵم لای تۆیە، حەز دەکەم پەیوەندی زیاترمان هەبێت، بڵێ نامەیەکیشم بۆ نووسیویت بەس لە بیرم چووە کاتێکیتر بۆت دێنم، بۆ ئەوەی مەجالیتر درووست بکەیتەوە بۆ قسەکردن ئەگەر ئەوجارەش ڕازی نەبوو.

خۆم حازرکرد بۆ بەیانی کام جلوبەرگ جوان بوو کردمە بەرم، ئەو بەیانییە وتیان دەچیت بۆ نان، وتم نا ئیشم هەیە خۆتان بچن من لە مەکتەب دەرسی زیادەمان هەیە دەڕۆم و دێمەوە با وانەکانم نەفەوتێ.

چوومە بەردەم بەیان و هاوڕێیەکیتری لەگەڵدا بوو، بەخوا هەناسەم سوار ببوو لێوم وشک ببوو، هەموو گیانم ئەلەرزی دەتووت دەچم بۆ لای فیرعەون و لەگەڵ فیرعەون قسەدەکەم، بەهەرحاڵ هاوڕێکەی بەیان ـ بەیانی ـی جێهێشت و بەیان ـیش بە منی وت: فەرموو خەسرەو چیت دەوێت؟

وتم: ئەتوانین کەمێک قسەبکەین بەیەکەوە؟

بەیان: بەڵێ ئەتوانیت ئەی بۆ وا سوور بوویتەوە خەسرەو خۆ هیچ ڕووی نەداوە؟

وتم: نەوەڵە بەس حەزەکەم قسەبکەین ئەگەر مەجالت هەیە؟

بەیان: بەدڵنیاییەوە فەرموو فەرموو!



## چیرۆکی دووەم

## من و دالیا

لەدوای ئەوەی بەیانییەک لە ڕێگەی قوتابخانە ڕێگەم گرد لە بەیان و داوای ئەوەم لێکرد کە قسەبکەین، بەیان زۆر بەسادەیی وتی: فەرموو خەسرەو بۆوا سوور بوویتەوە.

ڕاستی دەکرد بەیانییەکی ساردی سلێمانی من هەموو گیانم عارەق بوو لە ڕاستی دا ئاو بە گیانم دەچۆڕی وەک ئەوەی کرێکاری بکەم، بەهەرحاڵ کەوتمە قسە لەگەڵ بەیان و ڕاستەوخۆ بۆم باسکرد کە حەز دەکەم پەیوەندییەکی خۆشەویستی لە نێوانماندا هەبێت.

بەردەوام بە ڕێگادا قسەم بۆ دەکرد وتم: خۆشەویستی تۆ ژیانمی هەموو لێتێکداوم ئیتر چارەم نەماوە، هیچ توانام نەماوە بۆیە پێت دەڵێم بەیان زۆرم خۆشدەوێیت، لە خۆشەویستییەکی پاکیش هیچ داوایەکی ترم نییەلە تۆ.

ئەوەندە قسەم نەکرد نازانم چۆن بوو زۆری نەمابوو بگاتە ناو قوتابخانەی بنار خوا خوام بوو ئەو ڕێگایە بە ساڵێک تەواو بێت.

بەیان: ببورە خەسرەو ناتوانم.

وتم: بۆ ناتوانی؟ بەخوا لەتۆ زیاتر کەسم خۆشناوێت.





بەیان بە تورەییەوە وڵامی دامەوە وتی: خەسرەو ببورە من ناتوانم لەگەڵ تۆ خۆشەویستی بکەم، لەبەر ئەوەی من لەگەڵ کەمال پەیوەندیم هەیە و نامەوێت خیانەت لە پەیوەندی ئەو بکەم، کەوای وت خەریک بوو شێت بم، ئەوەی لە ژیانم ڕقم لێی بووە ئەو کەمال_ە بووە زیاد لە دە جار شەڕم لەگەڵ کردووە، بۆ نەگبەتی باوکیشی شەریکی باپیرم بوو، دەچوون لە سەر سنوور چرای فانۆس و سێو و بستە و کێک و نوقڵی مینۆیان دەهێنا.

هەستم دەکرد ئەژنۆکانم هێزیان نییە، هیچم بۆ نەوترا تەنها لە دەمم دەرچوو وتم: جا توخوا کەماله هیچ و پوچ پیاوی ئەوەیە تۆ حەزی لێبکەیت لوسی وا چییە، بەخوا بێت بەلات دا ئەی تۆپێنم!بەیان دەستی کرد بە پێکەنین و وتی: خەسرەو ئەی تۆ بۆچی ناچیت بۆ لای خۆشەویستەکەی خۆت؟

منیش خێرا وتم: بەخوا خۆشەویستم نییە لە تۆ زیاتر.

بەیان: ئەی نازانیت دالیا تۆی چەند خۆش دەوێت؟

دالیا_ش دراوسێی ئەوان بوو ماڵیان لە تەنیشت یەکترەوە بوو ماڵی هەردووکیان بەرامبەر ماڵی باپیرم بوو، وتم: ئەوەندەی من بزانم دالیا دەنکی دانا_یە.

بەیان: نا_ وانییە_ ئەو شێتی تۆیە تەنانەت لە ماڵەوە وێنەی تۆشی کێشاوە و بە بۆفیەکەیدا هەڵیواسیوە.



له ڕاستیدا هەروەک چۆن لە نێون کوڕانی گەڕەکدا کچان دابەشکرابوون، بە ئارەزووی کوڕەکان هەروەها لە نێوان کچانی گەڕەکیشدا کوڕەکان دابەشکرابوون.

من نەمزانیبوو کە دالیا حەزی لە منە، منیش وا هەستم دەکرد دالیا حەزی لە کوڕێکی ترەوە ناوی دانا بوو، بەڵام وا دەرنەچوو، لە هەموو ناخۆشتر بۆ من ئەوە بوو دالیە خوشکی سەربازی هاوڕێی خۆمە، لە ماڵیان دا چەندجار نانم خواردووە.

بەیان جێی هێشتم، کاوەش لە دوورەوە چاوەڕێی دەکردم بۆ ئەوەی تێکەڵەی بۆ بکرم بەو بەیانییە زووە، منیش لەگەڵ دار و بەردا شەڕەکەم و خەفەتی کامەل_ە لوسیش لەولاوە بووەستێت.

کاوە بانگی کردم و وتی: وەرە چی بوو؟

منیش دەنگم بەرزکردەوە بەسەریدا و وتم: هەتیو بێیت بەلاما کەلەت ئەتەقێنم، لاچۆ لەبەر چاوم.

کاوە: هەتیو توڕە مەبە، ئەگەر ڕازی نەبووە کێشە نییە هەر ڕازی دەکەم بۆت، یان درۆ دەکەیت بۆ ئەوەی تێکەڵەکەم بۆ نەکڕیت؟

وتم: کوڕە کەرە ئەو دەڵێت حەزی لە یەکێکیترە، حەزی لە کەمال_ی شەریف_ە لوسە تۆ بۆ تێناگەیت.

کاوە: بەڕاستە؟



وتم: نا بەچەپمە؛ لەسەر شۆستەی جادە ٣٠ مەتریەکە دانیشتم بەو بەیانییە باران دەباری نم نم.

کاوە: هەستە تەڕەبیت.

وتم: کاوە توخوا وازم لێبێنە.

کاوە ڕۆشت و منیش بیرم دەکردەوە، خوایە بڕۆم لە کەمال بدەم و بڵێم نەچیت بەلای ئەو کچەیا، وردە وردە خۆشەویستی دالیا لە دڵم چەکەرەی دەکرد، سینەمای خەیاڵم ببوو بە دووبەش، بەشێکی لای بەیان بوو بەشێکی تریان دالیا داگیری کردبوو.

نەمدەزانی چی بکەم، دالیا زۆر لە بەیان جوانتر و ناسک تر و منداڵ تریش بوو، بەڵام دەمێک بوو لەو گەڕەکە دا بوون و تێکەڵ بووین، سەربازی_ش هاوڕێم بوو زۆر قورس بوو بەلامەوە.

سەرباز تا بڵێی کوڕێکی ئازا و هاوڕێی گیانی بەگیانی یەکتری بووین، چەندەها کاری سەیر و سەمەرە و شەڕ و شەڕە گەڕەکمان کردبوو، هەرگیز یەکترمان جێنەهێشتبوو لە خۆشی و ناخۆشی دا، هەندێکجار لەماڵەوە دەردەکرا یان من دەردەکرام جێگە و پەناگەمان لەی یەکتر بوو.

دوو بە دوو هیچ کەس دەرەقەتمان نەدەهات، ئەگەر لێیانیشمان بخواردایە هەمیشە بە تاک تاک دەیان گرتین لێیان ئەداین، دوایش دووبەدوو تۆڵەی خۆمانمان دەکردەوە.



چوومەوە ماڵەوە لەبەردەرگا_ باوکی بەیان_م بینی سەیارەکەی ئیشی نەدەکرد، وتی: ئا کاکە خەسرەو گیان پاڵێکم پێوە بنێ.

ئینجا وەرە ئەو دڵەت شەق.نەبات ناچار وتم: بەسەرچاو وەستا بەکر گیان لەخزمەتدام، لادەیەکی ١٩٧٧ پێبوو تا سوجی کۆڵانەکەی ئەوسەر پاڵم پێوەنا کەچی کە سەیارەکەی شۆڕکردەوە بەرەو مزگەوتی علی کەمال خواحافیزیشی لێنەکردم ئەو سەگبابە، هەزار و یەک جنێویتریشم پێدا.

هاتمەوە بۆ ماڵەوە نەنکم و باپیرم لە خەو هەڵنەسابوون.

باپیرم: ئەچی نان بێنیت؟

وتم: نەوەڵڵا، تاقەتم نییە.

باپیرم لەبەر خۆیەوە: کەرێتیەکەت سەری هەڵداوەتەوە؟

خۆم کرد بەناو جێگا لە داخا خەوتم: نەنکیشم هەڵینەساندم وایزانی بوو چووم بۆ مەکتەب، کە خەبەرم بوویەوە سەعات ٢ی دوای نیوەڕۆ بوو، سەرم قورس بوو، ئەو ماوەیە ماڵی نەنکم بەجێهێشت چوومەوە بۆ ماڵی خۆمان بۆ لای دایکم، ئیتر تاقەتی چوون بۆ مەکتەبیشم نەما، بۆ ئەوەی نەسوورێمەوە دوکانێکیان بۆ دانام خەریکی فرۆشتنی شتی وشکە بووم.

کوڕانی گەڕەک دەهاتن بۆلام بۆ دوکان دادەنیشتن، منیش جاروبار دەچوومەوە بۆ ماڵی نەنکم و جاروباریش تەماشایەکی ماڵی سەرباز_م دەکرد دەمووت بزانم دالیا نابینم.




جارێکیان بە سەرباز_م وت: هەرچیتان کردووە با تۆزێک لە کەمال بدەین بەهەرحاڵ لێدانەکەی کەمال سەری نەگرت.

لەبەر ئەوە ڕقمان لەکەمال بوو، چونکە پارتی بوون، ئێمەش زۆربەمان یەکێتی بووین، تازەش چووبەینە ناو یەکێتییەوە، پێشتر هەموو حسک بووین، چونکە ئەو سەردەمە کاکە حەمەی حاجی مەحمود چووە ناو پارتی ئێمە لە شانەکەی مام ئاراس هاتیینە دەرەوە هەموو بووین بە یەکێتی، کە گەورەترین شانەی ئەو سەردەمەی حسک بوو لە سلێمانی کوڕێک سەرپەرشتی شانەی ڕێکخستنەکانی دەکردین ناوی کاک محمد بوو، بەهەرحاڵ کە حسک چووە ناو پارتی ئێمەش هەموو بوینە یەکێتی.

کات ڕۆیشت و زەمەن هەموومانی وەک چەقۆ دەبڕی، شەڕی یەکێتی و پارتی دەستی پێکرد، سەرباز بووە لیوای تایبەت، لای جەلال_ی عەلی مام قادر لە لیواکەی سالار عەزیز، منیش چوومە ڕێکخستن لە کۆمیتەی سێ_ی کاسبکاران لای عبدوڵڵا_ی حاجی سەعید.

بەداخەوە لە شەڕی ناوخۆ سەرباز کوژرا، باوکی منیش لە سالی ١٩٩٢ کوژرابوو دوای دووساڵ سەربازی هاوڕێمش کوژرا، زۆر کاریگەری هەبوو لەسەرم.

لە تەعزیەکەی سەرباز دایکی سەرباز سەری خستبووە سەر شانی من و منی ماچ دەکرد هاواری دەکرد بە گریانەوە بۆنی سەرباز گیانت لێدێت، منیش هەموو دەرونم ئەکوڵا، دالیاش لەولاوە تەماشای دەکردم و دەگریا، بێجگە حاجی سەعید_ی باوکی کە بەکوڵ بۆ سەرباز دەگریا، منیش



نەمدەزانی چۆن لەو ماڵە خۆم دەرباز بکەم، بۆ حورمەتی سەرباز و خۆشەویستی دالیا_ش ڕۆژ بە ڕۆژ چەکەرەی دەکرد لە دڵما.

ڕۆژێک دالیا هات بۆ دووکان بۆ لام لەگەڵ دایکی بۆ شت کڕین، هەندێک پێداویستی ماڵیان کڕی وەک برنج و ڕۆن و شەکر و چا هتد....، وتم: بڕۆن، (دایکی سەرباز) سەبری خان خۆم بۆتان دێنمەوە.

سەبری خان: شفتە دەکەم نان مەخۆ لای ئێمە نان بخۆ.

وتم: باشە.

چووم بۆ ماڵیان لەوێ دانیشتم لەگەڵ سەروەر_ی برایاندا دانیشتبووین حاجی سەعید هاتەوە وتی: دۆمینە بکەین یان کۆنکان؟

وتم: کامیانت پێخۆشە حاجی گیان لە خزمەتدام.

دەستمان کرد بە کۆنکان تا درەنگانێک، لە دوای ماڵئاوایی سەروەر لەگەڵما هاتە دەرەوە خوا حافیزیمان کرد.

هەندێک دوور کەوتمەوە دالیا بانگی کردم وتی: کاک خەسرەو وەرە بێ زەحمەت.

قوتووێک دۆشاوی بەدەستەوە بوو، هەندێک قسەی کرد لێی تێنەگەیشتم، گەڕامەوە بۆلای دالیا.

دالیا: بەیانی وەستا بەکر چی پێوتی؟

وتم: زۆر شتی جوانی پێ وتم دەربارەی تۆ.




داليا وتی: وەک چی؟

وتم: لیرەدا ناکرێت بەیانی دۆشاوەکە بهێنە و بزانە چی کۆنتان هەیە لە نۆک و فاسولیا بیهێنە بۆت بگۆڕمەوە.

## مردنی دالیا و سەرگەردانی خەسرەو

لە دوای ئەوەی لەگەڵ دالیا بەڵێنمان دا کە لە دووکان یەکتر ببینین، ماڵئاواییم لێکرد.

ئەو شەوە لە ناو جێگادا بیرم لەوە دەکردەوە چی پێبلێم، تۆ بڵێیت خیانەت نەبێت بەرامبەر بە هاوڕێیەتی من و سەرباز، خوا لێی خۆشبێت ئەو شەوە وەک مریشکی برژاوم لێهاتبوو لەناو جێگەدا، هەر ئەمدیو ئەمدیوم دەکرد.

ڕۆژ بوویەوە وەک پیشەی هەمیشەی بەیانیان دووکانم دەکردەوە، ئەو بەیانییە زۆر سارد بوو، عەلادینم داگیرساند و ناو دوکانم گەرم کرد، شریتێکی ماملێم خستە سەری و وردە وردە دەستم کرد بە کار.

لە کاتژمێر ٨ و نیوی بەیانی بەجلی قوتابخانەوە بە قردێلەیەکی سووری جوانەوە خۆی کرد بەدوکاندا خۆم و هەموو دوکانەکە پێدەکەنین لە خۆشیدا، وامزانی قاچم بەسەر ئەرزەوە نییە نەمدەزانی چی بکەم لەخۆشییان، لە هۆڵیا ئەفشار دەچوو.

بەو سەرمایە چوومە دووکانی دراوسێ دوو ساردی ساردم هێنا، خۆم گەرمام بوو بەو سەرمایە وتم لەوانەیە ئەویش وابێت.

نازی بەسەر من و چواردەورمدا دەکرد، نازی پێدەفرۆشتم بۆنی خۆشی و زەردەخەنەی لێوی و لارولەنجە و نازکردنی ئەوەندەی تر جوانی کردبوو.



دەستمان کرد بەقسە هەردوولا بە شەرمەوە، وەک باوی لێهاتبوو ئەو سەردەمە دەبوو هەریەک لە کوڕان و کچان (دەنکێکیان) خۆشەویستێکیان هەبێت.

لەنێوان قسەکانم دا هەردوو لا زۆر پێدەکەنین و نەشمان دەزانی بۆچی پێدەکەنین.

بەهەرحاڵ وەک پیشەی هەمیشەیی دوو خۆشەویست بەڵێنی ئەوەمان دا بەیەکتر، کە بۆیەك بین یان بۆ گڵ، هەر چەندە ئەم قسەیە لای من و ئەو دەمەش هەر کلاسیکیانەبوو، چونکە من دڵم شکابوو لای بەیان_ەوە زۆر بڕوام بەو قسەیە نەبوو، وا ئێستا دالیا جێگای بەیان_ی گرتۆتەوە، لەوە خۆشتر وێنەیەکی خۆم و خۆی درووستکردبوو بە قەڵەم ڕەساس تەنها سەرمان بوو، بەدیاری پێشکەشی کردم، منیش شریتێکی گۆرانی کەمال مەممەد_م پێشکەش کرد.

دلیام زۆر خۆشدەویست ڕۆژ بە ڕۆژ خۆشەویستی لە دڵمدا زیادی دەکرد، بڕیاری ئەوەشمان دا کە بە زووترین کات بچمە داوای، بەرنامەمان دانا کە هیچ نەبێت بڕێک پارە کۆبکەینەوە بۆ ئەوەی ئامادەبێت بۆ ئاهەنگ و شەکراو خواردن و شتێکمان بە دەستەوە بێت بۆ کەلوپەلی ناوماڵ، هەندێك هەوڵی ترمدا ماوەی ساڵێک نزیکەی ٧ هەزار دیناری سویسریم کۆکردەوە، هەردوولامان خۆمان ئامادەکرد بۆ ئەوەی بە کەسوکارمان بڵێین.

داوام لە دالیا کرد بەدایکی بڵێت، منیش بە نەنکم دەڵێم، بۆیە بەدایکی خۆمم نەدەگوت، چونکە من هەر نەنکم و باپیرم بەخێویان کردبووم،



دەستمان کرد بە کارکردن لە پرۆسەکەدا ئەو بە دایکی وتبوو، دایکیشی وتبووی با قوتابخانە تەواو بکەیت، بەڵام دایکی بە ئاسایی وەریگرتبوو تا ڕادەیەک پێی ناخۆش نەبوو.

منیش بە نەنکم وت، ئەویش هەر بەسادەیی وەریگرت وتی جارێ منالّی، با خان و مالّی خۆتت هەبێت ئینجا ژن بێنە.

من زیاتر گرینگیم دا بە کارەکە لەگەڵ باپیرم قسەم کرد، وتم: ژن دێنم پارەم کۆکردۆتەوە.

وتی: باشە خۆشم شتێکت بۆ دەخەمە سەری، بڕیاربوو باپیرم ٣ هەزار دیناری ترم بداتێ و بیکەین بە (١٠٠٠٠) دینار و دەست بکەم بە کڕینی کەلوپەلی ناوماڵ، بڕیارمدا کە لەگەڵ باپیرم و نەنکمدا بژیم و نەچمە دەرەوە لە مالەکەدا، تا ڕادەیەک کارەکەم ئاسان بوو، لە تەرەفی خۆمانەوە تەنها نەنکم نەبێت منجەمنجی بوو حەزی دەکرد کچێکی پوری خۆم بهێنم.

لە دوایدا ئەویش ڕازی بوو، نەنکم هەڵسا چوو قسەی لەگەڵ سەبری خانی دایکی دالیا کرد بۆ ئەو کارە خێرە، بەڵام قەزعەکە گۆڕا.

دایکی دالیا وتبووی: ئێمە کچ نادەین بە خەسرەو، خەسرەو کوڕی ماڵەکەیە و برای دالیایە.

زۆر بە ناشرینی وڵامی نەنکمیان دابوەوە، بە سرووشتی خۆشمان بنەماڵەی ئێمە زۆر عەشایەرین قسەمان نابێت بشکێت، نەنکیشم هاتەوە ئاگر لە کونە لوتی دەهاتە دەرەوە، بە جنێو و قسەوە گەڕایەوە مالەوە،





دەیوت ١٠٠ ژنی ترت بۆ دێنم ئەو واو وا لێکراوەت بۆ ناهێنم، منیش زۆر بێتاقەت بووم نەمدەزانی هۆکار چییە، وام دانابوو شتەکان زۆر ئاسایی دەڕوات و هەمووکارەکان دێت بەدەستەوە، بەلام بەداخەوە سەد پلە گۆڕا.

دالیا دەنگی نەما تەنانەت نەدەچوو بۆ قوتابخانە، حاجی سەعید_ی باوکیشی بەهیچ شێوەیەك مەرحەبای منی نەدەکرد، لای من شتیان نەدەکڕی، زۆر سەیر بوو بەلامەوە.

ڕۆژێک خۆم بۆ نەگیرا و چووم بۆلای حاجی سەعید لە گوزەری (سەعە تاکۆیی) داوام لێکرد قسەی لەگەڵ بکەم، بەڵام بەداخەوە زۆر بە ناشرینانە کردمیە دەرەوە و زلەیەکیشی لێدام، قسەی زۆر ناشرینیشی پێوتم، ئەو دەمە لەبەر خاتری گۆڕەکەی سەرباز قبوڵم کرد.

هەرچۆن بوو ڕۆژێک داوام لە بەیان کرد لە ڕێگەی ئەوە دالیا ببینم، لە سەربانی ئەوانەوە چوومە سەربانی ماڵی دالیا و دالیا_م بینی قسەمان زۆر کرد ئەگریا، چاوی ئەوەندە جوان بوو بەگریان خۆم فرمێسکەکانم بۆ دەسڕی، دالیا بۆی باسکردم کە باوکی ئیفلاسی کردووە، ئەوی داوەتە کوڕی شەریکێکی نوێ بۆ ئەوەی سەر لەنوێ لەبازاڕدا هەڵبستێتەوە.

لەسەر بانەکەیان دووبارە پەیمانمان دا بەیەکتر کە هەربۆیەک بین یان بۆگڵ.

بەڵام هەر لەو ڕۆژەوە دالیا_م هەر نەبینی نەدەچوو بۆ مەکتەب، نەدەهاتە دەرەوە.

ماوەیەکی پێچوو شەکراوی دالیا هات بۆ ماڵەوە!



منیش خەریک بوو شێت دەبووم، نەمدەزانی چی بکەم، لە تاوانا پەلاماری ئاسمانم ئەدا، وەک شێتم لێهاتبوو، جاری وا هەبوو، یەک سەعات ئاگام لەخۆم نەدەما و دەچوومە دنیای خەیاڵەوە....

تەنانەت ئەو دەمە بوو بەتەواوەتی جگەرە و مەشروب لە ژیانمدا سەری هەڵدا، ئیتر شەوان بە مەشروب و جگەرە و حەبی ڤالیۆم نەبوایە خەوم لێنەدەکەوت، هاوڕێکانم بە جێیان نەدەهێشتم، باپیریشم هەمیشە لە دوورەوە چاودێری دەکردم، نەشیان دەهێشت هیچ جۆرە چەکێکم لەبەردەستدا بێت.

ڕۆژێک باپیرم ناردمی بۆ هەولێر بۆ هەندێک کاری تایبەت کە پەیوەندی هەبوو بە کاروباری کەسابەتەوە، بەڵام ناردنەکەی فێڵ بوو سێ ڕۆژ منی هێتشەوە لە هەولێر هیچیشمان بۆ نەهاتبوو، بەهەرحاڵ کە گەڕامەوە سلێمانی دوای سێ ڕۆژ خوایە گیان کەس نەیبینێ ئەوەیان بۆ گێڕامەوە کە دالیا_یان بردووە بە بوک و بە جلی سپی بوکێنییەوە، باسی ئەوەیان بۆ کردم کە زاوا کێبووە و ئەوەی ڕوویدا بۆیان گێڕامەوە، باپیرم نامەیەکی دالیا_ی دایە دەستم لە نامەکە نووسرابوو...

سڵاو ئازیزەکەم...

نامەت بۆ دەنووسم...کۆتایی نامەی ژیانم، چونکە ئێرە، کۆتایی ژیانمە خۆزگە منت بەجلی بوکێنیەوە بدیبایە، چونکە ئارەزووت بوو بە جلی بوکێنییەوە ببینی.






خەسرەو گیان؛ وا من دەڕۆم تابزانیت من لەسەر قسەی خۆمم، ئەبینی دووبارە دەتوانم قسەت لەگەڵ بکەم!بەلام خۆزگە منیش گوێم لە قسەکانی تۆش بوایە.

وا من ڕۆشتم، چونکە من سوێندم خوارد تۆش سوێندت خوارد لەبیرتە؟

خەسرەو تۆ لێرە نیت، من جلی بوکێنیم لەبەردایە ئەی تۆ لەکوێی؟

زاوای دڵم تۆی...بۆ لام نیت؟

خۆزگە لێرە بویتایە و بتبینیایە دالیاکەت چۆن چۆنی جلی بوکێنییەکەی بە خوێنی دەمارەکانی بۆیاخ دەکات.

خۆزگە لێرە بویتایە و بتدیبایە دالیا_کەت، تا کۆتایی لەسەر قسەی خۆی بوو.

خەسرەو دالیا_کەت وا دەڕوات، تا بۆت بسەلمێنێت کە خۆشیدەوێیت ئێستا کە بەرچاوم ڕەش بووە، هەموو گیانم دەلەرزێت، ژیانم وەک درامایەک لەبەر چاومدا دێت و دەڕوات، ئەو ڕۆژەی کە ڕوانینم لە ڕوانینتا گرێدرا، لەبیرتە؟

ئەو ڕۆژەی کە دڵەکامان لەرزی لەبیرتە؟

ڕۆژانی خۆشی عاشقیمانت لەبیرە؟

پلانەکانی داهاتوومانت لەبیرە؟

خەسرەو من لەبیرمە، لەبیرمە چۆن گەورەکانمان کە درۆیان دەکرد و پێیان دەوتین گوایە ئێمە هەموو ژیانی ئەوانین!

پێیان خستە سەر دڵمان، لەبیرتە ئەوڕۆژەی کە دایە گەورەت لەماڵی ئێمە هاتەوە چەندە جنێوی دامێ؟

هەر لەبیرمە ئەو ڕۆژەی چووبویتە لای باوکم زلەیەکی لێدابوویت، پێی وتبووی ئیتر حەقی ئەوەت نییە ناوی کچی من بهێنیت.

لەبیرمە ئەو ڕۆژە زۆر گریان تۆ فرمێسکەکانمت بۆ سڕیمەوە، وتت کاتێک دەگریت چاوەکانت جوانتر دەبێت، وتت کە پێبکەنم.

خەسرەو ئێستا وەرە ببینە چاوەکانم جوان بوون؟ یان زیاتر بگریم؟

ئەزانم باپیرت تۆی ناردووە بۆ شارێکی تر بۆ ئەوەی من نەبینیت، بەڵام ئەو نەیزانی عیشقی تۆ لە دڵم دایە نەک لە چاومدا.

من دڵم بە عیشقێک دابوو کە دەستی بە تاڵ بوو، کە بۆ ئایندە و داهاتووی پارەی تەواوی نەبوو، بەڵام نەیانزانی ئارەزووەکانی من لە نیگای چاوەکانتا بوو نەک لە دەستەکانتا، ئێستا پەیمانەکەم جێبەجێ دەکەم!یان تۆ یان مەرگ.

ئەگەر لەم ژوورە بچمە دەرەوە ئیتر بۆتۆ نابم، نامەوێ لەجیاتی دەستە گەرمەکانی تۆ دەستی ساردی هیچ غەریبەیەک لە دەستمدا بێت...

لێرەدا کۆتایی پێدێنم، ئیتر بۆ مردن ئیزن لە باوکم وەرناگرم!

بەڵام خەسرەو خۆزگە لێرەبویتایە و دەتبینیم، ڕەنگی سووری خوێن لەگەڵ ڕەنگی سپی جلە بوکوێنیەکەم چەندە جوان ڕێککەوتوون چ تابلۆیەکیان نەخشاندووە، ئازیزەکەم ئیتر توانای نووسینم نییە زۆر بیرت دەکەم، ئەمەوێت بتبینم، دەستم ئەلەرزێت شێوەی چاوە جوانەکانت لەبەر چاومە دەستم بگرە بامنیش لەگەڵت بێم.

لە دوای خوێندنەوەی نامەکە هەناسەم پێنەما بوو، لە هۆش خۆم چووم ئاگام لەژیان نەما، ئەگەر مەرگ لەو کاتە دا بە پارە بوایە هەموو سەروەتی خۆمم پێ ئەدا، نە هەستم بە بوونی دەستم دەکرد تا خۆم پێ لە ناوبەرم، نە هەستم بە قاچم دەکرد تا خۆم هەڵبگرێت، نەمدەزانی چی بکەم ناچار لە هۆش خۆم چووم ئەوەندەم ئاگا لێبوو هاوارم دەکرد دالیا کوا؟ کوا دالیا؟

چاوم لە باپیرم بوو هاواری دەکرد سەیارەیەک ئامادەکەن با کوڕەکە هیچی لێنەیەت.



# چیرۆکی سێیەم
## ژیانەوە بەرەو مردن

دوای دوو ڕۆژ مانەوەم لە نەخۆشخانە، گەڕامەوە ماڵەوە هەموو لایەك دڵنەواییان دەکردم، ڕۆژانە دەچوومە سەر قەبری دالیا و پاشان قەبری دایکم و سەرباز و هەندێک هاوڕێی ترم.

ئاشناییم لەگەڵ مردووەکان پەیدا کردبوو، جاری واهەبوو بە سەعات قسەم لەگەڵ کێلی گۆڕەکەی دالیا_دا دەکرد، هەستم دەکرد بوومەتە بەندەی گۆڕ و خۆشەویستی!

هەستی ئەوەم بۆ درووست دەبوو کە زۆر عەیبە منیش خۆم نەکوژم، توانای دوکان بەڕێوەبردنیشم نەما بوو برایەکم دەیبرد بەڕێوە یان جوانتر بڵێم دوکانەکەم دایە ئەو هەر وازم لە دوکانداری هێنا، هەمیشە شەوان بێدار بووم بەدرێژایی ڕۆژیش ئەخەوتم.

ئەو پارەیەی کە کۆشم کردبووەوە هەموویم خەرج کرد لەشتی بێمانا.

شەوان دەچوومە نادی هێشوو لەوێ دەمخواردەوە، ئیتر کەسێکی بەو و مەستم لێ دەرچووبوو، هەمیشە حەزم بەشەرکردن و ئاژاوەگێڕی بوو، شەو نەبوو لەگەڵ ئاسایشەکانی سەرادا نەیکەمە شەڕ، ئەوانیش لەبەر ئەوەی کوڕەشەهید بووم حوڕمەتیان دەگرتم و جار و بار یش ناخۆشم دەکرد زیندانیان دەکردم.





ئەو سەردەمە ئاواتە خوازبووم بە دەنگی گۆرانیبێژێک بەناوی کاک مەحمود محەممەد یان مەحمود دەروێش، لەگەڵ ڕێزم بۆ ئەو گۆرانیبێژە بەڕێزە کە زیاتر لەناو خەڵکید بە (خولە دۆم)ناسرابوو، وام لێهاتبوو بە تەواوی هۆگری دەنگی ببووم، چەندجار دانیشت لەگەڵم دا تەنها مەقامی بۆ دەوتم، ئەویش منی خۆشدەویست، دوایی برایەکی خۆی پێ ناساندم بە ناوی کاک ئەحمەد دەروێش، ئیتر هەرچی پارەم هەبوو سەرفم دەکرد لەگەڵ ئەوانەدا بۆ ئەوەی شەوان بە مەقام بملاوێننەوە، هەر کەس ناوی دالیا_ی ببردبایە هەرچی لە گیرفانم بوایە ئەمدایە.

شەوێکیان زۆر مەست بووم زۆرم خواردبووەوە، بەدەم خۆمەوە مەقامێکی حەمە جەزام دەگوت فرمێسکیش لە چاوانما دەهاتە خوارەوە، شەو بوو دەوروبەری کاژمێر نۆ بەدەم گۆرانی وتنەوە بەپێ و سەرخۆشیەوە دەمویست بڕۆم بۆ سەر قەبری دالیا، لەبیرمە ئەو کاتە لای غازەکەوە پەڕیمەوە بۆ مامەیارە لەو نێوەندەدا زۆر چۆڵ بوو، دیسان ئارەزووی گۆرانی وتنم کرد و هاوارم کرد...

نا مەچۆ جوانێ مەچۆ واوە مەچۆ

تۆ فریوی زێڕ و زیوی وان مەخۆ

ئەو هەوەس بازانە جێی متمانە نین

هەر دەزانن گوڵچنین و بەی ڕنین



دوای ئەوە دیسنا دەستمکرد بە وتنی نالەی جوداییەکەی مامۆستا هێمن کە بەساقی دەست پێدەکات...هاوارم دەکرد:

ساقییا!وا بادەوە، وا بادەوە

ڕوو لەلای من کە بە جامی بادەوە

موشتەری وەک من لە مەیخانێ کەمن

زۆربەیان شاد و بەکەیف و بێخەمن

مەی حەڕامە بۆ سەهەندە و بێ خەمان

مەستی بێ خەم بۆچی بگرن ئێخەمان؟

ئەم شەڕابە تاڵە دەرمانی خەمە

لێی حەڕامبێ ئەو کەسەی دەردی کەمە

ئەم شەڕابە ئالە بۆ بێ دەرد نییە

لێی حەڕامبێ ئەو کەسەی ڕەنگ زەرد نییە

بۆ کەسێکە مەی: چزیلکی پێوەنێ

بۆچی ملهوڕ لێرە بینی پێوەنێ؟

بۆ کەسێکە مەی: کە دەردی کارییە

بێخەمێک بیخواتەوە، زۆردارییە





ئاگام لێبوو پیاوێک لە دوورەوە ڕووەو من هات وتی: دانیشە مەڕۆ دەمەوێت قسەت لەگەڵ بکەم!

منیش گۆرانییەکەم بڕی و وتم: لە خزمەتتاندام.

هاتە لام پیاوێکی بەڕێزی تەمەن ٣٥ بۆ ٤٠ ساڵێک دەبوو، تەوقەی لەگەڵ کردم و وتی: بۆ کوێ دەچیت بەم شەوە؟ وا دەگریت و دەنگیشت ناخۆش نییە،، ئەو گۆرانییە خۆشە دەڵێیت.

وتی: با هاوکاریت بکەم.

منیش خۆم پێناساند و وتم: ناوم خەسرەوە ئەوە ژیانی منە، ئەوەی ڕوویدا بوو بۆم گێڕایەوە، عادەتەن سەرخۆش چەنەباز دەبێت حەز بەقسەدەکات.

هەناسەیەکی هەڵکێشا و وتی: با بەیەکەوە بڕۆین بۆ سەر قەبران!

وتم: لەخزمەتدام فورموو، بەس ناوی جەنابتان چییە قوربان؟

وتی: ناوم ڕزگارە و خەڵکی قەرادەخم، بەس کاک خەسرەو هەست دەکەم تۆ سەرخۆشی و خواردوتەتەوە، چوون بۆ سەرقەبران حورمەتی خۆی هەیە، مەرج نییە بێدەنگی لە مردوان دەبینی واتە خامۆشن، بەڵکو ئاگادارن، دەبێت ڕێزی سەر گۆڕ و قەبرستان بگریت، نابێت بە گۆرانی وتن و لەش پیسی بچیتە ناو گۆڕستان لە کاتێکدا مردووەکان پێویستیان بە دوعای ئێمەیە، لە جیاتی خێریان بۆ بەرین، کەچی وادەکەین خۆشمان و ئەوانیش توشی تاوان بکەین، ئایا ئەمەت پێڕەوایە؟



منیش قسەکەیم بەهەند وەرگرت، چونکە باوکم و دالیام زۆر خۆشدەویست، بۆ ئەوەی خێریان پێبگات بڕیارم دا نەچم.

وتم: قسەکەت ڕاستە، بەڵام کاک ڕزگار دڵم دەکوڵێت، دیسانەوە بەدەم گریانێکی زۆرەوە هاوارم کرد چی بکەم؟

ڕزگار: مام خەسرەو گیان بڕۆین بەیەکەوە پیاسەیەک بکەین، لەجیاتی ئەوەی بچیت بۆ گۆڕستان؟

وتم: بەڵێ بە خۆشحاڵیەوە لە خزمەتدام مام ڕزگاری بەڕێز.

ڕزگار: بەرەو خوار بڕۆین یان بەرە و سەر؟

وتم: من هیچ ئیشم نییە، بۆ کوێ دەڵێیت دەڕۆین بۆ ئەوێ.

ڕزگار: دەکەواتە سەرەو خوار دەبینەوە بۆلای گۆزەکان و سەیوان، چونکە من توانای هەورازم نییە، بەپێکەنینەوە وتی پیربووم.

وتم: لە خزمەتدام، بەرەو خوار دەڕۆین.

ڕزگار: خەسرەو ژیان ململانێیەکی زۆر سەختە، ئەگەر بەجدی بیگریت ئەتکوژێت و زوو لە ناو دەچیت، پێویستە ئەوەندە ڕێزی ژیان بگریت تا لە دەستی ڕزگارت دەبێت، چونکە هیچ وەفا و پیاوەتی لە ژیان ناوەشێتەوە دەبێت لێی بچڕی، چونکە ژیان وەستاوە ئێمەین دەڕۆین و جوڵاوین، دەنا هەموو شتەکان لە جێی خۆیاندان!





باسی ئەوەی بۆکردم کە باوکی پیاوێکی زۆر دەوڵەمەند بوو هەمیشە بەڕێگای بەغدادەوە بووە، ئینجا بەردەوام بوو وتی: دایکیمش ئافرەتێک بوو زۆر گوێی نەئەداینێ، بەکورتی و پوختی مەبەستم ئەوەیە کە دایکم بەهۆکاری سەفەری زۆری باوکم باش نەبوو لە ڕووی ئەخلاقی یەوە، من لەلایەن هەردووکیانەوە پەراوێز خرابووم.

هیچ گرینگیەکم بە ژیان نەبوو، هیچ شتێک لام گرنگ نەبوو، تەنانەت تێکەڵاوی کەس نەدەبووم، تەنها یەک هاوڕێم هەبوو کە هەموو ژیانی منی دەزانی.

ڕۆژانە بەبەردەم دوو قوتابخانەی کچاندا دەڕۆیشتم هەستم بەوە نەدەکرد کە ئەم قوتابخانانە کچی لێیە، سەرم بەرز نەدەکردەوە، چونکە لام گرینگ نەبوو.

بەیانییەک دەچووم بۆ قوتابخانە ئاگام لەخۆم نەبوو خۆمدا لە کچێک کە سەرم بەرز کردەوە بینیم کچێکی زۆر جوان بوو، ئەو ڕۆژە لە قوتابخانە هەر بیرم لای ئەو کچە بوو، دەهاتەوە بەرچاوم، بۆیە هەموو ڕۆژێک دەچوومە بەردەم قوتابخانەکەیان و چاوەڕێم دەکرد تا دەهاتە دەرەوە، هەموو لایەک لە قوتابیانی قوتابخانەکە زانیان کەمن حەزم لەو کچەیە.

ڕۆژێکیان کچەکە خۆی هات بۆلام و وتی: ئەو پارەیەت لێکەوتووە، ڕاستی کرد خۆم بە ئارەزوو پارەکەم خستبووە خوارەوە، تا هەڵێبگرێتەوە، ئەگەر بۆی هێنامەوە قسەی لەگەڵ دەکەم ئەگەر هەڵیشیگرت بۆخۆی ئەوە دزە و بەکەڵکی ئەوە نایەت خۆمی بۆ ماندوو بکەم، بەڵام پارەکەی بۆ هێنامەوە، دوای ئەوە یەکترمان ناسی.



زانیم ئەم کچە دایک و باوکی نییە لای نەنکِ و باپیری دەژی و ئەوان بەخێوی دەکەن، ئەوانیش زۆر دەست کورتن ئەو ساڵە پارەی نەبوو قەمسەلەیەک بکڕێت، زۆرجار قەمسەلەی خۆم ئەدایە بیکاتە بەری، بیرمە ڕۆژێکیان پارەم لە دایکم دزی چووم بۆم دا بە قەمسەلەیەک دوای ئەوەی کە گەرمی هاتەوە ڕۆژێکیان هات ماچێکی کردم، تا یەک هەفتە وام دەزانی قاچم بەسەر زەوییەوە نییە.

خۆشەویستیمان بەردەوام بوو تاماوەیەک من لە زانکۆ دەوامم دەکرد، ماوەکی زۆر دیار نەما.

هەواڵیان بۆهێنام کە گوایە لەگەڵ کوڕێکی دەوڵەمەندا هاتووچۆ دەکات، چووم بەدوای ئەو قسەیەدا هەستم کرد قسەکە ڕاستە، ویستم بچم تۆڵە لەهەردووکیان بسێنم، بەڵام کچێکی هاوڕێم لە زانکۆوتی: ڕزگار پەلە مەکە، (سایە) نەنک و باپیری زۆر نەخۆش و پیرن باپیری پێویستی بە نەشتەرگەری هەیە کەبڕەکەی ٤ هەزار دینارە، بۆیە لەگەڵ ئەو کوڕەدایە پارەکەی لەو وەرگرتووە، ڕووی نەبووە بە تۆ بڵێت زانیویەتی تۆش لەگەڵ باوکت قسەت نییە و توانای پەیداکردنی ئەو پارەیەت نییە.

منیش کەئەوەم زانی سەنتورێکم هەبوو، لەگەڵ تەسجیلێک و شتومەکی کارەبایی هەموویم فرۆشت و چووم ٥ هەزار دینارم بۆ برد، لە دەرگای ماڵیانم دا کاتێک دەرگای کردەوە هیچم نەوت پارەکەم دایە دەستی و گەڕامەوە.

دیار بوو بە پارەکە کارەکەی چارەسەر کردبوو، بەڵام هەر ڕووی نەبوو بێتەوە بۆ لام منیش نەدەچووم بەلایدا، تا ڕۆژێکیان بینیم لە جێگایەکدا




لەگەڵ ئەو کوڕەدا کە پێشتر بینیبووم ڕێگای پێگرتووە وازی لێناهێنێت، منیش بە پەلە ڕامکرد، تۆزێکم کێشا بەو کوڕەدا تا پۆلیس هاتوو بلاوەیان پێکردین، دوای ماوەیەک زانیم نەنک و باپیری مردون و لای مامی ماوەتەوە، چووم بەدایک و باوکمم وت: ئەو کچەم بۆ مارەکەن، ئەوان وتیان ئێمە حەقمان نییە و شتی وات بۆناکەین و حەقمان نییە بەسەرتەوە، ئامۆزاییەکم نارد، ڕازیبوون سایەم هێنا، شەوی زەواجمان خۆشترین شەو، وەک دەڵێن مانگی هەنگوینیمان بوو، دوو شەو بوو خێزانم بوو، تەقەی خۆشی کرا و سایە فیشەکێکی وێڵی بەرکەوت و لەوکاتەوە منیش سەرگەردان و وێڵم.

منیش ئەم شەو لەسەر قەبری سایە گەڕامەوە کە تۆم بینی هاوار دەکەیت دالیا، گۆرانیت بەدەم گریانەوە دەوت هەستم کرد هەردووکمان یەک دەرد و ئازارمان هەیە.

دیسان بە قسەکانی ئەو هەردووکمان دەستمان کردەوە بە گریان، زوو زوو ڕزگار بەمنی دەوت: خوا گەورەیە گوێی مەدەرێ و منیش کە ئەوم ئەبینی زیاتر لەمن دەگری دەموت: تەحەمولت هەبێت مامە ڕزگار گیان تەحەمولت بێت.

بەدەم گریانی هەردووکمانەوە سەیارەیەکی پۆلیس لای سەرکارێزەوە نزیک فولکەی ئاسۆی دەلاک وەستا و پرسی هیچ ڕووی داوە دەگرین؟

منیش تەحەمولم نەما دەستم کرد بە جنێودان، پۆلیسەکانیش دابەزین، من خۆم داخم لە دڵ بوو توشی بەد مەستی ببووم حەزم دەکرد لە دوای سەرخۆشیم هەمیشە شەڕێک بکەم، مەستیەکەشم بەدوای بیانوێکی



شەڕدا دەگەڕا، ڕزگاریش ئەوەندەی کوڕی چاک بوو هیچ بیانوی شەڕێکم لەگەڵ ئەو بۆ دروست نەبوو، تا خوا کردی داخی دڵی خۆمم بە پۆلیسەکان ڕشت و ڕزگار نەیهێشت لێمبدەن وتی: کاکە ئەوە سەرخۆشە و ئینجا ئاگام لێبوو باسی وەزعی منی بۆکردن، منیش لە دوورەوە هەر جنێوم ئەدا تا ئەوان ڕۆشتن.

ڕزگار هاتەوە بۆلام دەمەو بەیان بوو چووین بۆ سەروپێ خواردن بۆ ئەسحابە سپی، بانگی بەیانی دا ڕزگار چوو بۆ نوێژکردن منیش تەکسیەکم گرت زۆرم خەو دەهات نەخواحافیزیم کرد و نەهیچ، گەڕامەوە ماڵەوە.

نیوەڕۆ هەڵسام لە خەو سواری پاسەکانی هەوارە بەرزە بووم تا بەرە و بازاڕ بڕۆم...کچێکم بینی لەناو پاسەکدا ڕێک لە دالیا دەچوو.

وتم: بڵێی خەو بێت؟!

چووم پارەکەم دایە سایەقەکە و جارێکیتر تەماشام کرد بڵێی دالیابێت؟!خۆ لەو دەچێت!بڕیارم دا دانەبەزم دوای بکەوم بزانم ئەوە یان کەسێکیتر.

## چیرۆکی چوارەم
## گەڕان لەناو بازنەی بەتاڵدا و درووستکردنی چارەنووس

لەدوای ئەوەی کە ئازار و ناڕەحەتی زۆرم چەشت وام لێهاتبوو کە ببوومە بەندەی عیشق، بەندایەتیم بۆ عیشق دەکرد.

ئەیبردم و ئەیهێنام بە ئارەزووی خۆی، وام لێهاتبوو بۆ عیشق ئەژیام بۆ عیشق دەمردم کەی بیویستایە دەیخستمە گریان هەر کاتێکیش بیویستایە دەیخستمە خەیاڵ، کەی بیویستایە جگەرەی پێدەکێشام، مەشرووبی پێدەخواردمەوە.

بەندەیەکی زۆر ملکەچی عیشق بووم، هەرگیز بێگوێیم نەدەکرد، لە سیحر و جادوو خراپتر بوو, ئەوی بیویستایە دەیکرد لێم، بۆ وام لێهاتووە نازانم!ژیانم بە تەواوەتی تێکچووبوو دوای دالیا.

شەوان هەمیشە بێدار بووم ڕۆژیش کفت و مەلول، تەنانەت کەسوکارەکەی خۆشم لێم بێزاربووبوون، نە باپیر نە نەنک مەرحەبایان نەدەکردم، چارەشم نەبوو هەر ئەوەندە دەمتوانی بیربکەمەوە، عیشق بۆ خۆی بردبوومی.

دوای نیوەڕۆیەک سواری پاس بووم بۆ ناوبازاڕ زۆر بێزار و بێتاقەت بووم، لەناو پاسەکەدا کچێکم بینی باڵای دالیا بوو، دیسان چوومەوە بۆ پارەدان بە شۆفێرەکە تەماشام کرد سیمای کتومت ئەوە.




بڕیارم دا دانەبەزم لەپاسەکە تا ئەو دادەبەزێت، کچەکە دابەزی، بە هێمنی بێ ئەوەی بزانێت شوێنی کەوتم تا خۆی کرد بە زانکۆی سلێمانیدا.

وەستام هەر نەڕۆشتم، تا هاتە دەرەوە و لە لای عەرەبانەی خەستەخانەکان وەستابووم، جگەرە لەسەر جگەرە دەمکێشا.

هاتە دەرەوە شوێنی کەوتم تا گەڕایەوە بۆ هەوارەبەرزە تا خۆی کرد بەماڵێکدا، دەست نیشانی ماڵەکەیانم کرد و گەڕامەوە.

شەوان نزیکی ماڵیان دەبوومەوە، بەڵکو بێتە دەرەوە سەبورییەکم بۆ بێت، کاتەکانی کە دەچوو بۆ زانکۆ دەمزانی هەموو کات شوێنی دەکەوتم ببوە پیشەی هەمیشەییم هەستم دەکرد خۆشی باش دەزانێت، کوڕێکی پورزام لە زانکۆ بوو وتم کچێکی لەو شێوەیە لە زانکۆکەت دایە ئەیناسی؟

وتی: هەواڵت بۆ دەپرسم.

ماوەیەکی پێچوو، پورزاکەم هەواڵی بۆ هێنامەوە، کە ئەمە کچی پیاوێکی دەوڵەمەندە براکانی هەموو لە کەنەدان و ماوەیەکی زۆر لە کەنەدا بووە، بەلام دوو ساڵ دەبێت لەگەڵ باوک و دایکی هاتۆتەوە بۆ کوردستان.

کچەکە ناوی سۆما_یە، لەگەڵ کەس ناگەڕێت لەزانکۆ و لەگەڵ هیچ کوڕێکیش نییە.

تەنها لەگەڵ چەند کچێک لە کافتریای زانکۆ دادەنیشن، کچەکانیش یەکێکیان پێنجوێنییە خزمی خۆمانە.



زۆر خۆشحاڵ بووم کە ناویم زانی و کەسێکی نزیکی خۆشمان هاوڕێیەتی، پرسیم کچە پێنجوێنییەکە کێیە؟

پورزاکەم پێی وتم کە کێیە، تۆزێک ژیانم گۆڕا و گرینگم دایەوە بە خۆم و بە جلوبەرگ و سەر و سیمام.

ڕۆژێکیان ئەو کچە پێنجوێنییەم بینی و ناوی خۆمم پێوت وتم من و بەڕێزت خزمین و جەنابتان وەک خوشکی بەرێزی خۆمن، ئەم کارە بۆیە بە جەنابت دەسپێرم دەزانم بە دلسۆزانە دەیکەیت، بۆیە بەڕێزتانم هەڵبژاردووە.

وتی: بەڵێ کاک خەسرەو من و تۆ خزمین، ئەوەی بەمن بکرێت لە خزمەتدام و درێغی ناکەم، کچە پێنجوێنییەکە ناوی سروە بوو.

وتم: سروەی خوشکم کچێک لە زانکۆیە لای ئێوە دەمەوێت بیناسم و تەعاروفێک بکەین بەیەکەوە.

سروە زانی و ڕاستەخۆ پێی وت: ڕاستەکەی کاک خەسرەو زۆر لە دالیا دەچێت، خوا عەفوی بکات!

هەناسەم سواربوو چاوم پڕبوو لە گریان، هەستم کرد زۆر خائین و خراپەکارم کەسێک بۆ خاتریمن خۆی کوشت، کەچی وا من بە دوای کەسێکی ترەوەم، قورگم پڕبوو لە گریان و سروە_م جێهێشت، لەلایەکەوە تەریق دەبوومەوە، لەلایەکی تریشەوە دڵم سوتا بوو بۆ دالیا چوومەوە مالەوە.





تا ماوەیەک وازم لەو مەوزوعەش هێنا، بەڵام ژیانم گۆڕانکارییەکی تری بەسەردا هات.

بیرم لەوە کردەوە دەست بکەمەوە بەکار و کاسبی، باپیریشم قسەی لەگەڵ نەدەکردم لەبەر ئەوەی هەمیشە سەرخۆش بووم، نەک باپیرم کەس لەخانەوادەکەم ڕووێکی خۆشی نەئەدامێ تەنها نەنکم نەبێ جاروبار نازی دەکێشام، بەڵام ئەویش ئەوەندەی قسەدەکرد و جنێوی پێ ئەدام بەناوی ئامۆژگارییەوە تاقەتم نەبوو گوێ بۆ ئەویش بگرم، چووم بۆلای کوڕێکی ڕەفیقم ناوی کامەران بوو.

وتم: کامەران_ی برام دەمەوێت کاسبییەک بکەم و هەزار دیناریشم هەیە.

کامەران: ئەتوانیت هەزار دیناری تر پەیدابکەیت بکەی بە دوو هەزار جێگا مێزێکت بۆ بکڕم لە قاچاغچییەکان؟

وتم: هەول ئەدەم، چووم بۆلای نەنکم وتم هەزار دینارم بدەرێ بە قەرز بۆ کاسبیم دەوێت.

نەنکم: ناتدەمێ ئەیدەی بە گو و دەیخۆیتەوە بڕوات پێناکەم.

توڕە بووم و وتم: ئەوە نەمویست، بەجێم هێشت.

چووم بۆ لای باپیرم، ئەویش نەیدامێ و وتی نیمە.

چووم بۆلای دایکی خۆم دەریکردم!



ناچار چوومەوە بۆلای کامەران وتم: کامەران گیان شک نابەم ئەو هەزارەم هەیە.

کامەران: با مێزێکت بۆ بکڕم لەبەر مزگەوتی گەورە ئەویش باشە بە ٥٠٠ بۆ ٧٠٠ دینارە.

وتم: بیکڕە.

مێزەکەی بۆ کڕیم و ٣٠٠ دینارەکەشم کرد بە دەست مایە، چووم بۆ قەیسەری نەقیب و بازاڕی سۆران دام بە هەندێک کەلوپەل و لەسەر مێزەکە دامنا و دەستم کردەوە بە کەسابەت.

ڕۆژانە شتم دەفرۆشت و دەمکڕییەوە دەست مایەکەم زۆر بوو، دەچوومەوە خێرا شتم دەکڕی لە جوملە فرۆشەکان، وردە وردە دەوڵەمەند بوومەوە ماوەی شەش مانگێک بەردەوام بووم، باپیرم زۆر بەزەیی بەمندا دەهاتەوە سیقە و متمانەی پەیدا کردەوە، ئینجا بڕوایان کرد کە کاردەکەم بەجدییەو مەشڕوب و کاری شەوانم تەرک کردووە مەگەر زۆر بە موناسەبات بخۆمەوە، بەهەر حاڵ ئیشەکەم گەورەتر کرد، لەو ناوەدا دوکانی تێدابوو تازە درووست دەکرا قەیسەری نوێ بوون دەستم کرد بە دوکان کڕین و فرۆشتن، باپیرم ٥ هەزار دیناری دامێ و دایکیشم ١٠ هەزار و نەنکیشم ٣ هەزار دینار، ئیتر دەستمایەی باشم هەبوو، خۆشم لە قازانجی کڕین و فرۆشتن، پارەی باشم دەستکەوت.

دوای ماوەیەک سروە هات بۆ لام هەندێک شتی لەلام کڕی وتی: کاک خەسرەو ببورە ئەوڕۆژە زۆر بێزارم کردی، بەڵام بەو خوایە لەبیرم نەچۆتەوە، بە سۆما_م وت: کە تۆ هەواڵت پرسیوە ئەویش یەکسەر وتی:




دەزانم کێیە، ئەو کەسە دوام کەوتوە، لەم ڕۆژانەدا ئەویش هەواڵی تۆی پرسی وتی: بۆ دیار نەماوە؟!

منیش لەخۆشیدا هەموو شتێکم بیرچووەوە، دیسانەوە خەیاڵم چوەوە بۆلای سۆما و بە سروە_م وت: مەمنون دەبم ژوانێکمان بۆ ساز بکەی.

سروە: باشە پێی دەڵێم.

سروە هەرچی کڕیبووی هیچ پارەم لێوەرنەگرت بۆ ئەوەی بێتەوە.

چەند ڕۆژێکی پێچوو سروە و سۆما هەتنە بەردەم مێزەکەم، لەخۆشیدا وام دەزانی هەموو دونیا هیخۆمە، خوم دەخوارد بەدەوری خۆمدا.

سروە خۆی مەشغول کرد بە شتەوە سۆمای بۆمن بەجێهێشت، منیش ڕاستەوخۆ وتم: سۆما تۆ لە ئازیزێکی من دەچیت، ئەمەی بۆت باسدەکەم دراما و شتی وانییە واقیعە و درۆش نییە.

سۆما: خەسرەو ڕاست دەکەی سروە هەمووشتێکی بۆ گێڕاومەتەوە، بەڵام حەز دەکەم هاوڕێ بین بیر لە هیچی تر مەکەرەوە، دەتوانیت بێیت بۆ ماڵمان بۆ لای دایکم و باوکم بەوانت دەناسێنم!

ئیشەکەیم زۆر بەدڵنەبوو، چوونم بۆ ماڵیان بۆلای دایک و باوکی زۆر قورس بوو بۆ من و ئەو کلتورە لەو سەردەمەدا ئەوەندە ئاسان نەبوو، بۆیە وتم: نا هەر حەزدەکەم جار و بار بەیەکەوە پیاسەیەک بکەین.

سۆما: زۆر باشە، کەی ویستت ئەوە تەلەفۆنی ماڵی ئێمەیە تەلەفۆن بکە و ئاگادارم بکەرەوە.



وتم: ئاساییە تەلەفۆن بکەم؟

وتی: بەڵێ بەڵێ زۆر ئاساییە.

وتم: مەبدەئی، ڕۆژی جومعە دەچین بۆ پشوو نانێک دەخۆین، ئێستاش ئەو جێشتخانەیە ماوە لە سلێمانی.

سۆما: خۆشحاڵ دەبم.

ماڵئاواییان کرد...

لە دڵی خۆمدا وتم ئەم ئافرەتە چەندە ئاسانە زوو هات بەدەستمەوە، زۆر ئازایانە قسەی کرد و هیچ سانسۆرێک نەبوو، بەهەر حاڵ تۆزێک بەکەم هاتە بەرچاوم، چونکە ئەودەمە ئافرەت تا ڕەفزی بکردایە لەبەردەم کوڕدا خۆشەویستر دەبوو، دوایش خۆم پاساوی ئەوەم هێنایەوە کە لە کەنەدا پەروەردە بووە بۆیە ئاسانە.

چەند جومعەمان بەڕێکرد، پێکەوە دەڕۆشتین بۆ هەموو جێگایەک، دیاریم بۆی دەکڕی، وامان لێهاتبوو هەموو کەس دەیزانی یەکترمان خۆش دەوێت، تەنانەت ڕۆژێک باپیرم ئامۆژگاری کردم وایزانی کاری خراپ دەکەم وتی: ئاگات لە شەرەف و حورمەتی خەڵکی بێت خۆت خاوەنی خوشک و دایکی!

منیش عەرزم کرد ئیشی خراپ لەمن نابینیت، بەس ئەو کچەم خۆشدەوێت، باپیرم توڕەبوو وتی: ئەگەر خۆشت دەوێ ئەوە پارە و ئەوە ماڵ، چیت دەوێت بۆت دەکەم و بیهێنە.




وتم: باشە، بەڵام ئەو دەڵێت تەنها هاوڕێیین.

باپیرم وتی: پێی بڵێ دەمەوێت بتهێنم و کۆتایی پێ بێنە بەم چوونە دەرەوەیەتان، بۆ خۆت و خانەوادەی هەردوولاتان جوان نییە.

خۆشەوستی تەواو لە نێوانی من و سۆمادا دەستی پێکردبوو، هەمیشە خەمێکم دەبینی لە ناو چاوانیدا، بەڵام هیچی نەدەوت.

وتم: سۆما دێمە خزمەت مامۆستا جەمالی باوکت و داواتدەکەم لێی.

ڕازی بوو، بەڵام هەستم کرد دڵم ناشکێنێت دەنا نابەدڵ بوو ڕازی بوونەکەی!

دوو شەو دوای ئەوە تەلەفۆنی کرد، وامزانی بۆئەوە کردوێتی کە بچین بۆ ماڵیان و خەڵک بنێرمە داوای، وتی: ئیجازەمان بدە سەفەرێک دەکەین بۆ کەنەدا و دەگەڕێینەوە ٢٠ ڕۆژمان پێدەچێت، ئەوە باوکم دەیەوێت قسەت لەگەڵ بکات!

مامۆستا جەمال تەلەفۆنەکەی وەرگرت، دوای چاک و چۆنی سلاومان کرد و من بەشەرمەوە قسەم دەکرد و ئەویش یادگارییەکی باوکمی گێڕایەوە،

وەک ئەوەی پێم بڵێت ئێمە دەمێکە یەکتر دەناسین و باوکیشت هاوڕێم بووە و دوای موجامەلەیەکی زۆر کۆتایمان بە قسە هێنا.

تەلەفۆن داخرایەوە، چاوەڕێ بووم دوای ٢٠ ڕۆژ بێنەوە، نەخێر نەهاتنەوە، بووە مانگێک دیار نەبوون, بووە دوومانگ دەنگ نەبوو، بووە شەش مانگ هەر دیار نەبوون.

خەفەتی دنیام خوارد شەو نەبوو بە پێ نەچم بۆ گەڕەکەکەیان گڵۆپی مالەکەیان کوژابووەوە، تەنانەت دراوسێکانیشیان کە منیان دەبینی دەیانوت هێشتان نەهاتوونەتەوە.

دوای ٨ مانگ مامۆستا جەمالم بینی و هاتە لام بۆ دوکان و نامەیەکی دایە دەستم لە لام دانیشت و چایەکم بۆ بانگکرد.

مامۆستا جەمال وتی: نارۆم، نامەکەی سۆما بخوێنەوە دەرگای دوکانەکە داخە با کەس نەیەتە ژوورەوە.

دڵم لەسەر ١٠٠٠ لێی دەدا، وتم: پەشیمان بۆتەوە مامۆستا جەمال؟

مامۆستا جەمال وتی: تۆ نامەکە بخوێنەوە

دەقی نامەکە:-

خەسرەو...نەگریت، پێبکەنە، ئەزانی بۆچی نەمدەویست شوت پێبکەم؟

لەبەرئەوەی من شێرپەنجەم هەبوو.






دەمزانی دەمرم، بەڵام تۆ بژی، ئەبێت بژیت، خەسرەو هەنسک هەڵنەدەیت، دەزانم زۆر ئاواتت لەسەر ژیانی من بونیات نابوو، ببورە گیانەکەم، نازانم بۆ دەبێت تۆ خەفەتی من و دالیا بێتە سەر شانت.

ئازیزەکەم!ئەزانم ئەتویست لێم بپرسی بۆچی غەمبارم، زۆر جار وا هەستت دەکرد خۆشم ناوێیت، حاشا حەزم دەکرد ماچت بکەم و بۆنت بکەم، بەڵام ئەوە زانیت بۆ دوورە پەرێزم گرتبوو.

خۆشەویستەکەم: نەمدەویست خۆشیت لێ تێکبدەم، دەمزانی دالیا_ت خۆشدەوێت، پاشان زانیم جێگای ئەویشم بۆت گرتۆتەوە.

سروە هەمووشتێکی بۆ باسکردبووم، بەلام ئازایەتی و شەرەف بەرزی تۆ زۆر شتی فێر کردم، ڕاستە من کۆتایی ژیانمە و نامەت بۆ دەنووستم، بەلام دڵنیام تۆ دەبینمەوە و لای سەرتەوە وەستاوم ئەوکاتەی دێیتە لای من و دالیا.

ببوورە ئەگەر درۆم لەگەڵ کردووی، بەڵام بڕوابکە خۆشم ویستووی.

ئازیزەکەت سۆمای چاوت.

دیسان هەناسم بۆ نەدەدرا دەرگای جامخانەی دوکانەکەم کردەوە ویستم ڕاکەم هەناسە هەڵمژم، مامۆستا جەمال گرمی هاوارم کرد هەناسەم پێنەماوە بەیارمەتی بەرمدە، باوەشی پیاکردم و قسەکەی سۆمای بۆ دووبارە کردمەوە.

خەسرەو تۆ بژی دەبێت بژیت...



دیسان نائاکامی ڕووی تێکردمەوە، هەستم دەکرد زیادم لەسەر ئەم زەوییە.

چووم بۆلای هاوڕێکەم سیلاح فرۆش بوو لە سابوونکەران، ناوی جەزا بوو، هەندێک پارەم لە دووکان هەبوو خستمە گیرفانم بۆ سیلاح کڕین، بۆ ئەوەی خۆم بکوژم، هەرچەندە جەزا دەمانچەی نەبوو، چووم دەمانچەیەکی میکارۆفی قەلەباچکەم کڕی، چەند جار وتی: ئەو دەمانچە بەکەڵک نایەت مەیکڕە، وای دەزانی بۆ فرۆشتنەوەمە، بەڵام من گوێم پێنەدا، گوایە ئەو دەیوت فیشەکی گرانە و دەست ناکەوێت، فیشەکەکانی لە چوارقورنە درووست دەکران، لەوێدا خێرا شانەیەکی زیادەم کڕی.

چووم بۆ گردی سەیوان بۆ سەرقەبری دالیا ئێوارەیەکی درەنگ خۆر ئاوا ببوو.

کەس لە دەورم نەبوو میلی دەمانچەم ڕاکێشا و خستمە سەر سەری خۆم و دەستم کرد بە قسەکردن لەگەڵ کێلەکەی دالیا، دەستم لەسەرپەلە پیتکە بوو بۆئەوەی بیتەقێنم و نەجاتم بێت.




ئەم شیعرەم پێش ئەوەی بە نیاز بم خۆم بکوژم نووسی:

لە سیپای ڕەنگەکانەوە

لە پێ دەشتی سینەتەوە

بەرە و لێوی ئاڵت دەڕۆم

بەرەو سیپای پەمەیی و

چاوی شینی کاڵت دەڕۆم

بەرەو تاڵی بسکی خاوت

هەنگاوی ئەرخەوانی دەنێم

لە فرمێسکی چاوی تۆدا

ئاوازی هەنسک درووستدەکەم

ئەوین...ئەوین...باڵدەگرێت و دەمبات بەرەو خەیاڵی ڕەنگ

جا من چیبکەم ڕەنگەکانی خۆشەویستی

لە ڕووی تۆدا سەما دەکەن

ئەویندارا‌ن سەرسام دەبن

گوێ لە سەدای پێکەنینت دەگرن

دەوەرەوە با خۆشەویستان جارێکی تر

جوانی ئەوین لە نیگای تۆدا فێربن

با لە ئەندێشەی پەلکەزێرینەی



ناو پرچی تۆدا ئێشک بگرن

ئەوین...ئەوین...باڵدەگرێت و دەمبات بەرەو خەیاڵی ڕەنگ

دیسانەوە لە نێرگزەجاڕی ڕۆحم

خەڵوەت دەگرم

لە بیلبیلەی چاوی مەستت

خۆشی و سۆزی تیا دەپچڕم

دیسانەوە بە هەنسک

لە ڕووی خۆشەویستی تۆدا سەما دەکەم

تا کۆتایی تەمەنم

لەناو سیمای ئەویندا ئارام دەگرم

ئەوین...ئەوین...باڵدەگرێت و دەمبات بەرەو خەیاڵی ڕەنگ

## چیرۆکی پێنجەم
## ڕاکردنی مەرگ..لەناو گۆڕستاندا

لەسەر گۆڕەکەی دالیا وەستام و میلی دەمانچەکەم ڕاکێشا و خستمە سەر سەری خۆم و دەستم کرد بە قسەکردن لەگەڵ کێلەکەی دالیا دا دەمووت دالیا گیان وا هاتم بۆ لات،

تکایە بە ئازیزان بڵێن با منیش بەرن بۆلای تۆ زۆر ماندوو بووم دوای تۆ، هەرچی سەرمای ئەم شارەیە لە گیانی مندا بەستیوە لە تاواندا لەرزم لێهاتووە، نازانم ترسە یان هاتن بۆ لای تۆیە.هەموو گیانم وەک شەقشەقە دەلەرزێ، هەستم بە ترسێک دەکرد لەگەڵ ئەوەشدا شتێک لە ناخمدا دەیوت تۆ ئازایت نەترسی عەیبە پێویستە خۆت بکوژی، ئەوە دالیا بۆ تۆ مرد، ئەوە سۆما بەجێی هێشتی!چی دەکەی لێرە بڕۆ بۆلای ئەوان، نەمدەزانی ئەوە کێیە لە ناخمدا ئەو قسانەم بۆ دەکات، هانی ئەدام بۆ مەرگ منیش لەپڕ دەستم نا بە پەلەپیتکەی دەمانچەکەدا و چرکاندم لەسەر کەلەسەری خۆم.

هیچ دەنگی نەبوو، نەتەقی!

جارێکی تر میلم هێنایەوە بۆ ئەوەی پەشیمان نەبمەوە لەسەر کەلەی سەرم چرکاندم کەچی هیچ ڕووی نەدا، وتم تۆ بڵێی نەمتەقاندبێت یاخود گەرماو گەرمە هەستی پێناکەم، دەستم دا لە سەری خۆم سەیری دەستم کرد هیچ خوێن نەبوو، زۆر ئاسایی بووم.





جارێکیتر ڕوومکردە سەر قەبرەکەی دالیا_ و میلم هێنایەوە و چرکاندم، کەچی تەقی!کێلەکەی دالیا_ی ڕووشاند خۆشم ڕاچڵەکیم.

منیش لە داخا خستمەوە سەر سەرم چرکاندم نەتەقی، هاوارم دەکرد و جنێوم ئەدا بە دەمانچەکەم و بەوەشی لێم کڕیوە، دەمانچەکە جوتە ی دەکرد، جەزا ڕاستی کرد، دەبوو نەمکڕییایە منیان هەڵخەڵەتاند، دەمانچەکە ئیسپرنگی میلەکەی لاواز بوو لولەکەشی خوار بوو ڕووە و ئاسمان بوو ڕێک نەیدەتەقاند، دەبوو تەنها سەربەرەو خواری بکەیتەوە.

دوو فیشەکی ترم نا بە زەوییەکەوە ئەتەقی و ڕووم دەکردەوە مێشکم نەدەتەقی، بەو ئێوارەیەش هاوارم دەکرد و جنێوم بەملاولای خۆم ئەدا.

(ئێستا بیر دەکەمەوە و دەڵێم خوا پاداشتی ئەو کابرایە بداتەوە کە هەڵی خەڵەتاندم و ئەو دەمانچە خراپەی پێفرۆشتم).

بەهەرحال ئاگام لەخۆم نەبوو لە دواوە دەستیان گرتم و دوو کەس باوەشی پێداکردم تەماشام کرد بەو ئێوارەیە لایمن قەرەباڵغە زیاد لە ١٠ کەس لەدەورم کۆ ببوویەوە ئەوانەی گۆڕ هەڵکەن و لەگەل خێزانێک بوون کەهاتبوون بۆ سەرقەبران.

گۆڕهەڵکەنێک کە زۆر بەهێز بوو باوەشی پیاکردم ئەیووت بەڕەڵات ناکەم تا دەمانچەکەم نەدەیتێ، ئاخر تۆ خۆت دەکوژی.

وتم: وەڵاهی ویستم خۆم بکوژم بەڵام دەمانچەکەم بە کەلک نایە، هانێ ئەوە دەمانچەکە بەس بەڕەڵام کە پەراسووەکانمت شکاند.



که دەمانچەکەم دایە دەستی باش بوو ئازادی کردم، پیاوێکی پیریان لەگەڵ بوو هاتە لام و وتی: کاکۆ بۆ خۆت دەکوژیت؟، دەزانی خۆکوشتن لە ئاگری دۆزەخدا بەهەمیشەیی دەمێنێتەوە.

تۆ کوڕێکی جوانخاسی موشکیلەت چییە؟ باوکی من با هاوکاریت بکەین.

منیش دەستمکرد بە قسە و وتم: ئەوە حاڵ و ژیان و گوزەرانی منە.

ژن و کچێکیش لە نزیکمەوە وەستابوون و پیاوێکی باڵابەرزی سەر ماش و برنجیشیان لەگەڵ بوو، ژنەکە زوو زوو دەیوت: ئەی دایکی کوێر بێت، ئەم گەنجە جوانانە چیان لێ بەسەرهات، من هەر باسی شتێکم دەکرد ژنە خێرا دەیوت ئەی دایکت بمرێ ئەو لاوانە چۆن ئاوایان لێهاتووە لەم وڵاتە دا، کچەکەش بە قسەکانی من قوڵپی گریانی هەڵدابوو هاتبووە تەنیشتمەوە هەنسکی هەڵئەدا.

پیاوە پیرەکە وتی: وەرەن دەچین بۆ ژوورەکەم چایەک دەخۆین و ئینجا بڕۆن، دیار بوو ئەو کەسەی کە باوەشی پیادا کردم کوڕی بوو، پیاوە بەتەمەنەکە ناوی حاجی غەریب بوو کوڕەکەشی ناوی کاک ئەحمەد بوو.

منیش حەزم دەکرد بچم بۆ ئەوەی لەو خێزانە نەجاتم بێت، لەخۆمەوە تەریق دەبوومەوە.

وتم: بفەرموون با بڕۆین دێم لە خزمەتدام، حاجی غەریب خوڵقی ئەو خێزانەشی کرد، وەڵڵا ئەوانیش هاتن.





من خوا خوام بوو نەجاتم بێت لە دەستی ئەوان، کەچی ئەوانیش هاتن بەدوامدا.

چوومە ژوورەکەیان دانیشتین، کاک ئەحمەد چای لێنا و چامان خوارد دوایی داوای ئیزنم کرد کە بڕۆم.

کابرای سەر ماش و برج وتی: من ئەتگەیەنمەوە ماڵەوە.

وتم: نا_ قوربان گیان پێویست ناکات خۆم دەڕۆمەوە جەنابتان ئەزیەت مەکێش.

حاجی غەریب ڕووی کردە پیاوەکە و وتی:من مەمنونی جەنابتان دەبم دەست لە خەسرەو بەرنەدەی تا دەیبەیتەوە ماڵەوە.

کابرا ناوی کاک ڕێبوار بوو

وتم:کاک ڕێبواری بەڕێز، من هاتووم خۆم بکوژم بەڵام بە نسیبم نەبوو، کەس نەیزانیوە، منیش کوڕە گەورەی ماڵم و نامەوێ دایکم و کەسوکارم بەمە بزانن.

جا تکایە جەنابیشت و حاجی غەریب ڕێگەم بدەن بڕۆمەوە، ئەو باسەش لای خۆتان بهێڵنەوە، دەمانچەکەش لای کاک ئەحمەدە، من وەعد ئەدەم بەوەعدی پیاو و شەرەف ئەو کارە دووبارە نەکەمەوە.

لە ڕاستیدا ئەترسام، ئەمە بگاتە دەمی باپیرم و کەسوکارم ئەوانیش نارەحەت دەبوون لەوانەبوو باپیریشم هەر لەماڵەوە بمبەستێتەوە، تەنها



کەسێک کە لەژیانمدا لێی ترساوم باپیرم بووە، کەسی تر نەبوو، ئەوەشی کە خۆشم ویستووە هە رباپیرم بووە.

ڕێبوار وتی: باشە، بەڵام من ئەتگەیەنم قسەناکەم و بەمەرجێک بڕۆین بەیەکەوە نانێک بخۆین.

وتم: لەخزمەتدام کاک ڕێبوار گیان بە خۆشحاڵییەوە.

کاک ئەحمەد هەموو فیشەکی دەمانچەکەی بەتاڵکرد و دەمانچەکە و شانەکەی دایەوە دەستم و ئەم لاولای ماچکردم و خواحافیزیمان کرد و منیش دەستی حاجی غەریبم ماچکرد.

چووین بەرەو سەیارەکەی کاک ڕێبوار، کاک ڕێبوار دایکی و کچەکەی پێناساندم، دایکی ناوی ئافتاو خان بوو کچەکەشی پەروانەی ناو بوو.

من لە پێشەوەی لاندگرۆزەکەی دانیشتم، هەستم کرد بەرپرسە بەهەرحاڵ قسە لەمن و قسە لەو ئیشت چییە و کارت چییە؟ ئەو ئاشکرای کرد لە پلەی لیوایە و لە مەعسکەری سارداو لای تاسلوجە دەوام دەکات.

لەسەر قەبری دەزگیرانی کچەکەی بوون، بۆم دەرکەوت ژنەکەی تەڵاق داوە و کچەکەشی بەم نزیکاتە دەگەڕێتەوە ئەڵمانیا بۆ لای دایکی.

ئەو شەوە منیان برد بۆ هۆتێلی ئاشتی (فندق السلام) لە چێشتخانەکەی نانمان خوارد، هەر لە وێوە تەلەفۆنم کرد بۆ دایکم و پێم وت: درەگ دەگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە خەمی منی نەبێت، ئەوانیش

ئاگاداربوون کە تەلەفۆنم کرد ئیتر خۆشحالبوو بە ناسینی من و منیش زۆر خۆشحاڵ بووم بەناسینی ئەوان.

لەگەڵ پەروانەدا کەوتینە قسە، باسی ئەوەی کرد کە گوێی لە چیرۆکی من بووە بە کورتی لەسەر گۆڕی دالیا کە بۆ حاجی غەریبم باسکردوە، ئەویش باسی چیرۆکی ژیانی خۆی بۆکردم.

پەروانە بۆی گێڕامەوە...

لە دوای ئەوەی باوک و دایکی جیابونەتەوە، هیچ خۆشیەکی لە ژیان نەدیوە، دایکی لە ئەڵمانیا و باوکیشی لیوا لە کوردستان، هەمیشە ترسی ئەوەی بووە باوکی لەدەست بدات، دایکیشی شوی کردۆتەوە بەکەسێکی تر لە ئەڵمانیا.

پەروانە گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی، حەزی بە تێکەڵی کەس نەکردووە، لەپڕ کوڕێک دەناسێت ئاشنایەتی پەیدا دەکەن، دوای پەیوەندیەکی خۆشەویستی دێنە داوای پەروانە و ئەویش ڕازی دەبێت.

لە پێش ئاهەنگی زەواجیان دەزگیرانی پەروانە داوا لە پەروانە دەکات کە کۆتا سەفەری بڕوات بۆ سەیران لەگەڵ هاوڕێکانی بۆ سەیرانگای دوکان، دوای ئەوە ئاهەنگ دەکەن، وەک پەروانە باسی کرد گوایە پێی وتوە: ئەمە کۆتا سەفەری تەنیایم دەبێت ئیتر بەیەکەوە هەمیشە سەفەر و سەیران دەکەین...

پەروانە دەستی کر دبەگریان و بەردەوام بوو لە گێڕانەوە...

وتی: ئەو شەوە دەستگیرانەکەی کە (دیاری) ناوی بووە تەلەفۆنی بۆ نەکردووە زۆر بێتاقەت بووم و تووڕەش بووم، تەلەفۆنی کرد بۆ ماڵی باوکی خوشکەکەی هەڵیگرت و دەگریا، منیش وتم ئەوە چییە چیی بووە؟

خوشکی دیاری وتی: پەروانە گەردەنی دیاری ئازاد بکە ئەو ئاشقی کەسێکی تر بووە، تۆی بە جێهێشتووە.

کە وای وت خێرا تەلەفۆنم داخستەوە خێرا چووم بۆ ماڵیان، تەماشا دەکەم قوڕپێوانە.

وتم: ئەی هاوار چییبوە؟

وتیان: دیاری ئەشقی فریشتەکان بووە لەگەڵ ئەوندا ڕۆشتووە کە بەکارەساتی سەیارەلە ڕێگای دوکان کۆچی دوایی کردووە.

من و پەروانە و نەنکی دەستمان کرد بەگریان و کاک ڕێبواریش هەر فریای دەستەسڕی کلێنکس دەکەوت بیهێنێت بۆمان، دوای ئەوە نانمان خوارد بەرەو ماڵ گەڕاینەوە، منی دابەزاند لەبەر دەرگای مالەکەماندا، وتی: ئەوە مالی ئێوەیە؟

وتم: بەڵێ، فەرموون دابەزن ئیسراحەت بکەن؟

کاک ڕێبوار وتی: واتە ئامینە خان دایکتە کاک خەسرە؟

وتم: بەڵێ دایکمە، دایکم دەناسیت؟ چۆن دەیناسیت؟




کاک ڕێبوار وتی: دایکە دابەزە ئەوە ماڵی کاک عەبدولکەریمە بابچین سەرێک بدەین لە ئامینە خان.

وتم: بەس کاک ڕێبوار وەعدت داوە قسانەکەی، با دایکم نەزانێت.

کاک ڕێبوار وتی: کاکە خۆمن مناڵ نیم ساحیب قسەی خۆمم، دەڵێم دوکانێکم لە خەسرەو کڕیوە.!

وتم: دەیفەرموون...

هاتنە سەرەوە لەگەڵمدا، دایکم بەخێرهاتنی کاک ڕێبواری کرد و زۆر خۆشحاڵ بوو وەک ئێمە و مانان مامەڵەی لەگەڵ کرد و دەیگوت ڕێبوار گیان بەخێر بێیت.

کاک ڕێبوار ڕوویکردە من و وتی: ١٠٠ جار نانی دەستی دایکتم خواردووە، من پێشمەرگەی باوکی تۆ بووم کاک خەسرەو، ئەو کاتەی کەماڵتان لە قەراتێ و جارخ بوو، بەس نەمزانیوە کاک عەبدولکەریم کوڕی وەک جەنابتی هەیە؟!

دایکم وەڵامی دایەوە و وتی: ئاخر لەو سەردەمە دوان لە کوڕەکانم شاردبووەوە لە ماڵی باوکم و خەزورانم لە سەیدسادق _ سلێمانی، خەسرەو لەماڵی باوکم بوو پێشڕەویش لە ماڵی خەزورم، نەشمان دەهێشت کەس بزانێت منالەکانمان لای ئەوانن.

ڕێبوار هەندێک یادگاری بۆگێڕاینەوە، شەو درەنگی کرد و ڕۆییشتن و مالئاوایی مان لە یەکتر کرد.



پەروانە ئەو شەوە زۆر دەیپرسی لە تەمەنم و لەکار و پیشەم و هەستم دەکرد زۆر نزیک ئەبێتەوە، ژمارەی تەلەفۆنی خۆم دا بەکاک ڕێبوار ئەوان ڕۆشتن.

هەمان شەو کاتژمێر ١ شەو بوو لە پڕ زەنگی تەلەفۆنەکەمان لێیدا ئاگام لێبوو دایکم هەستا و وتی: خەسرەو تەلەفۆن بانگت دەکات!

وتم: کێیە؟

دایکم وتی: دەنگی کچێکە.

تەلەفۆنەکەم بەرزکردەوە و وتم: بەڵێ، فەرموو!

پەروانە بوو وتی: کاک خەسرەو حەزدەکەم قسە بکەین.

گوێم لە دایکم بوو وتی: ئەوە کێیە سوتاوە وا بەم شەوە تەلەفۆنت بۆ دەکات؟

وەلامم نەداوە، بە پەروانەم وت: خەڵک لەم ژوورە خەوتوە تەلەفۆنەکە دەبەمە جێگایەکی تر.

ئەو شەو دەستمان کرد بە قسەکردن بەوە دەستی پێکرد کە خەوی لێ ناکەوێت و باوکیشی ئیجازەی داوە قسە لەگەڵ من بکات، نەوەک منیش بێتاقەت بم، بەلام زانیم ڕاست ناکات ئەو خۆی لە من بێتاقەتربوو حەزی لە قسەش بوو.




دەستمان کرد بە قسە و قسەیەک لەمن و قسەیەک لەو حەزت لە چییەو چ ڕەنگێکت حەز لێیە، لەم جۆرە قسانە و گوێ لە کام گۆرانی دەگریت، ئیتر من بۆم باسکرد کە جاروبار شیعر دەنووسم، تا دەمەو بەیانی قسەمان کرد تەلەفۆن داخرایەوە مەوعیدمان دا بەیەکتر کە یەک ببینین.

ماوەیەکی زۆر بەردەوام بووین لەسەر یەکتر بینین، خۆشەویستی درووست بوو لە نێوانماندا.

ئیتر زۆر هۆگرم ببوو لە ئەلمانیاوە جلی بۆ ئەهێنام و هەمیشە ئەو دەستنیشانی جلوبەرگ و ئەوشتانەی دەکردم.

پەروانە باوکی کوژرا لە شەڕی ناوخۆ، دوای کوژرانی باوکی بەداخەوە ئەو کچە شێت بوو، باری دەرونی زۆر ناجێگیر بوو، گەڕایەوە بۆ ئەڵمانیا بۆ لای دایکی، تا ئێستاش نەمبینیوەتەوە، هیچ قسەیەکی لەگەڵدا نەکردوومەتەوە.

ئەوەی یادگارییێت کە لەنێوانمان دا مابێتەوە، بێجگە لە جلوبەرگ تەنها شیعرێکە، کە کاتی خۆی بۆم نووسیوە، دوای ئەویش تەواوم کردووە، واتا کاتێک بۆ ئەوم نووسی چەند چوارینەیەک بوو، بەڵام کە ڕۆیشت و دەنگی نەما ئیتر کۆتایم بە شیعرەکە هێناوە.



ئەمەش دەقی شیعرەکەیە:

سروەیەکی بەیان دێت بەڕوما

پەڕەی گوڵە خونچەکان دێت ماچم دەکا

ڕامام بۆ ئەو سۆزە، ڕابردووم بیر دەخاتەوە

ئەو دەنگە یاری بە ڕۆحم دەکا

ئەی تۆی ئازیزی دڵم چیت دەوێت لێم

لەو غوربەتەی دڵم و قیبلەی بێ نازی عیشقەم

وا لەم تەنهاییە بوویتە نمای گیانم

خۆ ڕابووردوو بەگیانمدا

دەچۆڕێ، کەچی وا تۆش بویتە یادگاری

ئەوەندە بارانت باراند لەسەر دلما وەک مرواری

واچەکەرەی ئەوینت خەریکە سەوز دەبێت دەکا یاری

ئەی نازانی من نەزرم کردووە نابێت خۆشەویستم هەبێ

من بەلێسەی کۆنە عشقم گرتووە و نێڵەم دێ

بۆ ئەوەندە دەپرسیت لە ڕۆژی لە دایک بوونم

دەبینوسە لای خۆت کەی تۆم ناسی ئەوکاتە من لەدایک بووم

وەک ئۆقیانووس لەسەر ڕازما شەپۆل دەدەی

ئارمانم دەکوشیت و بۆ خۆتی دەبەی





## مەملەکەتی عیشق

ئەوەندە مەپرسە لە بەرزی باڵام ئەی باڵا

ئەگەر ویستت بیکە بەخاچێک و خۆتی پیا هەڵبواسە

ئەوەندە لە ڕەنگی گڵێنەم مەپرسە

وەرە لە ناویدا دابنیشە و ئارام بە

جاران من دەروێشی ئەڤین بووم

بەڵام کە ئەو تەریقەتی جێهێشت منیش بێ لانە بووم

ئێستا ئەو ڕۆح و منیش لاشەیەکی دابڕاوین

چاوەڕوانین لەم بەرزەخەدا لەم کفنە دا دابماڵرێن

زامم هەر شتەی ئازەرە و وا دەمپێچێ

کەچی تۆ نازی ماچت لێم دەوێ

سەر هەڵبڕە سەیری

بریسکەی ئەو ئەستێرانە بکە چۆن دەنازن

هەموو لەڕێگای ئەوین باڵایان گرتووە و وا لاسارن

من ناتوانم وەک ئەوان بم و باڵا بگرم

لەبەر ئەوەی من بەدوای کچی ئاودا وێڵم

تۆش ئاگری بلێسەت دێ کەچی من کوڕی خاکم و وا گیانم

شەقار شەقار دەبێ



ناوەڕاستی نەوەدەکان بوو دیسانەوە هەوای مەشڕوب خواردنەوە و سەرسەریەتی هاتەوە مێشکم، زۆر لەخۆم بێزار بووم، هیچم بۆ نەدەهات بەدەستەوە، دیسانەوە شەڕەنگێزی ڕووی تێکردمەوە، باپیرم توڕەبوو لێم هەموو پارەکەی لێ سەندمەوە، تەنانەت قسەشی لەگەڵ نەدەکردم دەریشیکردم، دایکمو نەنکم جاروبار لەڕای خوا ٥ دیناریان ئەدامێ، لەبەر ئەوەی فێری قومار و ئەوشتانە ببووم.

## چیرۆکی شەشەم

## شەوێک بەسەرخۆشی خۆم دەکەم بە مزگەوتدا بە دەرویشی دێمە دەرەوە..

شەوێک پارەم پێنەبوو چارەکێک ئارەق لە گیرفانی قەمسەڵەکەم دا بوو خواردم دای لە مەعیدەم، زۆر بێتاقەتی کردم پارەی کاکە بڕوا و کاک حەمە تایەری بەقاڵ قەرزار بووم ڕووم نەبوو بڕۆم هەندێک شت بێنم بیخۆم، کوڕێکی هاوڕێم ناوی جەمال بوو بینیم.

وتم: جەمال چی دەکەیت پارەو پێیە؟

جەمال: نەبەخوا هیچ شک نابەم.

تۆزێک بەسەر جادەی ٣٠ مەتریەکەدا لای گوێژە دەگەڕاین و پیاسەمان دەکرد گوێم لە دەنگی بڵندگۆی مزگەوتەکان بوو مامۆستاکانی مزگەوتەکان قسەیان دەکرد و وتاریان دەخوێند موناجات بوو دەنگی دەف و سروت لە گۆیژە و شەهیدان و تا دەگاتەوە تۆی مەلیک هەمووی ئاواز بوو، ئەو ناوچە یەکپارچە نوور بوو، منیش وتم: جەمال ئەوە چییە؟ ئەو فەرتەنەیە؟

جەمال: ئەی هەتیو نازانی مەولودنامەیە!

وتم: مەولودنامە ئەوەنییە چێشت و گۆشت دروستدەکرێت؟



جەمال: با بەس لە مزگەوت وانییە.

وتم: ئەی چۆنە جەمال؟

جەمال: لێرە گوێز و مێووژ و شەربەت و شتی وا دابەشدەکەن.

وتم: ڕاکە هەتیو با بڕۆین بەشی مەزەکەمان بێنین تا ماوە فریاکەوین، بڕۆین بۆ کام مزگەوت باشە؟ مزگەوتی حەمەی حاجی ڕەشید یان شێخ عوسمانی سیرێ؟

هەردوو لا نزیک بوون لە گەڕەکی ئێمەوە.

کە چووین بەرەو مزگەوتی شێخ عوسمانی سیرێ، هەر کە چوومە ژوورەوە نیوەی مزگەوت تەماشای منیان دەکرد زۆربەیان واقیان وڕما بوو.

پێشتر مەعروف بووم لە گەڕەکدا، چوونم بۆ مزگەوت زۆر ئاستەم بوو بۆیە ئەوانەی منیان دەناسی چوونم بۆ مزگەوت زۆر بەلایانەوە سەیر بوو.

منیش هیچ خۆم تێکنەدا و چووم لە دواوە دانیشتم پاڵم دا بە دیوارەکەوە بۆ ئەوەی کەس تەماشام نەکات، چاوەڕێم کە گوێز و مێووژەکە دابەشبکەن و ئیتر منیش بچمە دەرەوە.

ئاگام لێی بوو لای میحرابەکە لە تەنیشت مامۆستا مەلا ئیسماعیلی دێرێیی دنیایەک زەرفی مێووژ دانرا بوو کاک د.حەسەنی حاجی سابیر ئەو دەمە فەقێ بوو عەریف مەولود بوو، دەبوو ئەو تەوزیعی بکات هەر نەهات خەریک بوو دڵم ئەتەقی،

بەهەرحاڵ ناچار چاوەڕێم کرد بۆ نەهامەتیش من نەمدەزانی کە پیاو بچێتە مزگەوت دەبێ چی بکات، نەمزانی جەمالیش چی بەسەر هات لێم ون بوو کەس حاڵی بە حاڵم نەبێت زوو زووش هەرچیم ئەبینی تەوقەی گەرمیان دەکرد دەیان گوت کاک خەسرەو بەخێر بێیت، وایان دەزانی عومەری کوڕی خەتاب هاتووە بۆ مزگەوت، منیش خەیاڵم هەر لای مێووژ و گوێز و نوقلەکە بوو.

دوای ئەوەی گوێز و مێووژەکە لە زەرفێکدا دابەشکرا و من دوانم وەگرت دانەیەک حەقی خۆم و دانەیەکیشی بە گەندەڵی، بەهەرحاڵ وردە وردە ویستم خۆم بدزمەوە بێمە دەرەوە...لە پڕ پیاوێکی زۆر بەڕێز بە ناوی کاک سەڵاح ستار...هاتە لام و بە توندی دەستی کوشیم و تەوقەیەکی زۆر گەرم و گوڕی لەگەڵ کردم کۆمەڵێک لاویتری ئەهلی مزگەوتەکەی لەگەڵدا بوو هەندێکیانم دەناسی و هەندێکی تریان یەکەم جاربوو بیان بینم لەوانەی دەمناسین کوڕی گەڕەک و قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی بوون لەوانە کاک ئاراس کە لەبیرم مابێت کاک نەریمان کاک ئەنوەر بە علوم حەدیث ناسرابوو زۆرێکی تر، کاک سابیر کە ئێستا پارێزەرە کاک ڕێبوار شێخەلمارێنی کە بەردەوام لە فەیسبوکەکەمەوە بابەتەکانم شێر دەکات، ئەگەر هەڵە نەبم کاک ئازادی شێخەلمارێنی سەرنووسەری گۆڤاری خود لەدەوری یەک دانیشتین (لێرەشەوە سڵاوی خوای گەورە لە هەموویان بێت و حورمەتی زۆرم بۆ ئەو باقە لاوەی یەکەمجار لە مزگەوتدا ناسیومن).

هەموو ئەو کوڕانە خەڵکی مولتەزیم و بەڕێز بوون، بەتایبەت مامۆستا سەڵاح دەرچووی کولیەی شەریعە بوو لە بەغداد.




تا بڵێی پیاوێكی بە ئیمكانیەت بوو لە زانست و قسەكردندا، دەرفەت كرایەوە بۆ قسە و منیش ویستم بڕۆمە دەرەوە پاییزێكی خۆشی سلێمانی بوو، دەرەوە زۆر فێنك بوو لەسەر سەكۆی پێش میحرابەكە دانیشتین ئەودەمە سەر بەتاڵ بوو چاك نەكرابوو وەک ئێستا، دوای ئەوەی بەخێر هاتنی من كرا و خۆشحاڵیان دەربڕی و یەكەمجار بوو منیش بە خزمەت ئەو خەڵكە بەڕێزە بگەم، ناشزانم جەمالی ڕەفیقم چی لێهات، جێی هێشتبووم دەستكرا بە قسە و منیش بە ئوسلوبێكی زۆر بازاڕی دەستمكرد بە قسە زوو زوو كە قسەم دەكرد هەر دەمووت (بەشەڕەفم بە تەڵاقی پێغەمبەر) بێ ئەوەی یەک كەس لەو پیاوە بەڕێزانە قسەم پێ ببڕن یان قسەیەكی ناشرین دەرحەقم بكەن (چونكە من بە نەزانی كوفرەكەم دەكرد).

باسی دەروێشم دەكرد هەر لە خۆمەوە هیچیشم نەدەزانی ئەویش جاروبار لە مەجلیسی باپیرم دا گوێم لێببوو، چونكە ئەو كۆنە دەروێشی شێخ عبدولكەریمی كربچنە بوو، وتم كاكە ئێمە هەمووومان ئیسلامین بەس ئەم ئیسلامیانە دنیایان تێكداوە بەسەر یەكدا من حەز دەكەم بێم بۆ لاتان بەڵام كاكە خۆمنیش یەكێتیم و ئەوەنییە موسوڵمانم و هاتووم بۆ لاتان نوێژ دەكەم!بەخوا دەروێشی كاكە حەمەشم!یەک دوو قسەی بێ مەعنای ترم كرد ئەو خەڵكە هەموو بێ دەنگ بوون.

دوایی كاک سەلاح ستار خوای گەورە تەمەن درێژی بكات كە دەستیكرد كرد بە قسە سبحان الله ئەو پیاوە دڵی منی كردەوە ئەوەندە بە ئەدەبەوە دەستی كرد بە قسەكردن ئەوەندە خۆش قسەی كرد حەزم نەدەكرد شەوەكە تەواو بێت باسی شرک و تەوحیدی كرد، هەرچەندە بۆمن وەک



ئەوە وابوو گوێز و مێووژم بۆ بژمێرن، قسەکانی بەڕاستی چوونە ناومێشکم دوایی لە قسەکانی تێگەیشتم.

خوا حافیزیەکی گەرمیان لە من کرد و منیش بە کۆڵانی مزگەوتدا هاتمە خوارەوە لە کەلاوەیەکدا دانیشتم تۆزێک لە عارەقەکەی کە پێم مابوو لەگەڵ مێووژ و گوێزەکە خواردمەوە، بەڵام کەئابە و خەمۆکیەک گرتمی لە ژیانمدا شتی وام بە خۆمەوە نەدیبوو، هەر کات بێزار دەبووم دەگریام یان بە مەشروبم خۆم مەشغول دەکرد بۆ ئەوەی خەمەکانی خۆم بیر چێتەوە، من ئەو دەمە هەموو ژیانم فشقیات و گۆرانی و ئەم سەر و ئەو سەری گەنجێتی بوو، لەو سەریشەوە بێزاری و بێتاقەتی عیشقی لەدەستدانی خۆشەویستەکانم بوو.

چوومەوە ماڵەوە، نەنکم یادی بەخێر، وتی: ئەوە بۆ عەبوسی؟ دیسان پارەت پێ نییە؟

وتم: لە مزگەوت بووم مەولودنامە بوو حەزدەکەم بخەوم.

نەنکم وتی: چیی؟ کەری کێ تۆپیوە تۆ چویتە مزگەوت!

وەڵامم نەداوە زۆر بێزار بووم، نەشمدەزانی چییە!

کە سەرمکردە سەر سەرین تەنها یەک شت بەمێشکم دا هات، ئەویش ئەدەب و حورمەتی ئەو خەڵکەی مزگەوت و جیاوازی لەگەڵ ڕەفیقەکانی سەرمێز و سەرجادەی ٣٠ مەترییەکە کە هەمیشە خەریکی قسەی بێ مەعنا و گۆرانی وتن و شەڕە جنێو بووین، دوای ئەم کچ و ئەو کچ کەوتبووین.







بەیانی هەڵسام باپیرم وتی: کاکە گوێم لێبوو وتت لە مزگەوت بووم؟!

وتم: بەڵێ.

باپیرم وتی: کوڕم هەر ئیشێکت کرد بە پیاوانە بیکە یان مەڕۆ مزگەوت.

وتم: ئاخر بابە، مم زۆر تاوانبارم تۆ بڵێی خودا لێم خۆشبێت؟

باپیرم وتی: خوای گەورە خوای خەراپەکارانە پێش چاکەکاران ئەو خوایە تەنها ڕاستگۆیی دەوێت کە ڕاست گۆبوویت بە پاکی گەڕایتەوە بۆلای دڵنیابە لێت خۆش دەبێت.

قسەکەی باپیرم زۆر کاریگەری لەسەرم دروست کرد وتی خوای پەروەردگار خوای خراپەکارانە پێش ئەوەی خوای چاکەکاران بێت.

هەڵسام خۆم شۆرد و دەستمکرد بە نوێژکردن و زۆر پاڕامەوە کە ئیتر کاری خراپ ناکەم بڕیارم دا واز بهێنم لە هەرچی شتی خراپە.

سێ ڕۆژ لەماڵەوە نەچوومە دەرەوە دەستمکرد بە نوێژکردن و تەهلیلە و خوێندنی جزئی عەمە و ئیتر سۆفی بەحاڵم نەبێت، لە ماڵ نەدەچوومە دەرەوە، نەنکیشم لە خۆیەوە بڕیاری دەرکرد کە من شێت بووم.

نەنکم بە پاریمی وت: (حەمە خەسرەو شێت بووە فریایکەوە یان بە ئامین (دایکی خۆم) بڵێ با دوایی شتێکی لێنەیەت بەخوا ماڵی حەمەی سەعی حەیامان دەبەن، (حەمەی سەعی) باپیرمە لە تەڕەفی باوکم واتە باوکی باوکمە دوایی خونچە حەیامان دەبات (دایە خونچەش نەنکمە) هەموویان بەڕەحمەت بن).



منیش کە گوێم لەم قسەیە بوو پێتشر ئاقڵ ببووم، بەڵام دیسان شێت بوومەوە، هەزار و یەک جنێوم دا و خۆم گۆڕی و وتم: هەر نوێژ ناکەم.

ئینجا ڕووم کردە پەروەردگار و وتم: من ویستم لەگەڵ تۆ ببم بە ڕەفیق وات لێکرد کە بەمن بڵێن شێت، ئەوە ئێستا ئەچم بۆنادی تێر و پڕ دەخۆمەوە، من و تۆ ڕەفیقایەتیمان تێکچوو خەتای منیش نییە.

چووم بۆ نادی هێشوو لە ئەسحابە سپی خاوەنی نادییەکە ناوی هۆگر بوو وتی: ها سورە چەند ڕۆژە دیار نیت؟

وتم: لای خوا بووم، وا هاتوم بۆلای شەیتان.

هۆگر زۆر زل بوو لەمنیش گەورەتر بوو، بەڵام هەندێک قسەی لێ قبوڵ دەکردم لەبەر ئەوەی کوڕە شەهید بووم، چووم تێروپڕم خواردەوە، خەیاڵ بووم بە فایەقە ڕەشەوە گرتم ئەودەمە بەرپرسی ئاسایشی سلێمانی بوو لەسەر لیستی پارتی، کەسێکی لێبوو لە نادییەکە ئاسایش بوو هەر دەیوت کاک فایەق واو کاک فایەق وایکرد منیش یەکێتیم لە داخی پارتی بەقەدەر هەموو دنیا لەسەر دڵم بوو.

تا بازاڕی دیلان هاتم بۆ لای کوڕێکی ڕەفیقم لە خۆم هیچ و پووچ تر بوو ناوی سەباحی عەبەی سەلاجە بوو، دانیشتم دەستم کرد بە جنێودان بە فایەقە ڕەش ئەوەندەم جنێودا ئەوەندەم جنێودا تا ئاساییشی موحتەرەم هاتن بۆ لام و وتیان لە ئاسایش بانگت دەکەن.

ئەوەندەی تر جنێوم دا ئەوانیش کەوتنە گیانی من منیش دەمانچەی قەلەباچکە میکارۆفەکەم پێبوو تەقەم کرد ڕامکرد و خۆم کرد بامالی حاجی




فەلاحدا و دەرگاکەیانم کردەوە کەس ئاگای لێنەبوو، نزیک بوو لە گەڕەکی پیرمەنسورەوە سەرو بازاڕی دیلان یان جوانتر بڵێم سەرو مزگەوتەکەی بەرامبەر ئەو بازاڕەیە، دەمانچەکەم شاردەوە بەڵام عەزیەتم پێ گەیشتبوو، هەندێک مامەوە کاک نەسروڵلا بەڕەحمەتبێت لەماڵەکەی هاتە دەرەوە و وتی ئەوە چییە؟ وتم شەڕم کردووە، چوومە ژوورەوە بۆ ماڵی کاک نەسروڵلا کەس لەماڵ نەبوو، کاک نەسروڵلا پیاوێکی زۆر بەڕێز بوو زانیم لەسەر پێیە ئەویش دەڕوات دوای دەموچاوشتن هاتمە دەرەوە پێشم وت دەمانچەکەم شاردۆتەوە وتی: بۆم بێنە دامێ و ئەو بۆی هەلگرتم هەزار ڕەحمەتی لە گۆڕی، چووم بۆ لای عوسمانی سەروپێ ئێواران سەروپێی هەبوو بێ ئێوە ناخۆش بە خوێن و جلی دڕاوەوە تێر و پڕ سەروپێم خوارد، بەڵام نەمدەزانی وەزعەکە چۆن بووە.

ئاسایشەکان باشیان لێدابووم منیش باش لەگەڵیان هاتبوومە دەست بە سەرخۆشیش یەکێکیانم بە کلکە دەمانچە داغان کردبوو، ئاسایش بە شوێنم دا دەگەڕان.

تۆزێکی پێچوو مەفرەزەیەکی ئاسایش لە سەروپێخانەکەدا دابەزین منیان برد قسەم نەکرد، بردمیانە لای کەسێک پێموابێ عەمید بوو ناوی کاک نەجات بوو پارتی بوو لە ئاسایشی سلێمانی خوا هەڵناگرێت زۆر بەڕێز بوو، بەڵام موفەوەزێکی لێبوو ناوی عومەر بوو لاڵ بوو زۆر خوێڕی بوو ئەو کەسە دەفتەرێکی بەرگ ڕەقی پێبوو بیستبووی لە ئاسایشە پارتییەکانم داوە یەک دەفتەری بەسەرمدا کێشا.

دوو سەعات سجن کرام د.کەمال شاکری یەکێتی مامۆستا شاهۆی ئاگادار کردبووەوە کەمن گیراوم ئەم بەرپرسانەش هەموو ڕەفیقی باوکم



بوون دوای دوو سەعاث بانگیان کردم بۆلای مامۆستا شاهۆ نەسیحەتی کردم و ئەو کاک نەجاتەش کارەکەی بۆ ئاسان کردم ئازادیان کردم.

ئەوەی لیرەدا گرینگە باسی بکەم، ئەو دوو سەعاتەی زیندانی ناو ئاسایشە.

بەجلی دڕاو و سەر و گوێلاکی خوێناویەوە چوومە زیندان، ئەوێ زۆر قەڵەباڵغ بوو کەس جێگای نەکردمەوە خۆی قاعەکەش هەر زۆر بچووک بوو، کوڕێکی زۆر قۆز و جوانخاس ڕیش پڕ بانگی کردم وتی وەرە لای من دانیشە بزانم بۆچی گیراوی؟

منیش وامزانی وەك خۆم وایە وتم کاکە سەرخۆش بووم لەگەڵ ئاسایشەکاندا بووە شەڕم، ئەم کوڕە چەند قسەی جوانی بۆ کردم.

وتی کاک خەسرەو مرۆڤ تەمەنی بەشی خۆشەویستی ناکات چۆن شەڕی پێدەکات.

وتم: ئەی تۆ بۆگیراوی وتی لەسەر شوبهە.

ئیتر نەمپرسی لێی شوبهەی چی، ئەوەندە قسەی بۆکردم حەزم دەکرد هەر زیندانیبم ئەوەندە قسەکانی خۆش بوو، ناوی سەیوان بوو یەکێك بوو لە پێشمەرگەکانی (حەرەکە) لە ئاسایش زیندان بوو لە دوای شەڕەکەی مابوویەوە و گیرابوو.

بەهەرحاڵ لە قسەکانی کاک سەیوان لە داهاتودا و لە باسەکانی تردا کاریگەری ئەو دووسەعاتە ڕوون دەکەمەوە، کە بانگیان کردم بەئاشکرا




وتم کاکە دەمەوێت لە زیندان بم هەموو خەڵکی ناو زیندانەکە دەستیان بە پێکەنین کرد.

بەربووم هاتمەوە بۆ ماڵەوە بۆ بەیانی لە کۆمیتەی ٣ی بەشی کاسبکاران بانگکرام ئەو دەمە ئەندام پۆل بووم لەوێ لای مامۆستا عەبدوڵڵای حاجی سەعید کە ئێستا نوێنەری مام جەلال_ە بۆ کاروباری بازرگانی، ئامۆژگاری کردم وتی: تۆ لەمەولا ئیشت گەورەترە لای ئێمە.

بەڕاستیش من یەکێتیم ئەودەمە لە هەرچی شتە خۆشتردەویست، بۆ؟ نازانم ڕەنگە هۆکارەکەی ئەوەبوبێت کە زۆرێک لە هاوڕێکانی باوکم یەکێتی بوون، بەهەر حاڵ چوومە ناو دەزگاکانی یەکێتی و زیاتر دەستم کردەوە بە ئیشوکار دوور کەوتمەوە لە ئەهلی مزگەوت. لە دوای چەندین دانیشتن لەگەڵ مامۆستا عەبدوڵڵا، زیاتر ئێمە لە ڕووی ڕێکخستنەکانی یەکێتی و کارکردنی ڕێکخراوەیی زۆر بەهێز بووین.

ئەو ماوەیەش بەهۆی {مامۆستا ئومێد ئاشنا} یادی بەخیر هاوڕێیەکی باوکم بوو کەسێکی ڕۆشنبیر و نووسەرێکی بەناوبانگ بوو، هاوکاری زۆری منی کرد بۆ پێگەیشتنم.

جاروبار ژیاننامەی شەهیدانی یەکێتیم دەنووسیەوە لە ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ لەپەڕەی کۆتایی یان پێشکۆتایی بڵاودەکرایەوە، ئەو دەمە مامۆستا {موستەفا سالح کەریم} سەرنووسەر بوو.

یەکێتی و بەتایبەت مامۆستا عەبدوڵڵا و کاک کەمال کوردی (یادی بەخێر) بەرپرسی کۆمیتەی دوو و کاک بەرزان و بەتایبەت تر مامۆستا ئومێد ئاشنا منیان بەرزکردەوە بۆ ئاستێک کە لەتەمەنی من بەرزتربوو،



بەڵام کێشە لەوەدایە تەمەن لەگەڵ ئەقڵی منداڵیدا ڕێ نەکات هەرگیز ئەقڵێکی ساغ وتەندروست نابێت، لەگەڵ تەمەنەکە دا بگونجێت کە زۆری وەرگرت منداڵی لە دەست ئەدا کە پێشت نەبەخشی گەمژە دەردەچێت، پێویستە پێوانەی تەمەن ڕابگیرێت و بەگوێرەی تەمەن منداڵ بەخێو بکرێت، چونکە من بۆ خۆم هەرچەندە توانای زانیاری وەرگرتنم هەبوو بەڵام ڕۆحی موراهیقی و سەرشێتی لە ناوجەستە و مێشک و ژیانی من دا قوڵپی ئەدا، ئەمەش هۆکارێکی زۆر گەورەیە کە ماماڵە لەگەڵ تەمەن نەکرێت، من لەبەر ئەوەی کوڕە گەورە بووم، مامەڵەم لەگەڵ تەمەنی ٥٠ساڵدا دەکرد لە کاتێکدا خۆم ١٨ بۆ ١٩ ساڵ بووم.

تەمەنی منداڵیم لەدەست دابوو، دەبوو هەمیشە لە مەجلیسی پیاو ماقوڵاندا دابنیشم، دەچووم بۆ یاری هەموو دەیان وت عەیب ناکەیت تۆ کوڕەگەورەی ماڵیت چۆن دەچیت یاری دەکەیت، ئەو کاتانەشی کە باوکم مابوو هەر خەریکی میوان بەڕێکردن و پێڵاو جووت کردن و چا گێڕان بووین، یاخوت حیمایەی باوکمان بووین.

ئەمەش وای کردبوو منداڵیمان بەتەواوەتی لەدەست دابوو، جاری واهەبوو حەزمان لە فلیم کارتۆن بوو خێرا هەڵیان دەستاندین دەیان وت ڕاکەن میوان هات.

من لەداخی میوان و پیاوی قسەزل و قەرەباڵغی هەموو منداڵیم لە دەست دا.

١٤ ساڵ بووم دەوری پیاوی ٤٠ ساڵیم دەبینی، لاشەو ڕوخسارمان منداڵ بوو، بەڵام ئەقڵ و مامەڵامان گەورە بوو ئەمە بووە هۆکاری ئەوەی لە کاری

ڕێکخستندا زۆر سەرکەوتووبم لە ناو یەکێتیدا تەنانەت دەچوومە کەرکوک زانیاری درووستم دەهێنایەوە بۆ یەکێتی.

لەو هێلەی کە کارم دەکرد لە ناو ڕێخستنەکانی یەکێتی پەیوەست بوو بە خودی تاڵەبانییەوە ئەو سەردەمە بەو شێوەیە کار دەکرا.

هەر لەوسەردەمەوە نازناوی (ماکوان)م بۆ دانرا لە لایەن مامۆستا عەبدوڵلای حاجی سەعیدەوە، دەچوومە کەرکوک بۆ کڕینی مەعجونی ددان و کرێمی ڕیش تاشینی ئادەم و شامپۆی سن سن، ئەو جۆرە ماددانە لە سلێمانی پارەی دەکرد، وردە وردە دەستم کردەوە بە کاسبی.

لە کەرکوک زانیاریان پێدابووم کە ئەمن و جاشە کوردەکان لە ناوچەی مەجیدیەی کەرکوکن، منیش دەچوومە ئوتێلێک بە ناوی (سیف الدوله) زۆر جاریش بۆ خواردنەوە شەوان دەچوومە باڕی ئوتێلێك لە کەرکوک بە ناوی (قسر کرکوک) لەگەڵ کەسێک ئاشنا بووم گۆرانیبێژ بوو، بەڵام کۆنە تەواری بوو بەناوی مستەفا ڕەؤف، بەهۆکاری ئەوەی شەوێک گۆرانی وت زۆر ناخۆش بوو، منیش ئەوشەوە خەیاڵم خۆش بوو هەستی کوردایەتیم بەرز ببووەوە لە ناو ئەو هەمووە بەعسی و عەرەبانەدا چووم وتم یارمەتی هەیە منیش گۆرانییەک بڵێم؟

مستەفا ڕەؤف وتی: ئاساییە، منیش بەدڵی خۆم گۆرانییەکی ماملێم وت، بەناوی فاتمۆکێ...فاتمۆکێ کوێستانمان کێڵەشینە...بۆت نەژیم بەهار بڕوا هاوینە.

بۆ بەیانی تەماشای گیرفانم کرد (٦٥٠) دیناری تەزویری تێدابوو هەمووی (٥٠) دیناری بوو تومەس شەو شاباشیان دابومێ، بەیانی چوومە

سەیدەلیەکەی مەجیدیە بۆ شت کڕین لای خاوەن سەیدەلیەکە مستەفا ڕەوفم دی.

مستەفا ڕەؤف وتی: کاکە ئەم شەو پشتیمەت شکاند بەو گۆرانییە!

وتم: بۆ؟

وتی: (٢٥) دیناریان بۆ ئەهێنای هەر ئەتووت من پەنجایی وەردەگرم، لەو کاتەوە ناسینێکی ساد دە و ئاسایی لەگەڵ مستەفا ڕەؤف دروست بوو، بەردەوام من هاتووچۆی ئەو ناوەم دەکرد چەند جارێک لە سلێمانی بۆ ئەوێ، پاشان بەغداد لە ڕێگەی جەبارەوە زۆر جار دەگەڕامەوە بۆ کفری و کەلار ئینجا سلێمانی، کەرستەکانم لە ڕێگای لۆریەکانیماڵی شێخ عەبدولقادری چوێسەوە دەگواستەوە بۆ سلێمانی ئەوان هاوکاریان دەکردم.

لەو سەفەرانەوە زانیاری باشم بەدەست هێنا بۆ یەکێتی، بە هۆکاری کڕین و فرۆشتن لەگەڵ کوڕێکی خەڵکی کەرکوک کە ناوی عەدنان بوو لە سلێمانی ئاشنابووین، کوڕێکی زۆر باش بوو منداڵ کار بوو کوڕێکی جوانخاس بوو، برایەکی بەدەستی بەعس کوژرابوو، بە بۆنەی ئەوەوە دوکانەکانی کەرکوک شارەزابووم بەتایبەت بایعەکان کە شتی کۆنیان لا مابوو دەمان کڕیەوە، ڕۆژێک چووم بۆلای تەماشام کرد زۆر بێتاقەت بوو وتم: عەدنان ئەوە چییە؟ وەڵامی نەدامەوە، منیش تۆزێک بە کەرکوکی قسەی خۆشم بۆ کرد.

وتم: حەیاتم دەبلێ چییە؟



عەدنان وتی: ڕەعد تەکلیفی ڕابواردنی لێکردوم لەبەرچاوی دوو سێ ئەمنی تردا دەستی بۆ بردم منیش ڕامکرد، دەستی کرد بە گریان.

زۆر تووڕەبووم، بەجۆرێك ڕەشایی لەچاومدا نەما و هەمووی سپێ بوو

وتم: عەدە دەمانچە، کاڵاشینکۆف، ئاربیچی هیچ شك دەبەیت؟

عەدنان وتی: ئا دەمانچەیەکمان هەیە ئی کاکەمە لە ماڵەوەیە.

وتم: چییە؟

وتی: تۆکاریۆفە

وتم: کەڵەک ناکات؟ چونکە عادەتەن ئەوانە کۆنن دەردی کەڵەکیان لای خۆمە خۆمی نەکوشتووە بۆیە دەترسام.

وتی: نا زۆر جوانە و تازەیە.

وتم: چەند فیشەکی لەگەڵدایە؟

وتی: یەك شانەیە.

ئەمزانی کە کەمە بەس ئەوەندە تووڕە بووم خێرا چووین هێنامان، بە عەدنانم وت: بڕوات بۆ سلێمانی، کابرایەکی خەڵکی سلێمانی لە کەرکوک بوو سۆپەرێکی پێبوو گرتم بە خسوسی بۆ بەغداد وتم: کەی هاتم ببە بۆ بەغداد، بەڵام نەجوڵێیت لە نزیك چایخانەی مەجیدیە دامنا و وتم: ئەگەر شەو و ڕۆژی پێچوو نەجوڵێیت.



خوا هەڵناگرێ وتی بێخەمبە...

عەدنان ڕەعدی نیشاندام، پێشتر ئەوەم وتبوو بە عەدنان ئەگەر گیرام یان کوژرام بەکەس نەڵێت تەنها مامۆستا عەبدوڵلا حاجی سەعید نەبێت، کە بەرپرسی خۆم بوو.

نۆ هەزار دینارم پێبوو دامێ بیباتەوە بۆ سلێمانی تەسلیمی دایکمی بکات، چوومە ناو چایخانەی مەجیدیە ڕەعد یاری دەکرد لەگەڵ کۆمەڵێکدا، دانیشتم داوای چایەکم کرد بە دەنگی نزم، دەنگم بەرز نەکردەوە بۆ ئەوەی سەرنجی کەس بۆلای خۆم ڕانەکێشم، بێدەنگ دانیشتم پشتم لەوان بوو دەمانچەشم لە ناو تەکسیەکەوە خستبوە سەرپێ و ئامادەی تەقە بوو بەس تەنها ترسی وەستانی دەمانچەکەم هەبوو لەو کاتەدا، ئەگینا هیچ ترسێك لە دڵمدا نەبوو.

لە مەژغوڵی ئەوان دا بەدەم قاقای پێکەنینیانەوە و بە دەنگی بەرز قسەکردنیان لولەی دەمانچەم کردە ڕەعد هەر ئەوەندەم زانی تەقەم کرد، چاوم هیچی نەبینی تا دەمانچەکە فیشەکی تێدابوو تەقاندم و ڕامکرد، شڵەژام دامنابوو خۆم بکەم بە لای چەپی چایخانەکەدا، بەلام لە تاو شڵەژاوی بەرەو لای فندق (سێف دەولە) ڕۆیشتم خەڵکی ئەو ناوچەیەش منیان دەناسی، ئەودەمە نێوانی فندق (سێف دەولە) و قسر کەرکوک چۆڵ بوو کەلاوە بوو، بەڵام سیاج کرابوو بە بلۆك هەڵچنرابوو خۆم فڕێدایە ئودیو لەبەر شپڕزەیی و شڵەژاویم خۆم کردەوە بە ناو قسر کەرکوک و لە پڕ موستەفا ڕەؤف دێت لە نزیک چێشتخانەکەوە و وتی چییە کاک خەسرەو بۆ شڵەژاوی؟




وتم: شەرمکردووە لەگەڵ ئەمن و تەواریەکاندا بمپارێزە لە دەستیان، هەرچەندە من بیستبووم ئەو کەسە خۆی تەواری و بەعسییە، بەڵام زۆر پیاوانە منی لە چێشتاخانەی قەسر کەرکوکەوە بردە دەرەوە، تا بردمیە کۆڵانەکانی پشتەوە سواری تەکسی بووم بۆ جێگای ئەو سەیارەی کە گرتبووم بە کرێ بەرەو بەغداد ڕۆیشتم دەمانچەکەم دایە سایەقەکە کە بە پارە بۆم بێنێتەوە بۆ سلێمانی، سوپاس بۆ خوا سەرکەوتوو بووم ئیتر من لەوکاتەوە نەگەڕامەوە بۆ کەرکوک تا ساڵی ٢٠٠٤ لە ئەوروپاوە کە چوومەوە بۆ کوردستان، لە دوای ئەوەی کە کەرکوکم بەجێ هێشت هیچ زانیاریەکم نییە کە چی ڕوویداوە و کێ بەرکوتووە.

لەو کاتەی خۆم فڕێدایە ناو کەلاوەکە قسەی کاک سەیوانم بیر کەوتەوە، لە زیندان فێری ئەوەی کردم کە خوام خۆشبوێت لەبەر خۆشەویستی خۆی داوای شتی لێبکەم، تەنانەت فێری کردم خوای پەروەردگارت لەبەر بەهەشتەکەی خۆشنەوێت، بەڵکو خوام لەبەر زاتی پیرۆزی خۆی خۆشبوێت کە الله یە، لەو کاتە پەیمانم دا بە خودا و وتم: خوایە نامەوێت بمپارێزی بەس داوات لێدەکەم ئەگەر مردم لێم خۆشبیت، تۆ لە دڵمدابا تەنها لێم خۆشبە ئەگەر مام و ژیام وەعد بێت کارێک ناکەم تۆ پێت ناخۆشبێت جارێکی تر من نابینیتەوە لەسەر کاری خراپە.

هەر لەوێدا تۆبەم کرد خۆم ئامادەکرد بۆ مردن، خوای پەروەردگار پاراستمی، لەو کاتەوە دڵنیابووم لەوەی کە خوای گەورە سپاردە زایە ناکات، بەڵام بە ڕاستگۆیانە داوام لێکرد، زۆر بە سادقانە داوام کرد بۆیە خودا پاراستمی.



## چیرۆکی حەوتەم
## (سەرەتای خواناسی و گیژاوی حیزبایەتی)

دوای ئەوەی بەغدادم بەجێهێشت و گەڕامەوە بۆ سلێمانی تا ئێستا نەمدیوەتەوە.

دوای گەڕامەوەم ویستم باسەکە و ڕووداوەکەی کە ڕوویدابوو بیکەم بە ڕاپۆرتێك و بەرزیبکەمەوە بۆ سەرووی خۆم لە ڕێگەی م.عەبدوڵلاوە، ئەو شەوەی کە نووسیم خستمە گیرفانی کراسەکەمەوە، لە ماڵی نەنکم نەخەوتم، بۆ بەیانی لە بیرم چوو لە گیرفانم دەریبێنم.

دایکم وتی: جلی پیست هەیە بۆت بشۆم؟

وتم: کراسەکەم پیسە، چونکە دایەگەورەم توانای نەبوو بەدەست بیشوات، ئەوەی کە لێرەدا نووسیومە لە شیوازی ڕووداني ڕووداواکە ئاواش بۆ دەزگای خۆمم نووسیبوو، دایکیشم جوان خوێندبویەوە ئیتر چاوی پڕببوو لە گریان کە من چەندە کاری ترسناکم کردووە.

دەست بەجێ هەستابوو تەلەفۆنی کردبوو بۆ چەند بەرپرسێک و چەند کەسایەتییەکی دیاری یەکێتی، تەلەفۆنی کردبوو بۆ کاک بەکری حاجی سەفەر خوا لێی خۆش بێت، کافەخانی خیزانی هەڵیگرتبوو خوا لەویش خۆشبێت، کاک بەکر لەوێنەبوو، دواتر تەلەفۆنی بۆ مام باخەوان کردبوو واتە کاسایەتی ناسراوی پێنجوێن حەمەی دەروێش حەمەساڵح، ئەویش دەست نەکەوتبوو دادە ئایشێ هەردووکیان بەڕەحمەت بن وتبویان کاکە




حەمە و خیزانی لە پێنجوێنن، ناچار تەلەفۆن دەکات بۆ کاک حامی حاجی غالی کە ئێستا بەرپرسی ناوەندی مەکتەبی کۆمەڵایەتی یەکێتیە و جەنابیان لە ژیاندایە، وەزعەکەی تێدەگەیەنێت بە گریان و بە تووڕەیی بە کاک حامید حاجی غالی دەڵێت: وەك باوکیم لەدەست چووە با کوڕەکەشم لە دەست نەچێت.

کاك حامید پیاوێکە لەوانەی کە زۆر دۆستی باوکم بووە و نزیك بوون لەیەکەوە ئێمەی وەك برازا تەماشا کردووە ئێستاش هەروایە.

ئەویش تەلەفۆن دەکات بۆ مامۆستا عوسمانی کانی پانکە و بۆ کاك عەبدوڵڵای حاجی سەعید کە من کاری ڕێکخستن نەکەم و دوورم خەنەوە.

لەدوای ئەوە یەکێتی وازیان لەمن هێنا، ئەوە ڕاستییە من دەیڵێم کە خەڵکی یەکێتی لە دڵسۆزی و وەفا و پیاوەتیان بۆ باوکم منیان دوورخستەوە لە خۆیان منیش دەڵێم ماڵتان ئاوابێت دنیایەك مەمنونتان بووم.

دیسانەوە ڕووم کردەوە هەمان مزگەوت کە بەسەرخۆشی ڕووم تێکردبوو، چوومەوە خزمەت ئەو پیاوە بەڕێزانەی پێشتر و هاتنەوە بەرەو ڕووم ئەم جارە هەر وەك موسوڵمانێك، بەلام ئەم جارە نەیان هێشت بچمە دەرەوە بەتەواوەتی ئولفەتیان دامێ و منیش دڵم لایان بوو بەتایبەت مامۆستا سەلاح ستار کە زۆر شتی فێری من کرد خوا پاداشتی بداتەوە لە خۆشیاندا هەموو شەوێك دەچووم بۆ مزگەوت.

ئەودەمە نێوانی بزوتنەوە و یەکێتیش باش ببوو مزگەوتەکان دەرس و دەوریان تێدا دانرابوو و مزگەوتی جیهادیش هەبوو، هەموو ڕۆژێك



دەڕۆیشتم بۆ مزگەوت فێری قورئان خوێندن و فێری ڕەوشت و فێری ڕۆشنبیری ئیسلامی و بیروباوڕی ئیسلام و ژیانی پێغەمبەر و ژیانی هاوەڵان دەبووم، بەردەوام بووم دەقیقەیەکم بەفیڕۆنەئەدا، چونکە لەناو تاریکییەوە دەرچووم ڕووناکیم دۆزییەوە، ئەوەی تاریکی نەبینێت چێژی ڕووناکی نازانێت.

هەموو شەوێك دەرس هەبوو، بیرمە شەوانی شەممە م.تاریق ژیانی پێغەمبەرانی دەوته وە، یەکشەممە کاک ئاوات ژیانی هاوەڵانی پێشکەش دەکرد، دوشەممان کاک سەڵاح ستار بیروباوڕی ئیسلامی هەبوو، سیشەممان مامۆستا عەسمان دەرسی تەجویدی هەبوو، چوارشەممان مامۆستا حەسەنی حاجی سابیر فیقهی ئیسلامی ئەوتەوە، پێنج شەممان کاک ئەنوەر علوم حەدیثی ئەوتەوە، جومعان کاک سەڵاح ستار بوو دەرسی عامی هەبوو لە مزگەوتەکانی تریشەوە خەڵك دەهات، باسی بەنی ئیسرائیلی دەکرد.

سوبحان للە ئەم مزگەوتە زانکۆیەکی پەروەردەیی بوو، بیرمە نەیان دەهێشت مامۆستایەکی تر دەرس بڵێتەوە ئەویش کاک ئەنوەری حاجی فەتاح بوو من مەجالێکیشم درووست کردبوو دەچووم بۆلای ئەو دەرسم دەخوێند، نەمدەزانی بۆچی ناهێڵن، وامدەزانی زیرەك نییە بەس دوایی بۆم دەرکەوت مەسەلەکە حیزبایەتییە جەماعەتی نەهزە ڕێگەیان نەئەدا یەکرتوو دەرس بڵێتەوە، چونکە یەگرتووەکان نەیاندەهێشت لە مزگەوتاکانی تر نەهزەکان دەرس بڵێنەوە ئیتر شەڕە دەرس بوو، بەڵام سوودی بۆمن هەبوو، واتە هەموو هەفتەکە دەرس هەبوو، من دەڕۆیشتم بۆلای ئەو کاک ئەنوەرەش دەرسی ئیزافیم دەخوێند.






تومەس ئەوانەی کە دەرس دەڵێنەوە هەموویان نەهزەکان بوون نەیان دەهێشت نە حەرەکە نە یەکرتوو دەرس بڵێنەوە لە مزگەوتی شێخ عوسمانی سێرێ بێجگە سۆفی و نەهزە.

لە مزگەتی حەمەی حاجی ڕەشید نەهزەکان بۆیان نەبوو دەرس بڵێنەوە، بێجگە لە یەکرتوو_ حەرەکە.

لە هەوارەبەرزە حەرەکە و نەهزە بۆیان هەبوو یەکرتوو بۆی نەبوو، لە مزگەوتەکەی مامۆستا شەماڵ موفتی (خوای گەورە لێی خۆشبێ) تەنها یەکرتوو بۆی هەبوو.

ئیتر حیزبایەتییەکی بێتام ئەو هەموو زانست و زانیاریانە دەچوونە ژێری هەژمونی حیزبایەتی.

لەدوای ئەوەی ڕۆژ بە ڕۆژ خۆشەویستیم بۆ ئیسلام زیاتر دەبوو ڕووناکی ئیسلام تاریکی دڵم و هەناومی ڕۆشن کردبوەوە، چونکە تامرۆڤ زۆر تینو نەبێت چێژی ئاو ناکات تا تینوێتیەکەی بشکێنێت.

منیش بۆخۆم دەمزانی پێشتر لە چ گێژاوێکدا بووم، سەرباری هەمووی ڕۆژ بە ڕۆژ جیهانبینی من دەگۆڕا، هەموو ڕۆژێك بەرفراوانتر دەبوو، دیدم بۆ گەردوون و ژیان و مرۆڤ و دەسەڵات والاتر دەبوو، لێرەوە هەستم کرد ژیان ئەو شانۆگەرییە هیچ و بێمانایە نییە کەمن پێشتر لێی تێگەیشتبووم، بەڵکو ژیان سێبەرێکە و منیش ڕێبوار، ئەونەدەم پێویستە تا لەم ژیانەوە دەچم بۆ دوونیای خولود.



ڕۆژانە وانەی ئایینیم دەخوێند، هەر مامۆستایەکم بدیبایە دەمووت ئەوە دەرسێکم پێناڵێیتەوە؟!!بۆنموونە بێجگە لە مزگەوتی شێخ عوسمانی سێرێ دەچووم بۆ مزگەوتەکانی تریش، پاشان بەڕۆژدا وانەیەکم لای مامۆستا مەلا ئەحمەدی بن تەبەق دەخوێند، ئەربەعینی نەوەویم دەخوێند لەگەڵ فەتحول قەریب، دەرسێکی ترم لای کاک سەباحی برای کاک سەڵاح هەبوو ئەویش تەفسیر بوو، وانەیەکی ترم لای مەلا حەمەومینی باخی هەبوو لە مزگەوتی کانی ئاسکان باسی عەقیدە، لە مزگەوتی حەمەی حاجی ڕەشید لای مامۆستا جەلال فەقێ مامۆستا موسا و مامۆستا ئیسماعیل بوو، هەموو جورجانی و زمانی عەرەبی و تێگەیشتن لە بانگەوازم دەخوێند، سەرباری هەمووی لەو بازاڕ و قەیسەرییە دا کە خۆم کارم تێدا دەکرد دووبرا کتێبخانەیەکیان دانا بەناوی کاک سەباحە سوور و کاک نەجات، خوا دای بەمن هەموو ڕۆژێك کتێبێك یان دوو کتێبم دەخوێندەوە، بێجگە لەوەی لە هەفتەیەك دا دەچوومە خزمەت مامۆستا شێخ ئەکرەم دەرسی تەسەوفم دەخوێند، کاک سەڵاح ستاریش دەرسی فەردی دانابوو بۆ من و دووبرای تر پێکەوە.

بەم شێوەیە بەردەوام بووم خوای گەورە زانست و زانیارییەکی باشی بەخشیە من و هەمووی فەزڵی خوای پەروەردگار بوو، پاشان ئەو مامۆستا بەڕێزانە، ئینجا لێرەوە من پاشخانێکی مەعریفی باشم بۆ دروست بوو، بەڵام زۆر سەرەتایی لە هەمان کات دا کرانەوە بە ڕووی ئەم زانستانە دا و وەرگرتنی بە ئاسانی.

خەریکی دینداری خۆم بووم و باکم نەبوو بە کەس، زۆر مورتاح بووم سبحان الله خوای گەورە ڕۆژ بە ڕۆژ پێشی دەخستم لە ڕووی سومعە و

پارە و هەموو ڕووەکانەوە بە تەواوەتی هەستمکرد ئیسلام مرۆڤ دروستدەکات، ئیسلام کارگەی دروستکردنی مرۆڤە، بۆیە سەر لەنوێ من دروست بوومەوە لە ڕووی کەسایەتییەوە. زۆر بەهێزتر نە بەبۆنەی باوکەوە نە بەبۆنەی خانەوادە و عەشیرەتەوە، بەڵکو لە هەمووی گەورەتر بە هۆکاری ئەم ئیسلامەوە پیاوی وا هاوڕێیەتی دەکردم کە ئەگەر جارانم بوایە یان دەبوو لە ماڵەکەیدا پێڵاوم ڕیز بکردایە یاخود چام بگێڕابوایە، بەڵام ئیسلام منی دروستکرد.

برایەکی پێنجوێنی هات بۆ لام ناوی کاک عەتا بوو وتی: بۆ نایەیت ببیت بە حەرەکە.

منیش وتم: جا ببم بە حەرەکە چی بکەم؟

کاک عەتا وتی: ئەو کات لای ئێمە دەرس دەخوێنیت و فێری جۆرەکانی چەکت دەکەین و هەندێك قسەی تر منیش بێ سێ و دوو وتم باشە.

ڕۆشتین بۆ مزگەوتی جیهاد و نوێژمان کرد و منیان برد بۆ مقەڕەکەیان بە کوڕێکیان ناساندم ناوی کاک یاسر بوو وتیان ئەوە کاك خەسرەوە دەیەوێت ببێت بە حەرەکە.

لەبیرمە کاك یاسر وتی: کاك خەسرەو لای کێ دەرس دەخوێنیت، هاتووچۆی کام مزگەوت دەکەی؟

وتم: لای کاك سەلاح ستار دەرس دەخوێنم و هاتوچۆی مزگەوتی شێخ عوسمانی سێرێ دەکەم.





کاك یاسر وتی: ببورە من وەرتناگرم لەبەر ئەوەی لەگەڵ کاك سەڵاح پەیمانمان بەستووە نە من قوتابی ئەو بەرم و نە ئەویش قوتابی من بەرێت.

منیش بەسەر سوورِمانەوە وتم: بۆ کوێی بەریت؟!

کاك یاسر وتی: بۆ ناو بزوتنەوە.

وتم: ئەی ئەوان خۆیان چین من وامزانیوە کاك سەڵاح بزوتنەوەیە؟

کاك یاسر وتی: نەوەڵڵا، برام ئەوان نەهزەن.

بۆ یەکەم جار بوو زانیم کاك سەڵاح نەهزەیە، بەڵام من پێشتر ناوی نەهزەم بیستبوو.

شەو گەڕامەوە بۆ لای کاك سەڵاح و باسەکەم بۆ گێڕایەوە کە من چووم بۆ ئەوەی ببم بە بزوتنەوە وەریان نەگرتووم و باسەکەم بۆ کرد هۆکار چی بووە؟

ئەویش بە دوور و درێژی باسی ئەم ڕێکخراوەی خۆیانی کرد، بەڵام من نەچوو بە مێشکم دا هەر بزوتنەوەم خۆش دەویست، بە پێچەوانەی جارانەوە چەندە ڕقم لێیان بوو ئێستا لە خۆوە چوونەتە دڵم بزوتنەوە خۆشەویستە.

قەناعەتم بە نەهزەکان نەکرد بۆ ماوەیەکی تر کاك عەتام بینییەوەوتم: کاکە من هەردەبم بە بزوتنەوە.



لەم کەین و بەینی بزوتنەوە و نەهزەییە دا، نەهزەکان بۆ منیان تێچاندبوو لای بزوتنەوەکان کە گوایە من وەرنەگرن، چونکە من جاسوسی یەکێتیم، چۆنیش زانیم ئەم قسەیە نەهزەکان کردویانە، شێخ ئومێد پێی وتم چونکە ناسیاومان بوو، خەڵکی سەیدسادق بوو لە هێزی سلێمانی بوو، ئەوە هەڵدەگرم بۆ قیامەت.

قسەکەش هیچ نەبوو تەنها نەهزەکان ئەم قسەیان بۆیە درووستکرد بۆ ئەوەی بزوتنەوەی ئیسلامی من وەرنەگرێت و بە نەهزەیی بمێنمەوە.

کە ئەم حاڵەتە ڕووی دا بۆ ماوەی دوو مانگ یان سێ مانگێك دەبوو ببووم بە نەهزە، نەنکم پێی زانیم، هەموو جارێك دەیووت بە باپیرم یادی بەخێر بێت، دەیوت: حەمە چی بکەین خەسرەو بووە بە (نازە).

جارێکیان بە خۆمی وت: ڕۆڵە بیستوومە بوویت بە نازە_ ئیتر سبحان الله لەو نازەیەوە و ئەو نەهزەیەم لەبەر چاوکەوت، پێوەری نەهزە بوون چۆن بوو، ئەگەر دژی حەرەکە و یەککرتوو بویتایە ئەوە موسوڵمانی باش بوویت.

چوومەوە بۆلای شێخ ئومێد و کاك عەتا وتم: کاکە من سەروگوێلاك و مەکینەم بە نەهزە ناخوات من هەر حەرەکەم، من ئیشم پێتان نییە ئەگەر ئێوە ئیشتان بە من بوو من بە نان و پیاز و سیلاحی خۆم لە خزمەتدام.

کاك شوان (خوای گەورە بە شەهید قبوڵی بکات) بەرپرسی هێزی سلێمانی کە ئەم قسەیەی منی بیست بوو ناردبووی بەشوێنم دا، لە بیرم نەماوە لە ڕێگای کاك شێخ ئومێد بوو یان کاك هەڵکەوتی ئیدارە بوو.

کاك شوان زۆر خۆشحاڵی خۆی دەربڕی و بە کاك یاسری وتبوو کاك یاسریش بە د.کەمیلی وتبوو ئێستا دکتۆرە لە سلێمانی، ئیتر بووم بە حەرەکە.

خەریکی خوێندنەوە و کاری ڕۆژانەی خۆم بووم، سوپاس بۆ خوا زۆر دەوڵەمەند بووم ئیتر پێنخوێنییەکان کە منیان ناسی و سومعەمیان بە دڵ بوو لەگەڵ چەند کەسێک دا چوومە جاددەی کاوە لەوێ دوکانم هەبوو لەگەڵ چەند کەسێکی ناسیاوی پێنجوێنی بووم بە شەریك و خەریکی کەسابەت بووم.

سەرەتای بڵاو بوونەوەی ئەم قسە و دەنگۆی من بە یەکێتی لەم نەهزانەوە درووست بوو، هەر بۆ زانیاری و ڕایگشتی، لەم دواییانەش دا جارێکی تر درووستیان کردەوە وابزانم تا ئێستاش هەر بەردەوامە گوایە من سەر بەیەکێتیم، منیش باکم نییە چونکە سوپاس بۆ خوای پەروەردگار ئیشم بە هیچ حیزبێك و بە هیچ کەسێك نییە تەنها بە خوا نەبێت.

ئەوەی کە ڕقی لێمە لە ناو ئیسلامییەکان دەڵێت جەلالییە و یەکێتیە یان پارتییە، تەبعەن یەکێتییەکانیش و پارتییەکان دەڵێن پیاوی مەلا کرێکارە یان ئیرهابییە، تەبعەن هەردووکیان قسەی بی مەعنا و هێچ و پوچە، چونکە بیروباوڕم ڕێگام پێنادات کە کاری حیزبی لەگەڵ عەلمانی بکەم، وە پاشان ئەوەندە سوکیش نیم خەڵك بە ئاغا بزانم ببم بە پیاوی.

ڕۆژانێك بوو کە من، مامۆستا کرێکارم بە مەزلوم زانیوە من هاوکاریم کردووە ڕۆژێك لە ڕۆژان ئیشم بە مامۆستا کرێکار نەبووە، هەر ئەو ئیشی




بەمن بووە، ان شاءالله لە تەوقیتێکی نزیک دا باسی ئەو ڕووداوانەش دەکەم واتا لە ساڵی ٢٠٠٨ وە باسی دەکەم تا ساڵی ٢٠١٦.

لا پاش مردنی کاك شوان بەڕەحمەت بێت من دابڕام بۆ ماوەیەك لە هێزی سلێمانی و لە ڕێگەی برایەکەوە بە ناوی مامۆستا عیسا پەیوەندیم پێوەکرا بۆ پەیوەندی خوێندکارانی ئیسلامی کوردستان، ئەو ماوەیە چالاکیەکانم لەوێ دەکرد، بەردەوام لەگەڵ هێزی سلێمانیش کاك یوسف و دوای ئەویش کاك مەڕوان هەر بەردەوام بووم.

لە پەیوەندی خوێنکاران و لاوانی ئیسلامی کوردستان کوڕێکی سوری جوانخاسم ناسی بەناوی فەرهەنگی نامۆ، لە ڕێگەی مامۆستا عیسا و ئەو برایانەی ناو پەیوەندی، ئەوکات مقەرەکەمان لای مەعرەز جەلال بوو لە فولکەی ئاسکەکان.

ڕۆژێکیان من دەرسم دەخوێند تەلەبەیەك هات بە قاتێك کەتافییەوە لە تەنیشت منەوە دانیشت و وتی: دەرگای مقەڕم دانەخستووە.

لەم دوایەدا بۆم دەرکەوت کە ئەو برایە کاك بڵند غەریبی سەرنووسەری ڕێگا بووە، بەس تەنها من و کاك دکتۆر ڕێبوار کۆساری و پاشان مامۆستا عیسا و کوڕێکی تر بە ناوی کاك سەنگەر و یەکێکی تریشمان لەگەڵ بوو برای کاك عەتا پێنجوێنی بوو بە ناوی کاك سەلاحەدین، مامۆستا عیسا توڕەبوو وتی: چەند جارم وتوە لە دوای خۆتان دەرگاکە داخەن، بەهەرحاڵ ویستی بڕواتەوە، م.عیسا وتی: دەچم دایدەخەم، شتێکی پیویست بوو بیهێنێت، لەو ماوەیە کە ڕۆیشت من و



نامۆ تەعاروفمان کرد وتم: ئەوەچییە ئەڵێی لە رەبایەوە هاتووی تۆ لە قوتابیان و لاوانی، ئەو جلانە چییە لەبەرتا؟

بە پێکەنین و سوبعەتەوە وتی: وەڵلا برا لە ڕەبایەوە هاتووم لە سەرەوە واتا لە مزگەوتی جیهاد پاسەوانم.

ئەو ڕۆژە پیکەوە دەرسمان خوێند و هاتینە دەرەوە بە پێ گەڕاین تا لای حەسیب ساڵح ڕۆیشتین کە ئێستا پێی دەوترێ سلێمانی پاڵاس، تەنها تەعاروف بوو، دوای ئەوە لەگەڵ فەرهەنگ نامۆ خوای گەورە بە شەهید وەری گرتبێت برایەتی و هاوڕێیەتیمان خۆشبوو.

من و سەرهەنگ و فەرهەنگ گۆڤارێکمان دەرکرد ٥٠ لاپەڕەیی بەناوی گۆڤاری ژیار،

بەڵام سەر بە پەیوەندی بوو، زیاتر نزیك بووینەوە لەیەك و پڕۆژەی ڕۆشنبیری زۆرمان دامەزراند لەوانە بۆ یەکەمجار من و نامۆ سمیناری دوو قۆڵیمان گرت بە جەولە قسەمان دەکرد.

نامۆ بەرەحمەت بیت زۆر لاسای مامۆستا کرێکاری دەکردەوە تەنانەت دەنگی کتومت وەك مامۆستا کرێکار بوو، منیش زۆرم پیناخۆش بوو هەموو جارێك دەمووت برا دەنگت با وەك خۆی بێت و وەك خۆت قسە بکە، کە ماددەم مامۆستا کرێکار هەیە ئیتر بەسە من پێم عەیبە خەڵك لاسایی خەڵکی تر بکاتەوە، ئەگەر خۆت توانات هەبێت بۆ توانای خۆت دەرناخەیت، چونکە بەراستی نامۆ بلیمەت بوو حەزی زۆری بە ڕۆشنبیری و گەران و سەرچاوە هەبوو، هەرچەندە لەم دوایەشدا خەڵکێك بە خۆمیان دەووت کاك ماکوان تۆ وەك مامۆستا کرێکار قسە دەکەیت!




کە وایان پیدەوتم نامۆم بیر دەکەوتەوە، چونکە بەڕاستی پێش ئەوەی بە خزمەت مامۆستا کرێکاریش بگەم هەروا قسەم کردووە، جەنابی مامۆستا کرێکاریش هەروا گوێی لە من بووە، پێم خۆش نەبوو هەرگیز من وەك مامۆستا کرێکار بم، نەك لەبەر ئەوەی مامۆستا کەمە، نا بەڵکو من ناگەم بە مامۆستا و ناشمەوێت تەقلیدی کەس بکەم، حەز دەکەم وەك خۆم بم.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٧ بیرم لە دەرەوەی وڵات کردەوە کە بڕۆم بۆ ئەوڕوپا.

دیسانەوە وەزعی ماددیمان ویران ببوەوە بە حوکمی ٣١ی ئاب و دوای ئەوەش شەڕی یەکیتی و پارتی و نەبوونی کار و کەسابەت من بیرم لە ئەوڕوپا کردەوە.

ڕۆژێك لە دوکان دانیشتبووم پیاوێك خۆی کرد بە دوکان دا من و شەریکەکەم دانیشتبووین، بە ئێرانی وتی سڵاو.

وتم: سەرچاو فەرموو!

کەسە ئێرانییەکە وتی: من دوکانم هەیە لە شاری مەریوان، مێزی تەلەفیزیۆن دەفرۆشم دەتانەوێت بۆتان بنێرم بۆ سلێمنای؟.

بەخێرهاتنم کرد و لەبەری هەستام و چام بۆ بانگکرد تەعاروفم لەگەڵ کرد بەهەرحاڵ ناوی کاك عەبدوڵای پەناهی بوو.



پرسیارم لێکرد له چۆنیەتی و نرخەکەی، وەك ئەو باسی دەکرد تاڕادەیەك ئەقڵی منیش دەیگرت، خولقم کرد کە بچینەوە بۆ ماڵی خۆمان.

کاك عەبدوڵڵا وتی: لێرە لەماڵی ناسیاومانین.

بڕیار بوو کە میزەکانم بۆ بنێرێت بە پیلەوەردا.

پێش ئەوەی کاك عەبدوڵڵا بڕوات، کاك فاروقی شەریکم وتی: من پیم باشە خۆت بچیت بیبینیت لە شاری مەریوان و ئەگەر بەدڵت نەبوو با نەیەتە ئێرە و ببێتە ماڵ بەسەرمانەوە.

قسەکەی کاك فاروقی شەریکم مەعقەل بوو، بۆیە ڕووم کردە کاك عەبدوڵڵا و عەرزم کرد ئەی ئەگەر خۆم بێم بۆ مەریوان پێت چۆنە؟

کاك عەبدوڵڵا زۆری پێ باش بوو، وتی: کارێکی فرە خاس دەکەیت.

بڕیارم دا لەگەڵیدا بچم بۆ مەریوان.

هەڵسا بڕوات، بۆ بەیانی کە هاتنەوە بڕیار وابوو من بڕۆم، بەڵام شەو بیرم کردەوە خۆم بەتەنها لەگەڵی دا نەڕۆم، چونکە نەمدەناسی!

ئەو ڕۆیشت و ئەدرێزی ماڵ و دوکانیانم وەرگرت لە مەریوان، دوای چەند ڕۆژێك دەرچووم منیش گەیشتمە مەریوان لە گوزەری هەورامیەکانەوە تەلەفۆنم بۆ کرد ٣ دەقەی پێ نەچوو هاتە بەردەمم و شەو چووینەوە بۆ ماڵی کاك عەبدوڵڵا و نەیهێشت بچمە هیچ جێگایەکی تر، هەرچەندە من کەسوکارم زۆرە لە مەریوان، بەڵام بەوپێیەی کە بۆلای





ئەو هاتووم نەیهێشت بچمە هیچ ماڵێك هەڵبەت بۆ نانخواردن نەك مانەوەی شەو.

لەکاتی قسەکردن دا تەعاروفمان کرد لەگەڵ ماڵ و منداڵەکەیدا، لەپڕ کچێکی جوان خۆی کرد بە ژووردا و کاك عەبدوڵلا هەڵسا لە بەری و باوەشی پیاکرد، منیش لەتاو جوانییەکەی سەرم بۆ دانەخرا، نەمزانی کێیە دەنا منیش لەبەری هەڵدەستام ئەوەندە جوان بوو.

خوایە دەمگووت ئەو کچەم دیوە، دوایی بۆم دەرکەوت لە فلیم دا شێوەی ئەم دەموچاوەم دیوە ئەویش فلیمێکی ئەمیر ئەرسەلانی نامدار بوو بە فارسی بینیبووم، باڵا بەرز شەدەلار، چاو ڕەش هەموو پێناسەیەکی جوانی لە خۆیدا کۆکردبوەوە، منیش بە دیاریەوە حەپەسا بووم دایکی هات ئەویش باوەشی پیادا کرد.

کاك عەبدوڵلا تەنها یەك کوڕی هەبوو ئەویش لە زیندانی ئێران بوو.

خەریك بوو منیش هەڵسم و باوەشی پێدا بکەم بڵێم یاخوا بەخێر بێیتەوە، بۆم دەرکەوت ناوی ئێرانە، چونکە باوکی وتی ئێران کچم کەی گەیشتیتەوە.

ئێران: ئێستا بابە.

بۆم دەرکەوت لە دانشگایە لە ئەسفەهان، واتا زانکۆی ئەسفەهان منیش خۆم پێنەگیرا و کردم بە قسەی خۆش بۆ ئەوەی سەرنجی ڕاکێشم، وتم ناوت ئێرانە و خەڵکی ئێرانیت و لە ئێرانیش دەخوێنیت؟



بە پێکەنینەوە وتی: بەڵێ.

وتم: دیارە هەرشوو بە ئێرانیش دەکەیت؟

ئێران: شەرت نییە، واتا مەرج نییە.

وتم: بەخوا نیوەی ئیشەکەم ئاسان بوو

دوای نانخواردن زوو هەڵسام زانیم ئەو خانەوادەیە خۆشحاڵن بە هاتنەوەی ئێران، هەرچەندە لە ڕاستیش دا منیش هەر خۆشحاڵ بووم دەبوو هەڵسم.

ئیتر شەو و ڕۆژ و ساتەکانم هەمووی ببوو بە ئێران.

## چیرۆکی هەشتەم
## (عاشق بوون بە ئێران و عیشقی بە جێماو)

لە دوای ئەوەی شەوەکەی لە ماڵی کاك عەبدوڵڵا پەناهی هەڵسام و چوومەوە بۆ ماڵی خزممان لە شاری مەریوان، بەیانی چوومەوە بۆ گوزەری هەورامییەکان بەرەو دوکانی کاك عەبدوڵڵا، تەماشای مێزەکانم کرد بە دڵم بوو، بۆ ئەوەی بمێنمەوە لە مەریوان بیانوم گرت.

وتم: کاك عەبدوڵڵا ئەم مێزانە گرانن خزمەکانم بۆیان باسکردووم لە تاران زۆر هەرزانتر دەکەوێت لەوەی جەنابت باسی دەکەیت.

کاك عەبدوڵڵا: ڕاستە وایە، بەڵام خۆ دەبێت منیش سودێکی لێبکەم و قازانجی لێبکەم.

وتم: کاك عەبدوڵڵا بۆ نایەیت ببیتە شەریك لەم دوکانە دا و لە سلێمانی و لە تارانیش.

کاك عەبدوڵڵا: چۆن؟!تێناگەم.

وتم: تۆ برۆ بۆ تاران مێز بێنە بە کۆ هەرزانتر دەکەوێت، منیش لێرە لە دوکان دەبم نیوەی پارەت ئەدەمێ.





ئەوەندەی بۆمان برایە سلیمانی و هەولێر و دهۆك دەیفرۆشین و دوایی ئەوەی نەفرۆشرا لە مەریوان ساغی دەکەینەوە، ئەگەر توانیمان کارەکەمان گەورەتر دەکەین.

کاك عەبدوڵلا خەریك بوو لە خۆشیان باڵی دەگرت و وتی: ئەوە من ئامادەم، منیش بیرمە چەند ملیۆن تمەنێکم پێ بوو دامێ و بە (سوپاچەك)و وتم: برۆ بیهێنە لە تاران، بەڵام شتی جوانم بۆ بێنە زەوقی خەڵکی عێراقی بێت.

وەڵامم ناردەوە کە لە مەریوان دوکانم داناوە و بەتەما نەبن وا زوو بێمەوە، یەك دوو کەس بنێرن بۆ باشماخ ئەو مێزانە بەرنە سلێمانی و هەولێر.

مێز دوای یەك هەفتە گەیشتەوە مەریوان دامنەگرت یەکسەر بۆ باشماخ لەویوە بۆ سلێمانی، لە سلێمانیش ڕاستەوخۆ فرۆشتبوویان بە دەهۆکیەکان سوپاس بۆ خوا ٦٠ هەزار دیناری خێرکرد.

پارەم دابەشکرد بەسەر هەموو شەریکەکاندا لە سلێمانی و لە مەریوان، کاك عەبدوڵلام ناردەوە بۆ تاران.

دوو ئەوەندەی ترم ناردەوە ئەم جارە ناردم بۆ بەغداد.

داواکاری مێز زۆر بوو دوو ئەوەندەی تر خێری کرد سوپاس بۆ خوا.

ئیتر خەڵکی سلێمانیش بە کەسابەتەکەیان زانی زۆر خێری وای نەما، بەڵام هەر باش بوو، ئینجا دەهاتن بە کۆ لە خۆمیان دەکڕی لە مەریوان،



بازرگانەکانی سلێمانی ئەوەندە سەیر بوون لە منیان نەدەکڕی چونکە وەك خەڵکی سلێمانی قسەم دەکرد، کاك عەبدوڵلا پێی دەفرۆشتن ئەو بە مەریوانی قسەی دەکرد بە سێ قاتی نرخی من کەچی لەویان دەکڕی لەمنیان نەدەکڕی.

ئەو ماوەیەی کە مامەوە ئاشنایەتی تەواومان پەیدا کرد لەگەڵ مەریوان و مەریوانییەکان و ماڵی کاك عەبدوڵلا دا، ماوەی ٨ مانگ لە مەریوان دوکانم هەبوو دوو جار چوومەوە بۆ سلێمانی.

لە مزگەوتەکانی ئەوێ دا بەدوای زانست دا دەگەڕام بیستم کە تەنها فەقێیەتی لە کانی سانان، لە هەندێك جێگا زانست دەخویندرێت، چووم ماوەیەك بۆ کانی سانان و لە خزمەتی مامۆستا کانی سانانی بووم، ماوەی چەند هەفتەیەك لە خزمەتی بووم، بە هۆکاری ئیش و کار نەمتوانی بمێنمەوە، ماڵی ئاوابێت و دەرەجەی عالی بێت بەمنی ئەوت تۆ وەهابیت، سیقەی پیم نەبوو ئیتر گەڕامەوە بۆ مەریوان.

مزگەوتەکانی مەریوان لە جیاتی تەفسیری قورئان شەرحی شیعرەکانی قانعیان دەکرد، مەلاکانیان زۆر نەخوێندەوار بوون زانستیان لانەبوو هەڵبەت بە گشتی ناڵێم، چونکە زانای زۆر پایە بەرزیشی تێدابوو، بەلام دەستی من نەدەکەوت لە دێهاتەکاندا بوون و لە ترسی ئێران خۆیان دەرنەدەخست.

ڕۆژێك لە بازاڕ دا دەگەڕام لە شاری مەریوان لە جێگایەك پێی دەوترا داروخانە، (ئێرانم) بینی لەگەڵ چەند کچێکی هاوڕێی تریدا، خەریك بوو بڕۆم بەلایاندا، دوای لە دڵی خۆمدا وتم: بابە خۆ تۆ لای خۆی موسڵمانی




عەیب ناکەیت باوکی شەریکتە و هیچ نەبێت لەماڵەکەیان دا نانێکت خواردووە.

ئینجا تۆپەڵێك ڕیش بەملاولای ڕوومەتمەوە بوو ژێر چەناگەشم کەمێکی هەر پێوە بوو شەرمم لە ڕیشە تەنکەکەی خۆم کرد.

گوێم پێ نەدا و ڕۆیشتم خۆم هەڵەکرد.

کەمێك ڕۆیشتم، و لە دواوە یەکێك دەڵێت:

ئاغای خوسرەوی، ئاغای خوسرەوی، ئاوڕم دایەوە تەماشا دەکەم (ئێرانە)!وتم: فەرموو خانوم دەنگوباستان کەسوکاری مەحتەرەم هەموو باشن؟

ئێران: زۆر مەمنونەم ئاغا خوسرەو تو باشی؟

بفەرموو لە خزمەتدم، (ئێران خانوم) (کە دەیووت ئاغا خوسرە و ئەوەندە بەدەمی خۆش بوو خەریك بوو بڵێم توخوا سێ چوار جاری تر بڵێ خوسرەو، هەر بەمنیان وتوە خەسرەو رقم لە ناوەکەم بووە، نەمزانیبوو ناوەکەم ئەوەندە خۆشە بە دەمی ئێران).

ئێران: وڵڵا هیچ هەر حەزمکرد بێم بۆ لات لەگەڵ کۆمەڵێك هاوڕێم بووم، وتم دەچم بۆلای ئەودۆستەم ئاغا خوسرەو.

منیش کردم بە زمانی سلێمانی و وتم: بە سلێمانییانە (ئێران خانوم)، وەی قوربانت بم بفەرموو لە خزمەتم بڕۆین بابچین (لەبویەك)_ بخۆین (لەبوو شێلمەکەی لای خۆمانە، ئێرانی پێی دەڵێن لە بوو).



ئێران: باشە بابڕۆین.

باسی ئەصفەهان و دانشگام لێپرسی هەندێك موجامەلە، بەڵام خوا ئاگادارە هەرچی گەنجی ئەو مەریوانە بوو مۆرەی لێدەکردم، منیش خۆم بە پاشا دەزانی!

لە خۆمەوە دڵم زۆر خۆش بوو زۆر فشەکەرانەش دەڕۆشتم ئەودەمە هەڕەتی جوانی تەمەن و هەرزەکاریم بوو، گیرفانیشم پڕ بوو لە پارە.

لەگەڵ ئەوەش دا خواناسی و دینداری لە دڵمدا ڕووا بوو، بەڵام یاخوا مرۆڤ موحتاجی دەستی جوان نەکات، ماڵی (ئێرانیشم) ئاواکرد ئەوەندە جوان بوو منی سڕ کردبوو.

ئێران: ئاغا خوسرەو مەریوانت پیخۆشە؟

وتم: نەك مەریوان (ئێرانیشم) خۆش دەوێت!

(ئێران) دەستی کرد بە پێکەنین، جدەن (بەڕاستە).

بەدەم خۆمەوە هەر دەموت: تاوانی من نییە کە شێتم، نیگای چاوی ئێوە بوو نەیهێشت من ئاقڵ بم.

جارێکی تر دووبارەم کردەوە هەناسەم هەڵدەکێشا و بیری دالیا_م دەکەوتەوە و دەموت: تاوانی من نییە کە شێتم، نیگای چاوی ئێوە بوو نەیهێشت من ئاقڵ بم.

ئێران: خوسرەو ئەوە ئەڵێی چی؟





لە دڵی خۆم دا وتم بەخوا ئاغاکەش نەما پلەیەك بەرزتر بووینەوە، وتم: (ئێران) قسەیەك لە دڵم دایە حەزدەکەم پێتی بڵێم.

ئێران: دەزانم چییە!

وتم: چییە؟

ئێران: دەتەوێت بڵێیت با ئاشنای یەکتربین (بە مەریوانی واتا پەیوەندی درووست بکەین)

وتم: بەڵێ بە دڵنیاییەوە با ئاشنابین، من حەز بە دۆستایەتی تۆ دەکەم، بەلام دەمەوێت زۆر بە ڕاستگۆیانە پێت بڵێم ئەڵێن پیاو بەچاو ئاشق دەبێت ژنیش بە دڵ.

منیش دەڵێم هەر پیاوێك بە چاو عاشق بێت قوڕ دەکات بەسەر دڵی ژندا، هەرژنێکیش دڵی خستە بەردەستی پیاو توشی جەڵتەی دەکات.

ئەگەر پێچەوانەش بوویەوە پیاو بە دڵ ئاشق بوو، هەموو پێی دەڵێن (الفاتحە).

یان هیچ تێنەگەیشت یانیش خۆی لە من گێل کردوو پێدەکەنی، بەلام ئەوەندە جوان بوو خواخوام بوو نەیبەمەوە بۆ ماڵی خۆیان بۆ گەڕەکی دارسەیران.

گوێم لە بانگی شێوان بوو خوای گەورە کردی تۆزێك هۆشم هاتەوە بەبەر خۆمدا، بانگەکەم دەوتەوە، کەچی (ئێران) پێم پیدەکەنی، ویستم تووڕەببم لێی ئەوەندەش جوان بوو دڵم نەهات، ناچار وتم: گەر ئەوە چاو



و برۆت بێت ناز و عیشەوەت هەر ئەمە..الوداع ئەی زوهد تەقوا الفراق ئەی ئەقڵ و دین.

ئێران: ئێژی چی؟

وتم: ئێران گیان ئەڵێم گەر ئەوە چاو و برۆت، بێت ناز و عیشەوەت هەر ئەمە..الوداع ئەی زوهد تەقوا الفراق ئەی ئەقڵ و دین.

ئێران: دەم خۆش خوسرەو گیان.

ئیتر وام زانی بە ئاسمانەوە باڵم گرتووە.

تا نزیک ماڵی خۆیان بردمەوە، بەدەم گۆرانیەوە بە ڕێگا وە هاتمەوە بۆ ماڵی خزمەکانم و ئەو ئێوارەیە لە خۆشیدا گۆرانی کاکە ژیرم (د.حوسین)م دەوت و دەستم خستبووە گیرفانەکانم.

کە دەڵێت:

دڵنیابە بە مەرگیش بێت ئەم نیگارە جێناهێڵم دڵم بولبولی شەیدایە ئەم هەوارە جێناهێڵم....

گەیشتمەوە ماڵی خزمان و لەگەڵ کوڕێکی ئامۆزا زامدا دەستم کرد بە قسەکردن و وەزعەکەم بۆ باسکرد.

ئامۆزا زاکەم وتی: نیوەی کوڕی مەریوان خۆی داناوە بۆ ئەو کچە، ئێستا عێراقییەك بێت و ئاوا بەئاسدانی بیبات جا خۆ هەموو مەریوان شێت دەبن.






ئامۆژگاری ئەوەی کردم کە بچمە داوای و بیهێنم.

منیش فیکرەکەم پێباش بوو...

ماوەیەکی بەسەرداچوو ئێوارەیەکیان لە زرێبارەوە دەهاتمەوە بۆ مەریوان ویستم بچم (ئێران) ببینم، بەناوی ئەوەی بزانم کاك عەبدوڵڵا لەماڵەوەیە، کە چووم لە دەرگام دا خۆی هاتە دەرەوە.

وتم: ئەزیزی دڵ...بەیانی وەرە بۆ لای داروخانە لەوێ یەکتر دەبینین کارم پێتە.

ئێران: فرەخاسە، هەندێك قسەی خۆشم بۆ کرد و ئەویش هەندێ قسەی بۆ کردم.

وتم: بڵێ ئاغا خوسرەوە.

ئێران چەند جار وتی: ئاغا خوسرەو، ئیتر ڕۆییشتم.

هاتە لای داروخانە وا خۆی گۆڕیبوو...من پێم شەرم بوو لەگەڵی بگەڕێم، ئەترسام (هەیئەتی ئەمر بمعروف نەهی عەن مونکەن) لە مەریوان بمگرێت.

ئەوەنەی تر شێتی کردم کاتێك وتی: چیت گەرەکە ئاغا خوسرەو؟

وتم: دەمەوێت بتهێنم و بتکەمە بووکی ئامینە خانی دایکی ئاغا خوسرەو.

(ئێران) هەموو گیانی پێدەکەنی، ڕازی بوو.



بەلام وتی خۆ ئاساییە دانشگاه تەواو بکەم؟

وتم: حەزدەکەیت پرۆفیسۆریش بخوێنە.

بە خۆشحاڵیەوە هەڵساین و بەرەو ماڵ چووینەوە خۆشترین ڕۆژی ژیانمان بوو، باسی درووست کردنی ماڵ و منداڵ و ناونانی منداڵمان دەکرد، تا جیابوینەوە لە یەکتری ئەو ئێوارەیە.

شەو لەگەڵ ئامۆزایەکی باپیرم قسەم کرد بەناوی حاجی سەعید خوا لێی خۆشبێت کە بچێتە داوای بۆم، حاجی سەعید یەکێك بوو لە پیاوە ناودارەکانی مەریوان.

بۆ بەیانی ناردم بۆ لای کاك عەبدوڵلا و وتبووی من هیچ لاریم نییە و خوسرەو کوڕێکی باشە، بەڵام با پرس بە کچە و دایکی کچە بکەم.

منیش چوومەوە بۆ سلێمانی لەگەڵ باپیرم قسەم کرد و ئەو پێی خۆشبوو، بەڵام سبحان الله دایکم و نەنکم کەوتن بەقینا.

نەنکم ئەیوت ئەو کچەتیوە ڕشکنە بێنی بە قەپ ئەوچڕم، لە ترسی نەنکم هەر باسم نەکردەوە، دایکم ئەیووت کچ دەست ناکەوێت لە ئێران ژن دێنیت.

هەرچۆن بوو دایکم ڕازیکرد بە قسەی لووس و خۆ بردنە پێشەوە...باپیریشم وتی نەنکت دانێ بۆ خۆم.

گەڕامەوە بۆ مەریوان تا لەوێ کارەکان ڕێك بخەم و بنێرم بە شوێن کەسوکاردا و بێن بۆ مەریوان.

حاجی سەعید ناردبووی بە شوێنم دا وتی: وەرە بۆ ماڵمان، کە چووم بۆی باسکردم دایکی (ئێران) داوای خانویەك دەکات لە مەریوان بیکڕم و بیکەم بەناوی (ئێران)ەوە، ئەمە بۆمن ئەوەندە قورس نەبوو، خانوو لە ئێران زۆر گران نەبوو، بەڵام ئەیووت موالیدەکەی چەندە دەبێت ئەوەندە لیرەی شاهنشاهی بۆ بکەیت بە پشتوێنی ئاڵتوون، ئەمەیان زۆری دەویست و توانام بە سەریدا نەدەشکا، ١٣٦٠ لیرە دەکات کە موالیدەکەیەتی، واتا بە ساڵی زایینی ١٩٨٢ دەکات یان ١٩٨١ بەباشی بیرم نەماوە.

زۆر بێتاقەت بووم وتم: حاجی گیان ناتوانی قسەی تیا بکەیت؟

لە راستیدا حاجی سەعید ئەو بنەماڵەیەی خۆش نەدەویست، حەزی نەدەکرد خزمایەتیان لەگەڵ دا بکەین، چونکە کاتی خۆی ئەو بنەماڵەیە کچێکیان خواست بوو لە بنەماڵەی حاجی سەعید و کە پورزای بوو مێردەکەی کوشتبووی، حاجی سەعید و ئەوانیش کوشتبویانەوە لە جێگادا، ئیتر خوێن بە خوێن کۆتایی هاتببوو بەو کێشەیە.

حاجی سەعید وتی: نەوەڵڵا باوە گیان واز لەو کچە بێنە و لە بنەماڵەی خۆمان بیهێنە، کێت دەوێت بۆت داوا دەکەم چوار پێنجێکی بۆ هەڵدام وای دەزانی تەماتە و بامێ دەکڕم.

منیش نەچوو بە مێشکمدا خۆم هەڵسام چوومە لای کاك عەبدوڵڵا.

وتم: ١٣٦٠ لیرە بە هیچ کەس ناکرێت، بەڵام ئامادەم پشتوێنی ئاڵتەنی بۆ بکەم، با ئەویش بکاتە مارەییەکەی.

کاك عەبدوڵڵا وتی: زۆر باشە، من قسەی لەگەڵ دەکەم و رازی دەکەم.

پاش ماوەیەك کاك عەبدوڵڵا وتی ڕازیم کردووە هەوڵی خۆت بدە.

زۆر خۆشحاڵ بووم گەڕامەوە بۆ سلێمانی و خەریکی پارە کۆکردنەوە بووم بۆ ئەوەی ماڵێك لە مەریوان بکڕم و باپیریشم لە هەوڵی ئەوە دابوو هەندێك پارەی ترم بۆ دابین بکات بۆ پشتوێنەکە، دەیزانی زۆر حەز لە کچەکە دەکەم، منیش پاڵم لێدا بوەوە بە ئاسانی ئیشەکانم دەکرد، وتم جارێ کچەش لە یەکی زانکۆیە زۆری ماوە.

هاوڕێیەکی خۆم کە خۆم فێرم کردبوو بێتە ئێران و کەرستە و شتومەك بکڕێت کوڕی باشە، چووبووە داوای و دابویان بەو کە لەمن دەوڵەمەن تر بوو دیار بوو ئەو زووتر پارەکەی دابوو پارەی ئامادە بووە، وەك خۆیان دەڵێن ماشێنێکیشی کڕیبوو بۆ باوکی.

(ئێران)یش ڕازی ببوو شووی پێبکات!.

کە من چوومەوە بۆ مەریوان کاك عەبدوڵڵا قسەی لەگەڵ کردم وامزانی هاوکاریم دەکات، کەچی وتی ژن هێنان و شووکردن قیسمەت و نسیبە، حاجی سەعید_یشم لەگەڵ بوو قاقای خۆشی لێئەدا حاجی زوو زوو بە کاك عەبدوڵڵای ئەووت بەراستی وایە برا بەخوا وایە قیسمەت و نسیبە لایبە هەرباسیشی مەکە.

منیش زۆر بێزار بووم لە ژیانی خۆم، هیچم نەووت و هیچیشم پێ نەدەکرا، هەڵسام ئەوانم بە جێهێشت و چووم بۆ زرێبار، ئەگەر ترسی خوا لە دڵم دا نەبوایە ئەو کاتە خۆم دەخستە ناو زرێبار.

ئەم شیعرەم لەسەر دیواری داروخانەی مەریوان نووسی، لەگەڵ کوڕەکەی حاجی سەعید دا، ئیتر مەریوانم بەجێ هێشت بەرەو ڕەزایە کەوتمە ڕێ بۆ تورکیا هەر نەچوومەوە بۆ سلیمانیش.

ئەمەش دەقی شیعرەکەیە:...

ئەستێرەی فرمێسکەکانت هەڵبڕێژە باوەشی منەوە

ئەمەوێت ئەم شەو هەموو ئەڵماسەکان بۆ من بێت

با شەونم بیم بە سنگی گوڵەوە بمێنمەوە

کێ ناڵێت بەیانی زوو ڕۆژی جیابوونەوەیە

ئاوێنەی چاوەکانت لەبەردەمم دابنێ

مرۆڤ دەبێت لە تەنهاییدا هاودەم هاونەفەسی بێت.

بەرەو ڕەزایە ڕۆیشتم قاچاخچیم گرت بۆ تورکیا و گەیشتمە سەڵماس و لەوێشەوە قاچاخچی ترم دۆزیەوە بۆ وان و ئەنقەرە، لە ڕێگا گیرام لە بەتمان، سنورداش کرامەوە بۆ سلۆپی...

# چیرۆکی نۆیەم
## (سنورداش و گەڕانەوە بۆ ئەستەمبۆڵ...)

سنورداش کرامەوە بۆ سلۆپی بۆ لای برادەرانی پارتی، گرتیانم لە دەهۆك و زیندانی کرام بە بیانووی ئەوەی پاس ئامادده نییە هەفتەیەک لە زیندانی دەگۆك مامەوە، دوای ناردیانم بۆ هەولێر و بۆ ئاساییشی گشتی، من و ٥٦ کەسی تریان کردە حەمامێکەوە لە ئاساییشی سلیمانی.

ئەوەی خەڵکی هەولێر بوو دوای لێپێچینەوە ئازادکرا، ئەوەی ناسیاوی هەبوو ئازادکرا.

من و چەند کەسێك ماینەوە لە حەمامەکە دا، منیش هیچ پێناسێکم پێنەبوو.

یەکێك لە ئاساییشەکان هاتە ژوورەوە، ئەوەی پێی بڵێن ئەخڵاق و ڕەوشت کەرامەت نەیبوو بە جنێودانەوە.

وتی: با بەهادین بێتە دەرەوە، منیش قسەم نەکرد ئێ من ناوم خەسرەوە، هاواری کرد با (بەهادینی فەتەکۆپە) بێتە دەرەوە، منیش هەر قسەم نەکرد تەماشام کرد هەموو ئاساییشەکان تەماشای من دەکەن، بە جنێودان وتیان وەرە دەرەوە هەی پیاوە حیزەکەی سالار عەزیز!

وتم: کاکە لەگەڵ منتانە؟




وتیان بەڵێ تۆ ئەڵێین هەی جەلالی بێ ئەخلاقی وا و وا لێکرا و ئیتر جنێو بە خۆم و خوشك و دایک.

هەرچی وتم کاکە بەخوا من ناوم خەسرەوە ناوم بەهادین نییە، هیچ نەیخوارد.

پشتملیان گرتم تفەنگ لەسەر سەرم بوو بردیانم بۆ ژوورێك کوڕێکی موفەوەزی لێبوو.

موفەوەزەکە: ناوت بڵێ؟

وتم: خەسرەو عەبدوڵکەریم محەمەد.

موفەوەزەکە: هەتیو درۆ بکەی ئەم جارە یەك فیشەکت پێوە ئەنێم.

وتم: کاکە من خەڵکی پێنجوێنم، ناوم خەسرەوە کەسێکی پێنجوێنی بانگ بکە ئێوە هەڵەن لێتان تێکچووە.

موفەوەزەکە: ئاخر بەهادینی بێئەخلاق خەڵکی پێنجوێنی!ئەزانین خۆمان.

وتم: خوایە چۆن گیرم خواردوە بەدەست ئەمانەوە، هەر بڕوایان نەدەکرد، وابزانم بۆم هاتن بە چوار کەس بۆ لێدانم، منیش خۆم دانابوو بۆ کوشتن زانیم من بە بەهادین تێگەیشتوون دەموچاو مان وەك یەك بوو.



خوای گەورە کردی کەمالە ڕەشی کۆنە ڕەفیقم کە حەزی لە بەیان بوو خۆی کرد بە ژوورا، ئیتر وتم کاکە ئەو کوڕە من داناسێت لێی بپرسن من کێم؟

کەمالە ڕەش: دەیناسم ناوی خەسرەوە و کوڕی گەڕەکی خۆمانە، بەڵام جەلالییەکی پیسە، بە پێکەنینەوە.

لە راستیش دا نەیهێشت لێم بدەن، بەڵام هەر بێئەخلاقی نواند داوای قاپێ عارەقی لێکردم کە ببێتە کەفیلم.

وتم: پارەم پێنییە.

وتی: بەرتنادەم تا بۆم نەکڕیت.

وتم: عارەق حەڕامە بۆت ناکڕم.

کەچی هەر نەبوو بە کەفیلم.

بردیانمەوە بۆ زیندان، سوجدەی شوکرم برد بۆ خوا کە نەجاتم بوو لەدەستی ئەو جەلادانە.

دەمەو ئێوارە بوو لەپڕ ئاسایشێك هاتە حەمامەکەوە من هەموو گیانم عارەق بوو.

وتی: خەسرەو بێتە دەرەوە، قۆڵی گرتم بردمی بۆ ژووری جێگری بەڕێوەبەری ئاسایشی سلێمانی، خوێندمەوە ژوورەکە وا نوسرابوو.

چوومە ژوورەوە پیاوێکی قۆز هەڵسا لەبەرم.

وتی: خەسرەو من دەناسی؟

وتم: نەوەڵڵا قوربان ناتناسم.

وتی: من شێخ فازیلم، ئەزانم تۆ جەلالیت و باوکیشت هەر جەلالی بووە ئێستا ئەتبەین بۆ ئاسایشی ئاکرێ، بەڵام هەر پێم پێدەکەنی.

لە راستیدا منیش ئەژنۆم شکا.

تۆزێکی پێچوو وتی: برسیت نییە؟

منیش تف لە دەمما وشك بووە، یەك هەفتەیە نانم نەخواردووە لە نانە ڕەقە و شتی سادە بەولاوە، دوو ڕۆژیشە هیچم هەر نەخواردوە بێجگە لە ئاو، وتم نا سوپاس.

شێخ فازیل وتی: خۆ هەر ئەتبەین بۆ زیندانی ئاکرێ بۆ نان ناخۆیت؟

زیندانی ئاکرێ پیسترین زیندانی پارتیە، یەکێتیەکانیان تێدا زیندانی دەکرد، لای یەکێتیش زیندانی قەڵاچوالان هەبوو بۆ پارتیەکان.

چارم نەما وتم: باشە سوپاست دەکەم.

شێخ فازیل وتی: حەز لە چی دەکەیت بۆت بێنن؟

وتم: هەرچی بێت خوا نەیبڕێت.

شێخ فازیل_ ئاساییشێکی بانگ کرد و وتی: بیبەن بزانن چی دەخوات.



منیان برد بۆ جێگایەك هەر لە تەنیشت ئاسایشی سلێمانی لەسەر شەستییەکە، ناوی مەطعەم (لیره) بوو.

چووم تێر و پڕ هەمبەرگر و گەصم خوارد، ئاسایشەکەش تەماشای دەمی دەکردم منیش لە داخا نەمووت بخۆ، چونکە من خۆم دانابوو بۆ زیندانی ئاکرێ، دوای نان خواردن گەڕاندمیانەوە بۆ ناو ئاسایشی گشتی، ڕەوشەکەم بەلاوە سەیر بوو.

شێخ فازیل سواری سەیارەکەی خۆی کردم، لە دواوە دانیشتم پاسەوانێکی لەگەڵ بوو لە پێشەوە دانیشت، منیش بەتەنها لە دواوە و خۆشی سەیارەکەی لێدەخوڕی، سەیارەکەش (ئۆڵدزمۆبیل)ێکی سپی بوو، بە بیرما هات پەلاماریان بدەم، بەڵام هەرچی تەماشام دەکرد ڕێزگرتنە نەك زیندانیکردن، دانم بەخۆم داگرت و هیچم نەکرد.

بردمی بۆ گەڕەکێك لە هەولێر لەبەردەم دەرگای ماڵێك دا دایبەزاندم مامۆستا سەید ئەحمەد پێنجوێنی هاتە دەرەوە و بەخێرهاتنی کردین و وتی کاک خوسرەو گیان بەخێر بێیت بابچینە ژوورەوە.

منیش دەستیم ماچ کرد، چونکە وەك خاڵمان وایە جەنابی مامۆستا سەید ئەحمەد.

زۆر بەگەرمی خوڵکی کاك شێخ فازیلی کرد و وتی: نانی ئێوارە ئامادەیە فەرموو!شێخ فازیل هاتوو چووینە ژوورەوە تەماشادەکەم دایک دانیشتووە!بەڵام من تووشی شۆك بووم.

شێخ فازیل: كاكە خەسرەو، من لە شارۆچكەی سەیدسادق تەنزیمی باوكی تۆ بووم ئەو دەمە من كۆمەڵەی ڕەنجدەران بووم ئێستا پارتیم!هەر پێدەكەنی و ئەیووت چاكم ترساندی!

پاشان بەردەوام بوو فەرمووی: باوكی جەنابت منی دروستكرد منیش ڕێز و حورمەتم هەیە بۆ ئامینە خانی دایكت، ئەگەر ئازاریش درابێت لای ئێمە داوای لێبوردن دەكەین، خۆت دەزانی ڕەوشەكە چۆنە و پارتیش دوژمنی زۆرە.

منیش زۆر مەمنوونی كاك شێخ فازیل بووم جێگری بەڕیوەبەری ئاسایشی گشتی، ئەودەمە بەڕیوەبەری ئاسایشی گشتی ناوی فازیل مەلیح بوو.

ئەو شەوە لە خزمەت ماموستا سەید ئەحمەد دا بووین، بۆ بەیانی من و ئامینە خانی دایكم گەڕاینەوە بۆ سلێمانی.

ماوەی مانگێك لە سلێمانی مامەوە، دیسان لێمدایەوە بۆ توركیا، ئەمجارەش سنور داش كرامەوە، بەڵام لە ئیرانەوە لای پارتی نەبوو.

جارێكی تریش بڕیارم دا بچمەوە توركیا، لە كۆتایدا گەیشتمە ئەستەنبوڵ.

قاچاخچیەكان ناویان دانا و بەكر و عوسمان بوو، لە ڕێگا بوو بەشەڕم لەگەڵ دانەیەكیان دا كە جنێوی ئەدا بە خەڵك، پەلاماریم دا و وتم: ئەمجارە جنێو بدەی لێرەدا كەڕامەتت دەشكێنم، زۆرێكیش لە نەفەرەكان پشتی منیان گرتو قاچاخچیەكان قسەیان نەكرد!بە ئاسایی وەرمگرت

نەمزانی ئەمانە هەموو سەروبنی یەکترن وایان دانابوو کە من گەشتمە ئەستەنبوڵ لێمبدەن.

ئەو ئێوارەیە کە گەیشتینە ئەستەمبوڵ شەش قاچاخچیم لێکۆبوویەوە گەورەکەیان ناوی ئاریە سوور بوو.

ئاریە سوور، عوسە شەش پەنجە، دڵە شەرواڵ پیس، دانای عەبلی عەبان، بەکری سەعۆلە و یەکێکی تریش بوو نەمدەناسی.

کوڕێکی لێبوو ناوی کاك عوسمان بوو زۆر بەڕێز بوو ئەوانیشی دەناسی و منیشی دەناسی لە ڕێگادا نوێژم دەکرد هەستی دەکرد تەنەزوڵم نەدەکرد و خەریکی ماستاو کردنیش نەبووم، بۆیە ڕێزی لێدەگرتم لەوێ ئاگام لێبوو نەیهێشت هیچ کارێك بکەن، هات چپاندی بە گوێمدا وتی: ئەگەر جنێویشیان پیدای قسە مەکە ئەیانەوێت لێت بدەن.

بێجگە لەو شەش کەسە هەریەکە چەورەیەکی تریشی لەگەڵ بوو، منیش زانیم دەرەقەتی ئەم هەمووە نایەم شەڕی خۆترێن ناکەم، بەڵام سەری مارەکە ئاریە سوور بوو، لەوە پەست ببوو کە وتم نابم بە نەفەری تۆ نەفەری هیوای قوماشم، ڕقی لە هیوا بوو، هیواش پێنجوێنی بوو و کۆنە پێشمەرگە بوو لەگەڵ باوکم.

کە هاتن چوومە نزیك مەطبەخەکەوە چەقۆیەکم گرت بەدەستمەوە، چەقۆی شت پاکردن بوو، خۆم سەرقاڵ کرد بە شت چاکردن، ئەوانیش زانیان خۆم ئامادە کردووە.

وایان دانابوو کە شەو هاتنەوە بۆ خواردنەوە، ئەو کاتە لێم بدەن و کەرامەتم بشکێنن.

(ماڵی کاك عوسمان ئاوابێت) وتی: کاکە بەخوا تۆم خۆشدەوێت، بەڵام ئەمان ەکەرامەتت دەشکێنن یان دەبێت تەحەمول بکەیت یان دەبێت لێرە ڕاکەیت.

بەمنیان وتوە ئاگات لە خەسرەو بێ رانەکات شەو ئەیکەین بە مەزەی خۆمان، منیش بۆ خوا پێت دەڵێم ڕاکە.

زۆر مەمنونی بووم، تەنها کراسێک و پانتۆڵێکی کابۆم لەبەردابوو، هیچ پارەشم پێنەبوو، داوای ٥٠دۆلاریشم کردبوو بەناوی ئەو قاچاخچیانەوە بێت کە ئاریە سوورە، فریا نەکەوتم ئەو پارەیەم بەدەست بگات،

لە شوقەکە ڕامکردە دەرەوە نەمدەزانی بۆکوێ بچم، هیچ جێگایەك شارەزا نەبووم، ئەستەنبوڵ زیاتر کە ١٨ ملیۆن کەسە، یەکەم جارمە بێمە ئەستەنبوڵ مانگی نۆیە بە شەودا ئەستەنبوڵ زۆر ساردە.

گەرام زۆر گەڕام کوردم نەبینی، بەسەر ئەو جادانەدا گۆرانی مامڵی و حەسەن زیرەك چیم لەبەر بوو هەموویم وت، هەموو تورك تەماشای دەکردم یەك کوردم نەبینی، چوومە مزگەوت بۆ نوێژەکان بە عەرەبی قسەم دەکرد، یەك مەلا عەرەبی نەدەزانی.

شەو ساردە و یەك کراسم لەبەر دایە سەرمامە هەڵدەلەرزم، پارەم پێنییە و برسیمە کەس ناناسم، تورە بووم سوێندم خوارد دەچمەوە کوردستان تۆڵە لەو قاچاخچیانە دەکەمەوە.



ئاگر لە چاوم دەباری، بڕیارم دا خۆم تاسلیم بکەمەوە بە پۆلیسی ئەستەنبوڵ بۆ ئەوەی بگەڕێمەوە سلێمانی.

(ڕۆیشتم سەیارەیەکی پۆلیسم بینی و چوومە لای) وتم: بەن ئیراکیم، پاسۆپرت ماسپۆرت یۆك.

ئەوەندە فێر ببووم، کابرای پۆلیس هەر جوابیشی نەدامەوە!

منیش خۆم تورە کرد و ئەو ڕستە سەروگوێلاك شکاوەم دووبارە کردەوە، زانی هەڵدەلەرزم لەسەرماندا زۆر پیاو بوو پۆلیسەکە وتی: بڕۆ ناو سەیارەکە و دانیشە.

ئاگام لێبوو دەستی کرد بە جیهاز کردن بە تورکی و دای بەیەکدا و باسی منی دەکرد و عێراقی و پاسەپۆرت و لەم جۆرە قسانە، هەستم کرد مەزوعەکە منم.

ماوەی چارەکێك لە ناو سەیارەکە دا بووم ئەوەندەم نەزانی پۆلیسێکیان هات.

وتم: ئێستا دەمبات، بەلام یەك دنیا پسکیت و چۆرەك و سمیتی بۆ هێنام، خواردنێکیان هەیە وەك نان وایە خڕە کونجی پێوەیە پێی دەڵێن سمیت، ٨ ملیۆن لیرەی دامێ!ئەوکاتە ٨ ملیۆن لیرە زۆر بوو، هەر ١٠٠ دۆلار لە تورکیا ٣٣ یان ٣٦ ملیۆن لیرە بوو.

سمیت و بیسکیتەکەم وەرگرت و پارەکەم دایەوە، کە چی دوو ملیۆنیتری خستە سەری.





وتی: ئەوە ١٠ ملیۆن وەك بڵێیت ڕازیت؟!منیش بەلامەوە سەیر بوو، کە چی وتی: دابەزە بە ئینگلیزی، ئێمە پۆلیسی ترافیکین واتا مرور بوون.

وتم: ئەی ناتوانن بە پۆلیس بڵێن بمگرن و بمگەڕیننەوە بۆ عێراق؟

وتی: با تەلەفۆنم کردووە ئێستا دێن ئەت بەن.

خۆشحاڵ بووم بەس بۆ ئەوەی بگەڕێمەوە کوردستان و تۆڵە لەو قاچاخچیانە بکەمەوە.

سەیارەیەك هات بە لورەلور و منیان برد بۆ جێگایەك ناوی قەرەقول بوو کە چوومە ژوورەوە شتێکی زلی کەچەڵ دانیشتبوو، لە دەرەوە منیبینی وتی: سن پەکەکە؟ دەموچاوی لەوە دەچوو کە مانگا جویبێتی، ئەوەندە چرچ و لۆچ و ترسناك بوو، هەر زیرەم کرد کە وای وت!

وتم: ئەکمەك_ ئەکمەک واتا (نان)، ئەویش هەر دەیوت پەکەکە.

منیش دەموت: ئەکمەك.

موتەرجیمێکی کرمانجیان هێنا و وابزانم ١٥ بۆ ٢٠ کەس لەو ژوورە دا دانیشتبوون هەمووی دەرەجەدار و کەچەڵ سەیری منیان دەکرد.

منیش لە ناوەراستیان دا وەستابووم، ئینجا وەرە خەسرەو دڵت شەق نەبات و زیرەنەکەیت و پێشت بڵێن پەکەکە.

پرسیاریان کرد منیش بەراستگۆیی باسەکەم کرد ئەوەی ڕوویدابوو گێڕامەوە، سوێند بەخوا شوێنەکەم بزانیایە کوێیەو بچومایەتەوە سەری،



هەموو ئەو قاچاخچیانەم بەخۆمەوە سنورداش دەکردەوە بۆ تۆڵە سەندنەوە لێیان لە سلێمانی، ئەوەندە تورەبووم.

دوای کە وەزعەکەیان زانی چییە، ئەوەندەم زانی گەورەیەکیان هەڵسایە سەرپێ.

(لە دڵیخۆم دا) وتم: بەخوا ئەم سەگبابە بەدەستی خۆی تەعزیبم ئەدات پێم بڕوا ناکات.

کەچی دەستی کرد بە گیرفانیا دنیایەك پارەی دەرهێنا، ئەوانەشی دانیشتبوون هەموو دەستیان کرد بە گیرفانیاندا و پارەیان دەرهێنا.

وابزانم سەفتەیەك پارەیان دامێ، دوای بژاردم بۆم دەرکەوت ٨٠ ملیۆن لیرەیە.

پیاوە گەورەکە نامەیەکی بۆ نووسیم لەسەر وەرەقەیەک و دایە دەستم بە کرمانجەکەی وت بیبە بۆ ئەکسەرای.

کرمانجەکە بردمی تا تۆپقاپی و لەوێوە سواری پاسی ئەکسەرای کردم و بە سایاق پاسەکەی وتبوو بمباتە ئەکسەرای لای وەطن جاددە نزیك یابانچی شوعبە.

سایەق پاسەکە: لەم ڕێگایەوە بڕۆ ئەچیتە وەطن جاددە، ئەوە یابانچی شوعبەیە ئیتر ئەتبەنەوە بۆ عێراق.

نازانم بڕۆم یان نەڕۆم، بەڵام هەر تورەم گیرفانیشم پڕە لە پارە و بە ئەقڵی خۆم وامزانی ئەو نامەیە کە کابرا بۆی نووسیبووم، ئەدرەسە بەڵام




نیشانی هەرکەسم ئەدا دەستی دەکرد بە گیرفانیدا و تۆپەڵێك پارەی دەدامێ.

لەوانەیە لە ١٠ کەسم پرسیبێت نائومیدیان نەکردووم هەر یەك دوو ملیۆنیان ئەدامێ.

هەر کەسێکیشم ئەبینی پێم ئەوت: وەطن جاددە یابانجی شوعبە، ئیتر وردە وردە ناردیانم، ئەو کاغەزەشم نیشانی هەرکەس ئەدا لە ملیۆنێك لیرە کەمتریان نەئەدامێ!

نیوەی شەوە لە ئەسکەرای لە بەردەم میترۆکەدا دوو سەیارەی پۆلیسی لێبوو، چوومە لایان و وتم: بن عێراقی پاسۆپرت ماسۆپرت تۆك، وتیان نەچیتەوە بۆ عێراق سەدام ئێعدامت دەکات!.

ئەو شەوە لە ناو سەیارەی پۆلیسەکان دا خەوتم، ئەوانیش کە نامەکەیان بینی دەستیان کرد بە گیرفانیان دا و پارەیان دامێ، بەیانیش بەیەکەوە نانمان خوارد و دوایی بە سەیارەی خۆیان بردیانمە بەردەم یاباجی شوعبە.

چوومە ژوورەوە سڵاوم کرد، یەك کەس وڵامی نەدامەوە، تەماشای دوو گۆڵیان دەکرد دوای ١٠ دەقیقە یەکێکیان ڕەحمی جوڵا وتی: چیت دەوێت؟.

قەوانەکەم لێدایەوە بەن عێراقی پاسپۆرت یۆك، نامەکەم نیشان دا و وتی بیبەن بۆ سجن.



وتم: ئۆخەی گەیشتم بە ئاواتاکای خۆم.

کە چووم پڕ بوو لە کورد، ڕەفیقێکم بینی وتی: ئەوە بۆ گیراوی؟

وتم نە گیراوم خۆم هاتووم، ئەویش خەریك بوو شێت ببێت، وەزعەکەم بۆ گێڕایەوە.

وتی: ئەی بۆ نەچوویت بۆلای کاك هیوا لە بیوك چەکەمەچەیە کەمالی برازای لەوێیە.

وتم: جا من چوزانم.

زۆر ماندوو بووم چاوم چووە خەو، بانگیان کردم و وتیان: کەریم بابێت بۆ تەحقیق.

چووم، کوڕێکی کەرکوکی مەتەرجیمم بوو ئەویش خۆی سجن بوو.

مەحەقیقەکە: ببورە ئێمە ناتوانین بتگرین دەبێت تۆ لە قەرەقولەوە بنێر درێیت بۆ لای ئێمە و مەحکەمە بکرێیت، ئینجا ئێمە ئەتگرین و سنورداشت ئەکەینەوە، تکایە بچۆ دەرەوە!

منێش خۆم توڕەکرد و وتم: ناچمە دەرەوە دەبێت بمگرن و لەم قسانە، کوڕە کەرکوکیەکەش شێت ببو وتی: بۆ وادەکەیت بڕۆ دەرەوە.

وتم: کاکە کەس ناناسم؟!

وتی: ئەی هاوار ئەستەنبوڵ پڕە لە کورد، بڕۆ دەرەوە بەخوا تۆ شەنست هەیە.




گەڕامەوە بۆ سجنەکە وتم شتم بە جێهێشتووە باش بوو خێرا بە هاوڕێکەمم وت ڕەقەمەکەی هیوای قوماشم بدەرێ وەرمگرت و لە یابانجی شوعبە هاتمە دەروە.

لە دڵی خۆم دا وتم: خۆ من پارەم پێنەبوو ئیستا گیرفانم پرە لە پارە، کەس تەعەدای نەکردووە وا خۆم مشەوەش کردووە، بڕۆ بۆ بیوك چەکمەچە بۆ لای هیوای قوماش و تۆڵە لەبیرکە و بەرەو ئەوڕوپا بڕۆ.

هەر کە هاتمە دەرەوە قەمسەڵەیەکی گەرمم کڕی بەلام شاز، گۆرەوی تازە و پێڵاوی جوانم کڕی، پانتۆڵ و ملپێچ، خۆم نوێ کردەوە، هێشتا ١١٠ ملیۆن لیرەم پێبوو.

بیوك چەکمەجە ٤٥ دەقیقە لە ئەستەنبوڵ دوورە، شارێکی سەربەخۆ بوو وەك سەرچنار و سلێمانی.

گەیشتمە ئەوێ تەلەفۆنم کرد، کوردەکان هاتن بە دەممەوە چوومە ئەوێ و لەوێ مامەوە.

دەستم کرد بە کارکردن لە غەسلەکەی هیوای قوماش، بە خۆڕایی کارم دەکرد بەس بۆ ئەوەی شەوان جێگام بکەنەوە و بەیەکەوە بین، کاك هیواش هەقی منی کردەوە٥٠ دۆلارەکەشی بە شەق لیسەندبوونەوە پارەکەی بۆ هێنامەوە، بەلام من هیچیانم نەبینی لە قاچاخچیەکان، ڕۆژێکیان نەبێت یەکێکیانم بینی لەم شارەی خۆم لە نەرویج، تەماشام کرد لە مزگەوت هاتە دەرەوە نوێژی دەکرد.

وتم: تۆ عوسمان شەش پەنجەی؟



وتی: ئەوم، زانی تورەم.

وتی: ئێستا نوێژ دەکەم و حەجم کردووە و ماڵی خوشکێکم لێرەیە لە بەریتانیا بە سەردان هاتووم، ١٦ ساڵیش بەسەر وەزعەکە دا ڕۆشتبوو، ئیتر منیش هیچم نەداوە بەناوچاویدا ڕێزم گرت و ڕۆشتم وابزانم نەیناسیمەوە!.

بەردەوام کارم دەکرد بە خۆڕایی تا شارەزا بووم لە ئەستەنبوڵ، دوای چوومە سەمونخانەیەك و دەستم کرد بە کار لەوێ، هەر لەوێ ژوورێکیان دامێ و سەیارەیان دامێ سەمونم داباش دەکرد لەگەڵ کوڕێك دا ناوی ڕەفعەت ئابێ بوو، هاوکاری ئەوم دەکرد بەیەکەوە واتا ئەو وەستای من بوو.

ژوورێکی تریش لە تەنیشتمەوە بوو چەند کوڕێکی کرمانجی تێدابوو، ئەوانیش لە سەمونخانەکە کاریان دەکرد زۆر کوری چاك و دیندار بوون، نوێژ و شتمان هەر بە جەماعەت بوو، هەموویان خەڵکی دیار بەکر بوون، بەلام من بە تانها لە ژوورێك بووم، دیاربوو ئەوان برا و ئامۆزا و شتی وابوون بۆیە هەموویان بەیەکەوە بوون، منیش تەنها بووم جاروبار هەر بۆخۆشی دەچوومەوە بۆ غەسلەکە بۆ لای هاوڕێکانم، بەڵام جێگای من زۆرخۆشبوو لە ڕووی ئەمنیەوە زۆر باشتر بوو.

لەو بەریشمانەوە ژوور و نیوێکی لێبوو کۆمەڵێك کوردی تێدا دەژیان دەمزانی قاچاخچین، بەلام نەمدەناسین هەر وتم پرسیاریان دەکەم لەو کورانەی هاوڕێم، بەلام هەر لەبیرم دەچوو، هەر جارێك یەکتریمان بدیبایە

سڵاومان دەکرد لەیەکتری بەردەوام ئەو ژوورەش ٤ کەس بۆ ٥کەسم تێدا دەبینی، ناویشیانم دەزانی.

شەویکیان گوێم لە قیژەی ژن و کچێك بوو، بە کوردی هاواریان دەکرد بۆ خاتری خوا، بۆ خاتری پێغەمبەر شەرەفمان مەشکێنن.

خۆم پێنەگیرا چوومە دەرەوە و نزیك بوومەوە لە ژوورەکە گوێم لێبوو یەکێکیان ئەیووت هاوار مەکە با نەمانگرن زوو دایکەنە با نەجاتمان بێت!منیش هەر گوێم گرتبوو، کچەکە دەیوت ئاخر من کچم حەیام مەبەن، دایکیشی دەیووت چیتان دەوێت لە منی بکەن واز لەوبێنن، یەکێك لە کورەکان بە کچەکەی دەووت من لەدواوە لەگەڵت ڕادەبوێرم مەترسە.

هەمو گیانم سوور ببووەوە نەمدەزانی چیبکەم، دەمزانی ٤ بۆ ٥ کەسی لێیە، شەڕکردن لەگەڵیان هەروا ئاسان نییە.

چووم سەیدا حیلمی_م هەڵساند...برا گەورەکەیان ناوی حیلمی بوو کرمانجەکان، زۆر دیندار و خواناس بوون تا تێمگەیاند گیانم دەرچوو، هاتن بەدەممەوە ڕۆیشتین منیش بە چەقۆوە ئەوانیش بە دار و چەقۆوە لەگەڵم هاتن.

بەتوندی کیشام بە دەرگاکە دا بە سەیدا حیلمی_م وت: بە تورکی قسە بکە بابزانن تورکین و بڵێ پۆلیسین.

هاواری کرد (ئامنە قۆیم) جنێوی تورکەکان بوو..



وتی: پۆلیسین دەرگاکە بکەنەوە دەنا دەیشکێنین، وەڵا دەنگ نەما!منیش هەر ئەمدا لە دەرگاکە، کچ و ژنەکە کردیانەوە.

سوپاس بۆ خوا فریایان کەوتین.

ژنەکە ڕووت و قوت بوو، کچەکەش جلەکانی دڕابوو، باوەشی کرد بە من دا بەتانییەکی لەخۆ پێچابوو، هەر ئەیووت تەعدا تەعدا، وای زانی ئێمە تورکین.

منیش وتم: خوشکی من خەم مەخۆ ئاگام لێبوو هاتم تا تەعەداتان لێنەکەن، زانی کوردم دانەویەوە تا قۆنەرەکانم ماچ بکات نەمهێشت، بەڵام دەستمکرد بە گریان بۆیان زۆر خەفەتم خوارد.

ناردمنە ژوورەکەی خۆم و جلوبەرگەکانیان هێنا، ئەو خوێڕیە کوردانەی تریش لە پەنجەرەی حەمامەکەوە هەموویان ڕایان کردبوو کەسی لێنەمابوو.

گڕم بەردایە ژوورەکەیان، بۆ ئەوەی بیر نەکەنەوە بێنەوە.

زیاد لە ٢٠ وەرەقەشم لە گیرفانی یەکێکیاندا دۆزیەوە.

بە ژن و کچەکەم وت: نەیەنە دەرەوە بە هیچ شێوەیەك من ئەو ماڵە دەسوتێنم، خواردن لە سەلاجەکەدا هەیە بەیانیش دێمەوە بۆ لاتان نەیەنە دەرەوە تکایە.
لەوەی کە ڕابوورد، لەوەی کە شکا، لەوەی کە نەبوو، لەوەی کە ڕژا، خەفەت مەخۆن ژیان ئەگەر ئاسان بوایە بە گریان دەستی پێنەدەکرد.

# چیرۆکی دەیەم
## (من و یاسەمین)

ئەو ژوورەم سوتاند و بە سەیدا حیلمی_م وت: پەیوەندی بکات بە پۆلیسەوە، هەر خۆشی قسە لەگەڵ پۆلیس بکات و بە دووریان بخاتەوە لەو ژوورە کە منی لێبووم ئێستا ئافرەتەکانی تێدایە.

دوای سوتاندنی ژوورەکە منیش ڕۆشتم لە غەسلەکە مامەوە، هەڵکەوتە ڕەش ناسراو بە هەڵە دەبابە و شێخ ئەرسەلانی برای شێخ بورهان لەوێ بوون، زۆر کوڕی چاك بوون هاوڕێی خۆم بوون، بەڵام ئەوان دەیان خواردەوە.

ویستم بڕۆم، ئەرسەلان وتی: بەخوا لەبەر تۆ ناخۆمەوە ئەم شەو مەڕۆ لێرەبە.

منیش خواخوای خوڵکە گورگانەیەکمە، بۆیە خێرا وتم: باشە.

دەمەو ئێوارە بوو نانمان درووستکرد، خەریکی قسەی خۆش و نان خواردن بووین، یەکێك لەو کوڕانەم بینی کە لەو ژوورەدا دەژیا هات، کە مالی دەناسی.

هەربینیم ئەوەندە توڕە بووم هەموو گیانم بوو بە بوڕکان.





هات دانیشت کەسیان نەیاندەناسی بێجگە لە کەمال، کەمال ناساندی بە ئێمە، وتی: ئەوە کاك سیروانە ماڵەکەیان سوتاوە، ئەم شەو لای ئێمە دەبێت.

کە وای وت من شێت بووم.

چپاندم بە گوێی ئەرسەلان دا و وتم: ئەم شەو من ئەم هەتیوە دەکوژم.

ئەرسەلان وتی: بۆ؟!

هەموو وەزعەکەم بۆ گێڕایەوە، ئەرسەلان زۆر تورە بوو لە تاوان دا لێوی خۆی دەگەست.

منیش ڕووم کردە سیروان و وتم: ئەو ژوورە هی ئێوە بوو کە ئەم شەو دوو ئافرەتەکەی تێدا سوتا؟ ئەوە چی بوو؟

کە وام وت ڕەنگی تێك چوو.

سیروان: غاز تەقیوە پیایدا.

وتم: ئەو ناوە بووە بە پۆلیس و من نەموێراوە بمێنمەوە هاتووم بۆ ئێرە، کە وام وت یەکسەر هەڵسا و ڕۆیشت، هەرچەند کەمال وتی بمێنەوە، ئەمشەو لێرە بە، وتی: نا دەبێت بڕۆم.

وەزعیم باش تێك دا بەس خێری پێوە بوو کە ڕۆیشت، ئەو شەو لەوێ بمایەتەوە من و ئەرسەلان خراپمان بەسەر دەهێنا.هەرچەندە دوای بیستمان کە لە یۆنان لەگەڵ دووکەسی تردا بە چەقۆ کوشتویانە.



بەیانی چوومەوە بۆ کار لەگەڵ سەیدا حیلمی قسەم کرد، وتی پۆلیس هاتوون بەڵام زۆر نەبوون یەنها ئەوانەی فەرمانبەری ئاگر کوژێننەوە بوون لەوێ مابوونەوە تا درەنگ.

تەماشام کرد هەموو هاوکارەکانم لە فڕنی سەمونەکە تەماشام دەکەن، بەجۆرێك تەماشایان دەکردم، خۆشم لام سەیر بوو، بە تورکی وتم نەئولدوو..نەوار نەیوك؟

واتا چی ڕوویداوە، چی هەیە؟ هیچ بووە؟

ڕەفعەت ئابێ هات ماچیکردم، بە تورکی چۆخ چۆخە کەی وت ئیتر زانیم زۆر ڕازییە.

چووم بۆ لای حیلمی وتم: سەیدا بە پەترۆنەکەمت نەووتووە؟

پەترۆن واتا وەستاکەمان، خاوەن ئیشەکە ناوی ئایدن بوو.

حیلمی: بەرێ وەڵڵا پێمان وتووە.

زۆر ترسام وتم: بەخوا دەرم دەکات، چەند سەعاتێك سەموغان دابەش کرد و گەڕاینەوە بۆ سەمونخانەکە، تەماشامکرد ئایدن ئابێ لەوێیە کەمنی دی هاواری کرد کەریم، کەریم، گەل واتا وەرە.

منیش وتم: نڤیت ئابێ واتا بەڵێ، کاکە حیلمی بانگکردبووە موتەرجمم.

ئایدن: ڕۆژانەکەتم کرد بە دوو ملیۆن و نیو، پێشتر ملیۆن و نیوێکم هەبوو، تەنها یەك مانگ بوو ئیشم دەکرد.





ئینجا وتی: برۆ تا یەك هەفتە مەیەرەوە بۆ کار ئیشی ئەو خێزانەی کە پاراستوتانە ڕاییکە و ئینجا بێرەوە بۆ کارەکەت، ئەویش پارەی هەفتەیەك بۆ خۆت حەقی ئەوەی لەگەڵ ئەو ئافرەتانەدا دەبێت و ١٠٠ ملیۆن لیرەشی دامێ کە بیاندەم بەو دوو ئافرەتە، وتی: ئەوە دیاریە، پاشان دوای هەفتەکە وەرەوە بۆ ئێرە ئیشم پێتە!

زۆر دڵم خۆش بوو، هەر ئەمووت چۆخ ساوڵ ئابێ، لەوانەیە ١٠٠ جار وتبێتم چۆخ ساوڵ ئابێ.

دەستم لە ئیش هەڵگرت و چوومەوە بۆ لای دوو ئافرەتەکە، لەدەرگام دا وتم: خەسرەوم بیکەنەوە مەترسن.

دەرگایان بۆ کردمەوە، هەردووکیان زۆر کزۆڵ بوون.

وتم: تۆ دایکی منیت و ئەویش خوشکی منە، بەس بەخوا دایکە نازانم ناوت چییە؟

وتی: کاکە خەسرەو گیان من ناوم ڕووناکە و کچەکەشم ناوی تاڤگەیە.

هەستم دەکرد تاڤگە زۆر تەریق دەبووەوە، بۆیە وتم: تاڤگە خوشکێکم هەیە زۆر لە تۆ دەچێت، زۆریشم خۆش دەوێت، تۆش وەك ئەو خوشکەم وایت بۆ من ئەزانی.

خۆشحاڵی خۆمم بۆ دەربڕین و وتم: من برا و کوری ئێوەم بێخەم بن، ئەمماڵەش ماڵی خۆتانە، نەمویست هیچ باسێك بکەمەوە لەگەڵیان دا بۆ



ئەوەی باسی هیچ نەکەن و ئیحراج نەبن، بەڵام رووناك خان بە گریانەوە دەستی کرد بە قسەکردن، تاڤگەشی خستە گریان.

جیرۆکی ژیانی خۆیانی بۆ گێڕامەوە..

ڕووناك خان: لە سلێمانییەوە هاتین لەگەڵ چەند قاچاخچییەك من و تاڤگە و پیاوەکەم و کوڕەکەم و برایەکم، لە دوای ئەوەی لە ئەستەنبۆڵ مامەڵەمان کرد لەگەڵ چەند کەسێك بۆ یۆنان، لەم شەوانەی ڕابردوو دا پیاوەکەم و کوڕەکەم و براکەم پەڕینەوە بۆ ئەوبەر، کەچی ئێمەیان گەڕاندەوە وتیان پۆلیس هاتووە ئەوەیان بەسەر هێناین کە بینیت و بیستت، ٢٠ گەڵاشم پێبوو ئەو نامەردانە لییان سەندم.

کەوای وت دەستم کرد بە پیکەنین.

رووناك خان: خەسرەو گیان بەچی پێدەکەنیت بەخوا درۆ ناکەم!

وتم: بەخوا دەزانم درۆ ناکەیت، بەڵام پێکەنینم بە شتێك دێت کە قسەکانت تەواو کرد بۆت باس دەکەم، بڕواناکەین چی ڕوویداوە، خەمت نەبێت ٢٠ گەڵاکەت لای منە و نەفەوتاوە.

لە ئەنجامی قسەکانی بۆم دەرکەوت کە ئەم قاچاخچییە سەخیفانە لە مێردەکەی و براکەیان جیا کردۆتەوە بۆ ئەوەی لەگەڵیان دا ڕابوێرن، ئەوە ئیشی بەشێکی زۆر لەو قاچاخچییە خوێڕیانە بووە لە تورکیا و وڵاتەکانی تر بە گشتی.

منیش باسەکەم بۆ کرد و ٢٠ گەڵاکەم دایەوە و ١٠٠ ملیۆن لیرەکەشم دایە و وتم چیتان دەوێت بۆتان بکەم؟، باسی ئەوەم کرد کە وەستاکەم بە ئێوەی زانیوە ئەم دیاریەشی بۆ ناردوون هیچ خەمتان نەبێت پارێزراون، ئێستا چیتان دەوێت تا بۆتان بکەم؟

وتیان: تەنها دەمانەوێت تەلەفۆن بکەینەوە بۆ کوردستان و بزانین هاوسەرەکەم لە یۆنانە یاخود گیراوە؟!

لەبەر چاویان دا نوێژم کرد، بۆ ئەوەی زیاتر دڵ ئارام بن لە من و وتم: دەچین بۆ بازاڕ جلوبەرگ و خواردن دەکرین، لە ژیانمدا بەقەدەر ئەو ڕۆژە هیلاك نەبووم، کاکە ئافرەت هەر تەواو نابێت لە بازاڕ کردنیش ڕووم نەدەهات قسە بکەم ٥٠ دوکانیان کرد بۆ جل کڕین.

ئەوەندە ماندوو بووم شل ببووم، تەلەفۆنیان کرد سوپاس بۆ خوا هاوسەر و براکەی و کوڕەکەی لە یۆنان بوون، هاوسەرەکەی قسەی لەگەڵ کردم و وتی: دەگەڕێمەوە بۆ تورکیا ئەو ماوەیە با لای تۆبن زۆر مەمنون دەبم.

وتم: کارێکی باش دەکەیت، بێخەمبە پارێزراون وابزانە لەماڵی خۆیاندان تا سێ ڕۆژ لە ژوورەکەی من بوون منیش دەچووم بۆ لای جەماعەت لە غەسلەکە، هاوسەرەکەی گەڕایەوە ناوی کاك بەرزان بوو زۆر مەمنونی دەربڕی، ٢٠ وەرەقەکەی لە ڕووناك خان سەندەوە دایە من منیش لێم وەرنەگرت و عەرزی کاك بەرزانم کرد، بۆ پارە کارم نەکردووە، بەڵکو بۆ خوا کردوومە، گەر بۆ پارە بوایە، نە ٢٠ گەلاکەم ئەدانەوە نە حەقیشم هەبوو بەسەریانەوە.

زۆر مەمنونی دەربڕی و ڕۆیشتن، ئیتر نەمزانی چیان لیهات، دوای ٥ ڕۆژ چوومەوە سەرکارەکەم و ئاسایی کارم دەکرد، شەوی جومعە کاتێ لە کار تەواو بووین ئایدن ئابێ هات بۆ لام وتی: مەڕۆرەوە بۆ ماڵەوە دەچین بۆ ماڵی خۆمان جەماعەتم دەعوەت کردووە.

یەکێکیش لە کرمانجەکان بۆی تەرجوومە دەکردم.

ئەو شەوە چووین بۆ ماڵی ئایدن ئابی لە_ بیوك شار_ تا بڵێ جێگایەکی خۆش بوو، ئایدن ئابێ ئاهەنگی بۆمن گێڕابوو لەسەر ئەوەی خانوەکەم سوتاندوە و ئەو دوو ئافرەتەمان ڕزگار کردووە.

کچەکەی ئایدن ئابێ هات ناوی یاسەمین بوو، لە کچی ناو فیلم و شتەکان دەچوو ئەوەندە جوان بوو، ژنەکەشی ناوی جەمیلە بوو لە کچەکەی جوانتر بوو بە دایکم بێت، کرمانجەکان پییان دەووت ئابڵە جەمیلە، دوو کوڕی هەبوون بە ناوی ئیبراهیم و عەلی، زۆر ڕێزیان لەمن گرت و منیش ڕێزی زۆرم لێ گرتن.

هەڵساین بۆ نوێژی شێوان (مەغریب) من پێش نوێژیم کرد بە دەنگەوە قورئانم خوێند هەستم کرد کاك ئایدن ئەگری، نان داندرا و لەسەر نان ئایدن بسم الله ی کرد و تۆزێك نانی خوارد لەسەر نانەکەی نیو قاپ عارەقیشی خواردەوە.

دەست کرا بە قسە، یاسەمین بە عەرەبی قسەی لەگەڵ کردم عەرەبییەکی لوبنانی.

وتم: چۆن فێر بوویت؟




یاسەمین:لە ماردین لە زانکۆ دەخوێنم بەشی زمانی عەرەبی.

وتم:ئەی چۆن ئێستا لە زانکۆ نیت؟

وتی: ئەم ساڵ ناڕۆمە زانکۆ لەبەر ئەوەی دایکم نەخۆشە هاوکاری دەکەم.

من و یاسەمین قسەمان دەکرد و سەرنجی هەموو مەجلیسەکەمان ڕاکێشابوو، ئەویش زوو زوو تەرجومەی دەکردەوە بۆ باوکی، هەردووکمان حەزمان دەکرد عەرەبییەکەمان دمە زەرد بکەینەوە.

وتم: یاسەمین بە باوکت بڵی خەسرەو دەڵێت پیاوێکی زۆر باشە بۆ نویژ ناکات؟

ئایدن:چۆن نوێژ ناکەم، هەموو جومعەیەك ئەڕۆم بۆ مزگەوت.

تورکەکان عادەتەن یەك هەفتە نوێژ ناکەن دوای بۆ نوێژی جومعە دەچن و دەڵێن پاک بووینەوە.

دوای قسەی زۆر و موناقەشە قەناعەتی کرد کە نوێژ بکات و ئیتر عارەق نەخواتەوە.

یاسەمین:کەریم لیرە بەرنامەت چییە؟

وتم:دەچم بۆ ئەوڕوپا.

وتی:ئەچیت بۆ یۆنانستان، تورک بە یۆنان دەڵێن یۆنانستان.



وتم: بەڵێ.

ئەو شەوە قسەی زۆر کرا و شەوێکی زۆر خۆش بوو، هاتینەوە بۆ ژوورە سارد و سڕە بێکەسیەکەمان و لێی خەوتین بۆ ڕۆژێکی نوێ، بەردەوام خەریکی کار کردن بووم دوای چەند بەیانییەک وەك ڕۆژانی ئاسایی چووین بۆ دابەش کردنی سەموون، من سەیارەکەم لێدەخوری لەگەڵ ڕەفعەت ئابێ، کەوتینە بۆسەی ترافیك و پۆلیسی هاتوچۆ لەبەر موخالەفەیەکی من وەستاندیانین و داوای ئیجازەی سایەقیان کرد، منیش هیچم نییە ئینجا وتیان پاسپۆرت.

گیرام کەلەپچەیان کردم و ناردیانمٰ بۆ قەرەقول بەرەو سنورداشی بۆ عێراق.

خستمیانە زیندان و هەرچی پارە و پولیش کە هەمبوو نزیکەی ۳۰ وەرەقە لە ژوورەکەم دا و دوو ملیۆن لیرەش لە گیرفاندابوو هەموویان لی سەندم هیچ هیوایەکم نەما، کە قەرقولی وژدەرە_ لە ئەستەنبوڵ گیرام نزیکەی کاتژمێر یانزەی شەو بوو چاوم نا بەیەك دا و خەوم لێکەوت، زۆر بێزار بووم پێشتر حەزم لێبوو سنورداش بکرێمەوە، کەچی ئێستا خەفەت دەخۆم بۆ ئەوەی سنورداش نەکرێمەوە، بەدەم خەم و خەفەتەوە خەوم لێکەوت.

ئەوەندەم زانی دەرگای زیندانەکەم بۆ کرایەوە هاوارکرا کەریم ئابێ گل بوردە...واتا وەرە بۆ ئێرە.

وتی: ئازادی...وامزانی رادەبوێرێت، کەچی دووبارەی کردەوە برۆ لێرە مەوەستە، بردمیانە ئەو دیوو دەرگایەکی ترەوە تەماشام کرد، یاسەمین و




باوکی و ڕەفعەت ئابێ و هەرچی کرمانجە وەستاوە لە ڕێم، سواری سەیارا مارسیدسەکەی ئایدن ئابێ بووم و هاتمەوە بۆ ماڵەوە.

ئایدن ئابێ بوو بە کەفیلم، کەفیلی ١٠٠ ملیۆن لیرە کە ئەبێ لە دوای ١٥ ڕۆژ لەو وڵاتە نەمێنم.

بەیانی کە چوومە سەر کارەکەم، چوومە لای ئایدن ئابێ و وتم: من دەڕۆم بۆ یۆنان با پارەکەش لە تۆ نەسێنن، زۆری پێناخۆش بوو قسەی نەکرد.

خۆم پێچایەوە چووم کۆڵەپشت و کەرستەم کڕی بۆ ڕێگای یۆنان وەجبەی هیوای قوماش ئامادە بوو بەرەو یۆنان.

کۆتای شەو یاسەمین هات بۆلام وتی: کاریم ئابێ، مەڕۆ بۆ یۆنان باوکم لە ماردین ئوتێلێك دەسێنێت، دەچین بۆ ئەوێ لەوێ پێکەوە کار دەکەین، ئیقامەی تورکیاشت بۆ وەردەگرین.

وتم: تۆ من ناناسیت، منیش تۆ ناناسم ناکرێت لەم وڵاتە دا بمێنمەوە کە هیچ داهاتویەکم تێدا دیار نییە، من پیویستە ژن بێنم و منداڵم هەبێت و ماڵم هەبێت وەك هەموو کەسێکی ئاسایی، دەمەوێت بژیم ئێستا ئەم بینی لە قەرەج ئەچم، نە ماڵم هەیە و نە ژیان و هیچ.

یاسەمین: کەریم من شوت پیدەکەم و ژیان درووست دەکەین لێرەبە مەڕۆ بۆ یۆنان.

وتم: نوکتەکی خۆشە، چۆن شوو بە من دەکەیت تۆ نازانیت من کێم؟



وتی: تۆ ئەو کەریمەی کە ئافرەتەکانت ڕزگار کرد!ئەوەنەم بەسە بۆ ناسینی تۆ؟

وتم: یاسەمین!ئەوە بڕیارێکی خێرایە، ڕۆژێك کە تۆ پەشیمان بیتەوە ئاسانە، هەروەك وتم هیچ داهاتێکم نییە دەبمە سواڵکەری سەر جادەکان لەبەر ئەوەی زۆر ڕێزی تۆم لایە، بەڵام ببورە من دەڕۆم بۆ یۆنان و ئەمشەو خواحافیزی دەکەم و هەر ئە مشەویش دەڕۆم و نامینیتەوە لەبەر باوکیشت با ١٠٠ ملیۆن غەرامە نەکرێت.

یاسەمین: دەستی کرد بەگریان و ملوانکەیەکی ئاڵتونی لە ملدا بوو دایە من و منیش لێم وەرگرت، لە فلیمی ئیبراهیم تاتلیساس دەچوو، زۆر سوپاسم کرد و دوایی دامەوە وتم: دیارییەکەم بۆ هەڵبگرە لای خۆت من دەچم بۆ یۆنان با نەفەوتێت پەیمانبێت دەگەڕێمەوە و لێت دەستێنم، خۆی زۆر لێم نزیك کردەوە، بۆ ماچ و شتی وا، منیش شیعرە تەصوفەکەی مزگەوتم لە بیر مابوو

کەدەڵێت:-

بە منداڵی پەستی

بە گەنجی مەستی

بە پیری سستی

ئەی خۆشەویست تۆ کەی خودا دەپەرستی!؟




وتم: یاسەمین، ئەوەندە خۆتم لێنزیك مەکەرەوە با هەردووکمان گوناهبار نەبین ماچکردن ئاسانە، بەڵام با بڕۆینە جێگایەك با خوا ئاگای لێمان نەبێت.

من هەرگیز لە ماچی خۆشەویستەکەم ناترسم، لەو تاوانە دەترسم کە لێی پەشیمان دەبمەوە.

ئیتر سوپاس بۆ خوا ئەویش دامرکایەوە و منیش خوای پەروەردگار ڕەحمی پێکردم.

ماڵئاواییمان کرد و ئەوشەوی ١١٠ کەس سواری لۆریەك بووین و بۆ سەر ئاوی گەورەی نێوان یۆنان و تورکیا.

دوای پەڕینەوە لە ئاوی سنوری تورکیا و یۆنان، ٣ شەو بە پێ ڕۆییشتین گیراین و سنورداش کراینەوە بۆ تورکیا، تورکیاش سنورداشی کردینەوە بۆ یۆنان.

هەرچی کۆڵەپشت و خواردن هەبوو هەمویانمان لێسەندرابوو هیچمان پێنەمابوو، ٢٦ ڕۆژ بە ڕێگاوە بووین گژوگیامان دەخوارد، لاواز سست بووین ڕێگەمان لێ تێکچوو، چەند جارێکی تر لە نێوان تورکیا و یۆنان دا تۆپ تۆپێنیان پێدەکردین.

زۆر بێزار بووم جیابوومەوە لەو وەجبەیە ڕۆیشتم بەرەو دێیەك لە نزیک دێیکە خانوێکی لێبوو، وتم دەڕۆم لەو ماڵە داوای نان دەکەم، دایان باشە، گەر نەیان دا یان دەمگرن یان ڕادەکەم.



لە دەرگای ماڵەکەم دا دەنگ نەبوو کەس نەیکردەوە.

عەسرێکی درەنگ بوو لە ڕاستیدا زۆر دەترسام، جلوبەرگم دڕا و پێڵاوەکانم بنی پێوە نەمابوو هەمووی کون ببوو زۆر ساردیش بوو، چڵکن و بۆنم لێدەهات و قژ و دەموچاوم قوڕاوی، بەسەر دەرگای ماڵەکە دا چوومە ئەو دیو دەرگاکەوە کەس لەماڵ نەبوو.

چوومە پشتی ماڵەکە، مەتبەغەکەم بینی ٢٦ ڕۆژە نانم نەخواردوە وەك بزن گیام ئەخوارد.

هەرچۆن بوو لە پەنجەرەکەوە چوومە ژوورەوە، کە سەلاجەکەم کردەوە مریشکێك پاڵ کەوتووە بە ناز و مەکرەوە، تەماشام کرد پیاز و نان و کێك و هەرچی خوا پێخۆشبێت لەو ماڵەدا هەبوو.

منیش دەستم کرد بە نان خواردن و مریشک سورکردنەوە، بێ ئێوە ناخۆش تێر و پڕم خوارد و خۆم کرد بە حەمامەکەیان دا جوان و پاك خۆم شۆرد.

قێزم نەهات جلەکانی خۆم بکەمەوە بەرم ئەوەندە بۆنی بۆگەنی لێدەهات، کەنتۆری ئەو ماڵەم کردەوە وەك بڵێیت ئەو ماڵە چاوەڕێی من بن، ئەوەی من پیویستم بوو لە کانتۆرەکە دا هەبوو، قاپ و قاچاخەکانم شۆرد و تاوە و شتەکانم لە سەر مێزەکە دانا و گوڵێکی لاستیکی لێبوو گوڵەکەم خستە ناو قاپەکە و چوومە ژووری نوستنەکەیان، وتم ٢٦ ڕۆژە لەبەر باران و سەرمادا دەخەوم با تۆزێکیش بخەوم.

خەوم لێکەوت، نازانم چەند خەوتم، ئەوەندەم نەزانی تاپڕ بە دەستێك لولەی تاپڕەکەی دەکێشێت بە سەرم دا و هەر دەڵێت: ئیلازۆۆ...ئیلازۆۆ ژنەکەشی لە پشتییەوە هەر دەیوت: پەریمەنی...پەریمەنی تەماشام کرد پیاوێك لە تەمەنی باپیرم دا دەبوو لولەی تاپڕەکەی لە سەر سەرم داناوە، خوایە گیان نازانم بڵێم چی!

بە ئینگلیزی بە کابرام وت: من کوردم و ڕفیوجیم برسیم بوو هاتومەتە ماڵتان و ئەو قسانەم بۆکرد، هیچ تێنەگەیشت.

لە دڵی خۆم دا زانیم ئەوە زۆر ناحاڵییە دەستمکرد بە پیکەنین و سەرنجیم ڕاکێشا و سەرم داخست و سێ چوار جار وتم: پلیس، پلیس، پلیس.

لولەکەیم بەرز کردەوە بەدەست و لەقەیەکم دا لە پیاوەکە تا پرەکە لە داستی کەوتە خوارەوە، تەماشام کرد فیشەکیشی تێدا نییە.

پیاوەکە زۆر گوناه کەوتبوو چووم سەریم ماچ کرد و سیلاحەکەم دایەوە دەستی چوومەوە لای ژنەکەی و دەستیم ماچ کرد و بە ئیشارەت بانگم کرد جلەکانم نیشاندان و قاپ و قاچاخەکەم نیشان دان کە بۆم شۆردون و گوڵەکەم خستۆتە ناوی.

هەرچۆن بوو تێمگەیاندن کە ئەو جلانەم پێوستە، بەلام بەخوا پارەم پێ نییە حەقەکەی بدەم، ئیتر زۆر بە ئیشارەت و ئینگلیزی و قسەی کوردی جاروبار بە عەرەبیش لێم تێك دەچوو هەر قسەم دەکرد بۆ ئەوەی مەمنونی دەرببڕم و نەترسن، وەڵلا لەم قسانە دابووم ژنەکەی دەستی کرد بە قسە، ئەلێکس ئەلێکس شوێن من کەوت و چوو ڕسمێکی بۆ هێنام هەر

دەیووت تۆ لە ئەلێکس دەچیت، دەستی ئەهێنا بە دەموچاوم دا و سەیری وێنەکەی دەکرد و دەیووت ئەلێکس.

تا ئێستا نەمزانی ئەلیکس کوڕیەتی ماوە مردووە کوڕەزایەتی کچەزایەتی، هەر پێدەکەنیم بۆ ئەوەی شکایەتم لێنەکەن.

تۆزێکی پێچوو پیاوەکە دەستی کرد بە گیرفانیدا و ۱۲ هەزار دراخمای پارەی یۆنانی دامێ منیش وتم نامەوێت.

وەك چۆن بڵێ کەرە دەبیگرە، تۆ سەعاتێکە دەپاڕێیتەوە بەس تۆ پێویستت بە پارەیە، ۱۲ هەزار دراخماکەم لێ وەرگرت، جارێکیتر دەستی هەردووکیانم ماچ کردەوە.

چوومە لای دەرگاکە و وتم: بای بای ماما و پاپا، کەوام وت پیاوەکە بەدەست ئاماژەی بۆکردم و قەمسەڵەکەی خۆی داکەند و کردییە بەری من، جارێکیتریش دەستم ماچ کردەوە لە خۆشیدا بە کوردی وتم خوا حافیز.

هاتمە دەوەرە، کات شەوە نازانم کات چەنە، ئایا بەیانییە شەوە گەڕامەوە بۆ ئەو جێگایەی کە وەجبەکەم تێدا بەجێ هێشتبوو.

پیاوێکی پێنجوێنیمان لەگەڵ بوو ناوی خاڵە عومەر کەبابچی بوو (عومەری حاجی مەلا حەمە ساڵح) ئێستا جەنابیان هەر لە نەرویجن، خاڵە عومەر لە دوورەوە منی بینی بەو جلە جوانانەوە ڕایکرد وای زانی پۆلیسم، منیش هەرچی وتم خاڵە عومەر خۆمم تا هاتەوە بۆلام، ئەو بەمنی دەوت مەلا.

وتی: مەلا گیان ئەوە لە کوێ بوویت؟

باسەکەم بۆ گێرایەوە، بەهەرحاڵ چوومەوە ناو وەجبەکەی خۆمان ئەو جێگایەی کە تیمەی لێبووین نزیک شاری سالۆنیکی یۆنان بوو، قاچاخچییەکان بردینیانە ناو سالۆنیک، بۆ ئەوەی بلیتی ئەسینامان بۆ ببڕن، کە چووینە ناو تەرمیناڵی پاسەکان ئەو خەڵکەی تیمە هەموو لە مرۆڤی سەردەمی چاخی بەردین دەچوون، هەرچی لە پاسەکە دا بوو دابەزی لە تاو بۆنی ئەو وەجبەیە.

پۆلیس بەمەی زانی هاتن وردە وردە کەوتنە گرتنمان، وەڵڵا من گیرام خارە عومەریش منی بینی لە دوورەوە وایزانی ڕەفیقم پەیدا کردووە هەرچی وتم: مەیە، بابە مەیە هەر بەقسەی نەکردم.

وتی: مەلا گیان ئەوە چییە؟

وتم: گیراوم ئەویشیان گرت خستیانینە ناو سەیارەوە ١٠ کەس گیراین.

ئەو ناوانەی لە بیرمە من و خاڵە عومەر، حەمە نجم کەلاری، شێخ عەلی بێستانسوری، دوو کوڕی ڕانیەیی، ڕەوەند و ئاری، ئەوانی ترم بیر نەماوە.

وتیان ئەتان نێرینەوە بۆ تورکیا، چوینە مەحکەمە و وتمان پەکەکەین خوای گەورە ڕەحمی پێکردین یەکی مانگێك حکوم دراین و لە زیندان دا ماینەوە، دوای ئازادمان دەکەن و ئیقامەی سێ مانگمان ئەدەنێ.



مانگێك لە زیندانی سالۆنیک بووین، ئەو ڕۆژەی گیرام چەند ڕۆژێکی مابوو پایز ماڵئاوایی بکات، ئیتر شیعرەکەی یەغمام بیرکەوتەوە منیش سەروگوێلاکم کرد و بە کوردی لەسەر دیواری زیندانەکەی سالۆنیک نووسیم.

پایز گیان...ماڵئاوا

دوو هەنگاو ماوە کە پایز بە تاڵان بڕوات

ئەم هەموو ڕەنگە جوانە لە دەست دونیا بڕوات

هەرکەس خۆشەویستی هەڵبژارد نۆشی گیانی بێت

دڵی تەنها بە چ شەوقێکەوە بەرەو یەڵدا بڕوات.

## زیندان و ئەسینا و قەرەجێك

که چوومه زیندان هۆڵێکی گەورە بوو ٨٠٠ بۆ ١٠٠٠ کەس لەو هۆڵە دا زیندانی کرا بوون،

له هەموو جۆر نەتەوەکان، ئەلبانی، ڕۆمانی، سریلانکی، کورد، عەرەب، فارس، بولغاری، ڕووسی....هتد.

چووینە ناو زیندانەکە کوردەکان هاتن بە دەممانەوە وتیان ئێمە لە دوو جێگا دا شوێنمان هەیە خەمتان نەبێت جێگاتان بۆ پەیدا دەکەین.

کۆمەڵێك کوڕی کەرکوکی هاتنە لای من و منیان بردە لای خۆیان دووبرا و کەسێکی تر بوون، ئەو دە کەسەی کە گیرابووین بەیەکەوە بووین لای من دادەنیشتن و پرسیار و ڕامان بەیەکتر بوو، منیان وەك برا گەورەیەك تەماشا دەکرد، تەنانەت بە خاڵە عومەریشەوە کە لە پیاوەتی خۆیان بوو، چەند کەسێکی تر هاتن بۆلام یەکێکیان ناوی مەمون بوو لەگەڵ کوڕێک دا ناوی شێرە هەولێری بوو، هەردووکیان قاچاخچی بوون لە یۆنان وایان زانی ئەو نۆ کەسە لەگەڵ منن و من قاچاخچیم.

ویستیان نەفەرەکانم لێبکرن، منیش وتم کاکە نە قاچاخچیم و نەهیچ ئێمە هەموو ڕەفیقین و بەیەکەوە هاتووین.

شەو خەوتبووم لەپڕ ئاگر لە قاچم بەرد بوویەوە کلێنسیان خستبووە بەینی پەنجەی قاچم گڕیان پێوە نابوو، زۆر ئازارم پێگەیی، ئەمە یاری

شەوانی زیندانە، منیش ئەو تەحەمولەم نەبوو، دەستم کرد بە جنێوی پیس.

وتم: ئەگەر پیاوە خۆی ئاشکرا دەکات کوردەکانیش زانیان زۆر تورەم بێدەنگ بوون.

دوایی زانیم کە مەئمون بووە ئامۆزای شێرە هەولێری کە لە چاو من دا دەبابە بوو.

بەخوا کە وتیان ئەوە پەلامارم دا دوانم کێشا بە سەروچاویا، ئەویش تا توانی فڕێیدام، دەستم نرد بۆ پێڵاو و تێمگرت، کلکی گسکێك هات بەدەستمەوە ئەویشم پێدا کێشا.

منیان گرت و ئەویشیان گرت لەیەك جیابووینەوە، بەس باش بوو گرتیانین، چونکە لاشەی من و ئەو زۆری فەرق بوو مەئمون لە گۆریلا دەچوو، ئەوەندەم زانی یەك دنیا هەولێری لە دەوری کۆبوونەوە بۆ ئەوەی لێم بدەن، سلێمانی و خانەقینیەکان لە دەوری من کۆبوونەوە بۆ ئەوەی بم پارێزن هەرچەندە من بەمەم نەزانی تا دوایی.

زۆر زووش بە هەولێرییەك کە ناوی ئەمیر بوو دەڵێم ئەو سەگ بابە کێیە؟

دوای خۆی وتی: خۆم ئامادە کردبوو یەك دوو گوێزانت لێبەم، بەس وابزانم برای ئەمیر حەڕامی بوو وایاندەووت لە خۆشەویستی براکەی خۆی ناونابوو ئەمیر.

سەیرەکەم جیقنێك ئەیەوێت پەلامارم بات، ئەویش قاچاخچییە ناوی دلاوەر هەولیرییە، وا هەستم کرد چەور بوو.

منیش پەلامارم دا ئەوی بۆمکرا لێمکرد بە زۆر لە ژێر دستما دەریان هێنا.

من باش هیلاك ببووم، دیسانەوە مەئموون ڕووەو من هات لە دێو دەچوو، وتم ئەم سەگبابە دەمکوژێت، پەلاماری داری ماسیحەکەم دا هەرچۆن بوو تیاما شکاند، بەخوا ئەویش یەك زلەی لیدام بەرچاوم ڕەش بوو، خوا ڕەحمی کرد پۆلیس هات خاڵە عومەریش کەوتە بەینمان، بەڵام ئامۆزایەکی لەگەڵیدا بوو شێرە زۆر پیاو بوو دەیووت چۆن بە هەمووتان بۆ ئەو کوڕە دەچن، ئاگام لەو قسەیە بوو.

شەڕ کۆتایی هات و بە حەمە نەجم کەلاریم وت: ئەخەوم ئاگات لێم بێت، نەکو لە خەودابم بێن لێم بدەن، چونکە منیش دوو جار نزیك بوومەوە لە شوێن خەوی ئەوان نە خەوتبوون وایان زانی بوو پەلاماریان دەدەم لە خەو دا، دوو شەو نە من بە جوانی خەوم لێکەوت نە مەئمونیش.

لە دوای ئەوە من زۆر بە گەورە تەماشا دەکرام، چونکە مەئمون لە ئەسینا دا کەس نەیدەوێرا سەیری بکات چ جای ئەوەی شەڕی لەگەڵ بکەیت.

دوای دوو ڕۆژ ئەوان هاتن بۆ جێگاکەی من و خاڵە عومەر و کوڕێکی خانەقینی ناوی کاك لوقمان بوو ئاشتی کردینەوە، بەو بۆنەیەوە ئەو شەوە دەست کرا بە حەفلە و سریلانکی و عەرەب و فارس بە خۆشی ئێمەوە ڕەقس و هەڵپەرکێ بوو.



بووین بە ڕەفیق، بەڵام ڕەفیقێکی باش ئینجا یەك دوو شەڕی ترم توش بوو لەگەڵ ڕووسەکان لەسەر حەمام و بانگدان ئینجا هەولێرییەکان هاتنە پێشەوە لەگەڵم دا ئەوان ببوونە برا.

ئەو تەمەنەی من کاتی هەڕەتی هەرزەکاریم بوو، ڕاستە مولتەزیم و دیندار بووم، بەلام لەبەر ئەوەی لە مزگەوت و هاوڕێ دیندارەکانم دابڕابووم ئەوەندە پابەندیم نەمابوو بە دینەوە، تەنها نوێژەکانم دەکرد و جاروباریش سونەتێك ئەگەر بمکردایە نەمکردایە، هەندێك جاریش بەهۆکاری ڕێگا و نەبوونی حەمام و خۆ پاکردنەوە نوێژەکانم لە کیس دەچوو، یاخود بە هۆکاری لاوازی ئیمان و نەبوونی هاوڕێی باش و خواناس، دوور دەکەوتینەوە لە خواناسی.

بەلام هەر پابەند بووم بە ئیسلامەوە سوپاس بۆ خوا ڕەچاوی حەڵاڵ و حەرامم دەکرد، ئەو زەمەنەی منیش بە چەقۆ و هێزی خۆت نەبوایە خەڵکی تر دەیخواردی، دەبوو بەلایەنی کەمەوە کەسایەتی خۆت و بنەماڵەکەت بپارێزیت، تۆزێك ئازا بوویتایە خەڵکی تر لە دەورت کۆدەبوەوە.

منیش ئەو دەمە گوێم بە هیچ نەئەدا بۆ لە تێك نان ئامادەبووم شەڕە چەقۆ درووستبکەم.

قسەم لەکەس قبوڵ نەدەکرد، بەڵام سوپاس بۆ خوا هەرگیز دەستدرێژیم نەکردۆتە سەر خەڵك و هەمیشە ئەوانەی مەزلوم بوون ئەوەندەی توانیبێتم پاراستوومن.

بەڵام جەماعەت لە زیندان دا من هەر بە قاچاخچی دەزانن، وادەزانن لە ترسا خۆم ئاشکرا ناکەم، دوایی هەر بڕوایان نەرکرد.

لە ناو زیندان دا مزگەوتم درووستکرد، ئەو ساڵە مانگی ڕەمەزان کەوتبووە مانگی دوانزە، ٢٠٠ کەس بۆ نوێژی جەماعەت دەوەستا.

لە سالۆنیك من و خاڵە عومەر بەربووین، ئەو عەسرەی ئازاد بووین من بەڕۆژوو بووم.

ماوەی مانگێك لە زیندان لە نانی وشك و ئاو زیاترمان نەخواردبوو، هیچ پارەشم پێ نەبوو ئەوەشی پێم بوو ئەو ماوەیە لە زیندان خەرجم کردبوو.

خاڵە عومەر: ڕۆژووەکەت نەشکاندووە مەلا گیان؟

وتم: نەوەڵڵا خاڵە عومەر گیان بەچی بیشکێنم؟

خاڵە عومەر: پیاو نەبم ئەو ئێوارەیە گۆشتت دەرخوارد نەدەم.

زیندانەکە دوور بوو لە شارەکە، تۆزێك ڕۆیشتین باران دایکرد و بە پێ هەر دەڕۆیشتین.

لە پڕ سەیارەیەك وەستا و وتی: بۆ کوێ دەچن؟

خاڵە عومەر: سالۆنیك، خۆشی خوێندەوارێکی باش بوو ئینگلیزیەکەشی زۆر باش بوو، تێیگەیاند.



وتی: به ۲۰۰۰۰ دراخما ئەتانبەم، خاڵە عومەر دەستی کرد بە گیرفانیا وەرەقەی زیندانەکەی دەرهێنا و وتی: ئەوە گوزەرانی ئێمەیە پارەمان پێنییە.

کابرا جڕتێکی بۆ لێداین و ڕۆیشت.

من زمانم بە ڕۆژوو بوو نەموێرا جنێو بدەم، وتم: خاڵە عومەر گیان لە جیاتیمن قسەیەك بکە.

تۆزێکیتر ڕۆیشتین هەمان سەیارە هاتەوە، لە پێشمان وەستا، بێ سێ و دوو سەری خستین.

دیار بوو کابرا ڕەحمی جوڵا بوو، بردینی بۆ ساڵۆنیك نزیك وێزگەی شەمەندۆفێر وەستاندین و سوپاسمان کرد ڕێگاکەش هەمووی ۱۵ دەقیقە بوو.

من برسیمە و لەو شارە جوانە دا پارەمان پێ نییە، دەشزانم خوای پەروەردگار ئاگای لە زمانی بەڕۆژووی منە خوای مەعبودم یوسفی پاراست.

ئاگام لێبوو خاڵە عومەر زۆر بێزار بوو، بە تەمەنیش بوو خەفەت دایگرتبوو.

بە خاڵە عومەرم وت: ویستیان یوسف بکوژن، بەڵام نەمرد_ سەلامی خوای لێبێت_، ویستیان هیچ بوونێکی نەهێڵن لەسەر زەوی، بەڵام ئەرزشی زیاتر بوو، ویستیان بیفرۆشن و بیکەنە کۆیلە، بووە وەزیر، ویستیان خۆشەویستی لە دڵی باوکی دا دەربهێنن، باوکی بۆی کوێر بوو، لە پیلانی




مرۆڤەکان نابێت خۆمانمان پێ موهیم بێت با لە خوا بپاڕێینەوە دڵنیابە هاوکاریمان دەکات.

بەردەوام بووم لە قسەکانم دەستم خستە سەرشانی و عەرزم کرد خاڵە عومەر سوێند بەخوا ئیرادەی خواوەند بەرزترە لە هەموو ئیرادەکان یوسف دەیزانی هەموو دەرگاکان داخراون، بەڵام لەبەر خوا بەرەو ڕووی دەرگا داخراوەکان ڕایکرد و پەروەردگار هەموو دەرگا داخراوەکانی بۆ کردەوە.

کەواتە من و تۆش دەبێ بزانین ئەگەر دەرگاکانی هەموو دنیامان لێ دابخرێت، با بڕۆین بەرەو ڕووی دەرگا کراوەکانی خوای پەروەردگار.

لەو قسانە دابووم بۆ خاڵە عومەر لە پڕ گوێمان لە دەنگی گۆرانی کوردی بوو لە خێمەیەك دا لە ناو بازاڕ دا کە چووین دوو کچ و کوڕێکی لێبوو وێنەی عەبدوڵڵا ئوچ ئالانیان پێبوو لەوێ گۆرانی شڤانی لەسەر بوو، ئەو دەمە شڤان لەی پەکەکە خۆشەویست بوو.

چوینە لایان و باسەکەمان بۆ کردن ئینجا نانیان بۆ هێناین وام زانی زۆر دەخۆم کەچی تۆزێکم خوارد، بە هۆکاری ئەوەی ماوەیەکی زۆر بوو چەوریم نەخواردبوو گەدەم بچووك ببوەوە.

باسی ئەوەم کرد یان پارەمان بدەنێ بە قەرز بۆتان دەگەڕێنینەوە لە ئەسینا، یاخود هاوکاریمان بکەن تەنها بلیتی ئەسینامان بۆ ببڕن کە چووینە ئەسینا پارەکەتان ئەدەینەوە.

بەداخەوە بۆیان نەکردین، نائومێد بووین، ناچار وتم: خاڵە عومەر چارەمان نییە دەبێت ئەم شەو بمێنینەوە.



خاڵە عومەر چوو بۆ لای دوو پیاوی یۆنانی دەستی کرد بەقسە منیش لە دوورەوە تەماشام دەکرد، لە دڵی خۆم دا زۆرم پێناخۆش بوو، وتم ئەم پیاوە بۆ بەم سەرە سپیەوە تەکلیف لە خەڵك دەکات بۆ پارە.

بلیتەکەش زۆر گران نەبوو هەریەکەیکمان ٦ هەزار دراخمان دەویست بۆ بلیتی سالۆنیك ئەسینا واتا ١٢ هەزار دراخمان پێویست بوو.

من ڕووم نەدەهات داوا لە کەس بکەم، خاڵە عومەر لەگەڵ دوانەکە دا بەردەوام بوو یەکێکیان دەستی برد بۆ گیرفانیا و شتێکی دا بە خاڵە عومەر، زۆرم پێ ناخۆش بوو.

کەهات وتم خاڵە عومەر ئەوە چییە؟

وتی: ئەم عینوانەیان پێ داوم بچینە لای ئەوان هاوکاریمان دەکەن.

وتم: براکەم دەواز بێنە توخوا.

خاڵە عومەر لێم تووڕە بوو وتی: کاکە تۆ حەقت نەبێت قسەمەکە و مەیە پێشەوە لە دوورەوە بوەستە، من قسەدەکەم ئەزانم تۆ ڕووت نایە من پارە پەیدا دەکەم.

منیش هیچم نەوت لەبەر حورمەتی خاڵە عومەر.

ئەدرەسەکەمان دۆزییەوە خۆی چووە ژوورەوە نەمزانی چییە، پێ دەچوو وەك سۆسیال وا بوو بێت.

هاتە دەرەوە پێدەکەنی و وتی: ئێستا یەکێك دەنێرن بلیتەکانمان بۆ بکرێت و نانیشمان بۆ دەکڕن!تۆزێك گۆرانی عەلی مەردانی بۆ وتم لە بیرمە ئەوەی بۆی وتم: گەردەن بلور دیارە لە دوور.

پاش کەمێك کوڕێکی گەنج هاتە دەرەوە بە ئینگلیزی چۆنی و چاکی لەگەڵ کردم و وتی: بابڕۆین، چوینە وێزگەی شەمەندۆفێر و بلیتەکانی بۆ کڕین بای ١٢ هەزار دراخما بوو، یەکی ١٠ هەزار دراخمای پێ داین وتی: بۆ ڕێگا با پێتان بێت، شەو سەعات ٩ سەردەکەون کاتژمێر ١٠ی بەیانی لە ئەسینان، قیتارەکەتان چێنچی نییە.

لەو کاتەی لەگەڵ ئێمە دا وەستابوو پیاوێکی پیری لێپەیدا بوو گەنجەگە چۆنی و چاکیان کرد و بەیەکەوە تۆزێك قسەیان کرد و پیاوەکە چووە جێگایەکەوە و ئێمەی جێهێشت بلیتەکانی نەداینێ پاش کامێك پیاوە بەتەمەنەکەی هاوڕێی گەنجە یۆنانیەکە گەڕایەوە و بە پێکەنینەوە هاتە لایمن و ٢٠ هەزار دراخمای دا بە من و بە ئینگلیزی پێی وتم نەیدەی بە باوکت، ١٠ هەزارشی دایە خاڵە عومەر، وای زانی خاڵە عومەر باوکمە.

خەونەکەمان هاتە دی گەشتینە ئەسینا، کە چوومە پاڕکی ئەمۆنیا ئەو هەموو خەڵکەم بینی لە سەر کارتۆنی جگەرە دا دەخەوتن، یەکسەر کەئابە گرتمی خەمۆکیەیك دایگرتم، خەریك بو بگەڕێمەوە بۆ تورکیا بۆ لای ئایدن ئابێ.

من ماندوو بووم و خاڵە عومەریش جێی هێشتم و چوو بۆ لای کوڕەکەی ناوی کاك توانا بوو ئەو پێشتر گەیشتبووە ئەسینا.

منیش کوڕەکەی مامۆستا سالح دیلانم بینی کاك هونەر، لە ئۆتێلێك بوو بردمی ویستم بچمە ئەو ئۆتێلە کە بەڕێزیانی لێبوو لە ڕێگا دا کوڕێکی ڕەفیقی خۆمم بینی لە تورکیا بوین بە هاوڕێ زۆر کوڕێکی چاك بوو، ناوی عەبوڵلا بوو، منیش ناوم نابوو (عەبە ماڵتەپە) ماڵتەپە جۆرە جگەرەیەکی هەرزان بوو ئەوی دەکێشا بەس زۆر خەتەر بوو ئەو جگەرەیە، هەر کەس یەك مانگ بیکێشایە دەیکوشت عەبە ماڵتەپە کاری تێ نەدەکرد، دوای چۆنی و چاکی و ئەحواڵ پرسین.

عەبدوڵلا: مامە خەسرەو بۆ کوێ دەچیت؟

وتم: وەڵلا مامە عەبدوڵلا گیان ئەمە تۆزێکە لە زیندان بەر بووم زۆر ماندووم دەچم بۆ ئوتێل هیچ جێگایەکم نییە، ئیسراحەت دەکەم.

عەبدوڵلا: نا مەچۆ شوقەم هەیە من و فاروق و حەسەنی لێین جێگەمان هەیە مەڕۆ بۆ ئوتێل و بەیانیش ئەتخەینە سەر ئیش.

داوای ئیزنم لە کاك هونەری مامۆستا سالح دیلان کرد و بە دوای کاکە عەبە گیان کەوتم، وتی: بخەوە و بەیانی وەرە بۆ کار و دەتبەم فێرت دەکەم.

بۆ بەیانی سەری ساڵی نوێ بوو، بە عەبەم وت فریامکەوە بیری دایک و برا و خوشك و هەموویان دەکەم، تەلەفۆنم بۆ پەیدا بکە کەس نازانێت من لە کوێم.

تەلەفۆنم کرد بۆ کوردستان، ئای بیری دایکمم دەکرد، بیری دایە گەورە و باوە گەورەم دەکرد، بیری سلێمانیم دەکرد.





قسەم لەگەل کردن هەر ئەوەندە توانیم بڵێم چۆنن و من لە ئەسینام، هەموو گیانم دەگریا گوێم لە باپیرم بوو دەگریا، دایکم دەگریا ئەوانیش هەموو دەگریان ماوەی دوو مانگ بوو هیچ دەنگێکم نەبوو، ئیتر هاتنە سەر ئەوەی تەعزێم بۆ دابنێن.

من ئەوەندە گریام عەبە و حەسەن فرمێسکەکانی منیان دەسڕی، وتم بە خوا من قسەم بۆ ناکرێت ئێوە قسەم بۆ بکەن، لەو گریانە دا باپیرم (باوکی باوکم) هات قسەم لەگەڵ بکات، وتی: خەسرەو گیان چۆنی؟

وتم: باشی باوە حاجی گیان.

وتی: ئەرێ ڕۆڵە کەی دەچیت بۆ خاریج؟

کەوای وت هەموو دەستمان کرد بە پێکەنین، وای دەزانی خاریج بەس ئەڵمانیایە!یۆنانی بە خاریج نەدەزانی.

دایکم خێرا ٥٠٠ دۆلاری بۆ حەواڵەکردم بۆ ئەسینا.

دەستم کرد بە کار لەلای کابرایەکی میسری لە ئەسینا قەمسەلەم بۆ هەراج دەکرد لە میسر دەیهێنا، هاوارم دەکرد وەرنەوە وەرنەوە، قەمسەڵەیەك بە دە هەزار دراخما.

ئیلەزۆ، ئیلەزۆ، زێکا کلیاریکی.

هەندێك شتی تریش فێربووم بەو چەند ڕۆژە لە بازار دا جلوبەرگم دەفرۆشت، کارەکەمان وابوو دەڕۆیشتین جلمان وەردەگرت بە بەیانیان و ئێوارانیش تەسلیمان دەکردەوە، هەریەکەمان ٥٠٠٠ دراخمای هەبوو



ڕۆژانە یەکەم ڕۆژ و دووەم ڕۆژ کەمم فرۆشت، سەری سێیەم ڕۆژ دەستم پێکرد زمانم ڕاهات، سەمیر بروای نەکرد نیوەڕۆ چوومەوە داوای ئەوەندەی ترم لێکرد، ڕۆژ بە ڕۆژ باشتر دەبووم وەزعی فرۆشم زیادی کرد، ڕۆژانەکەم چووە ١٠ هەزار دراخما.

سەمیر نەیدەتوانی بڵێ خەسرەو چونکە ناوەکەم قورس بوو بۆیە ناوی نام (شەمس).

سەمیر: شەمس من دەچم بۆ میسر ئەشیا دێنم تۆ دابەشی بکە بەیانی شتومەکەکان و حساب با لای تۆ بێت، ئاگاشت لە شوقەکەم بێت.

سیقەشم لە ڕێگەی خواناسی و نوێژکردن و دەسەت پاکیەوە درووست بوو هیچ ناسیاویەکمان نەبوو، تەنانەت دەمتوانی هەموو شتەکانی بەرم و قسەشی بکردایە ئازارم ئەدا، چونکە هیچی بۆ نەدەکرا، بەڵام هیچ خراپەیەکی لەمن نەدیبوو لە ماوەی رابردوو دا زۆر هاوکاری کردم، منیش ڕێزم دەگرت، بەڵام تا بڵێی داوێن پیس بوو، ئەویش زۆر ڕێزی دەگرتم و کاتی نوێژ هاوکاری دەکردم و جومعان خۆی دەیناردم بۆ مزگەوتی ئامۆنیا و هەمیشە خواردنی حەڵاڵمان دەخوارد بەیەکەوە.

وتم: باشە برۆ بێ خەم بە.

دوو جار چوو بووم بۆماڵیان ماڵەکەی پڕ بوو لە خەڵك، وەك ئاماژەم پێ دا بەیەکەوە نانمان دەخوارد من خواردنی حەڵاڵم دەخوارد ئەویش هەر وابوو، بە دوای حەڵاڵ دا دەگەڕاین.

هەردوو جارەکە لای کچێکم بینی زۆر جوان بوو.

سەمیر: کاتێ تۆ لەوێ دەبی تەنها سێ کەس دێنەوە بۆ شوقەکە.

ماریا خەڵکی ڕۆمانیا بوو، قەرەجە.

ئەگنێشکا، کچێکی ڕووسیە.

کوڕێکی فارس ناوی مەجیدە.

خۆشت لەوێ دەبیت، هەموو ڕۆژێك٢٠.٠٠٠ دراخمایان لێ بستێنە کە دێنەوە، بۆ ماڵەوە.

وتم: باشە!

لە ماوەی ئەو هەفتەیە دا نزیکەی ٦٠٠ هەزار دراخمام لا کۆبوەوە پارەیەکی زۆر زۆر بوو.

شوقەکەی گەورە بوو من چوومە ژوورەکەی خۆی واتا ژووری سەمیر دەخەوتم، مجید لە هۆڵەکە دا دەخەوت دوو کچەکەش لەیەك ژوور دا دەخەوتن.

سەمیر ڕۆیشت و دەستمان کرد بە کاری خۆمان.

ڕۆژانە دەچوومەوە بۆ شوقەکەی سەمیر و پێش من ماریا دەگەڕایەوە سەعات ٥ ئیوارە و من ٦ و ڕوسیەکە ٧ و مەجیدیش ٩.

هەموو خەڵکی ئاسایی بوون، بەس نەمدەزانی بۆ لەوێ دەژین و ئەو پارەیە چییە ئەیدەن.



بەس ماریا زۆر جوان بوو چاو ڕەش، لە خەڵکی وڵاتی خۆمان دەچوو خوێن گەرم، باڵا ڕێك زۆر جوان بوو، ناسك و قژ خاو و درێژ، بە نازومەكر خۆی بائەدا، تۆزێك شێوەی لە دالیا ئەچوو، دیسان هەوای ئیشق لێی دامەوە.

ئەتوانن بڵێن منی شێت كردبوو، كەوتینە قسە و باس و خواس بۆم دەركەوت ئەوانە كار لەگەڵ سەمیر دەكەن كارەكەیان حەواڵە بوو، لە دوایدا بۆم دەركەوت خەریكی كڕین و فرۆشتنی دۆلار و پارەی ترن لە یۆنان زۆر قاچاخ بوو ئەوكاتە.

كڕینی دۆلار و پارەی ڕووسی و ئەلبانی و وڵاتەكانی تر لە بازاڕی ڕەش دا، تەنانەت هەركەس پێوەی بگیرایە ٦ ساڵ زیندانی دەبوو وەك قاچاخچی هەژمار دەكرا.

سەمیر گەڕایەوە حیسابمان كرد ئەو هەفتەیە ٥٠ هەزار دراخمای دایە من، وتم زۆرە نامەوێت لەگەڵ ئەوەش دا دیاری زۆری بۆ هێنابووم لە میسڕ.

هاوڕێیەتیمان خۆش بوو لەگەڵ سەمیر، ڕۆژێك بەیەكەوە قەمسەڵەمان دەفرۆشت.

وتم: سەمیر ماریا زۆر جوانە،

بە پێكەنینەوە وتی: دەستت پێ گەیشت؟

وتم: نا من كاری واناكام، بە تایبەت لەماڵی تۆش دا.

کەچی ئەو بێ قیمەتە ئەیووت بۆ نایکەی لە ماڵی من دا.

وتم: سەمیر من و تۆ موسڵمانین، ئەزانی یارانی موسا بە بسم الله_ لە دەریایەك پەڕینەوە، من و تۆ هەموو قورئانمان ختم کردووە هێشتان لە ناو ئەم قوڕاوە دای؟!

سەمیر تۆزێك ملی بادا و وتی: زۆر حەزم دەکرد برام بوویتایە.

وتم: جا ئێمە هەر براین وامزانی بۆ ئیسلامەتی دەڵێت.

سەمیر وتی: نا برام بویتایە منت بە جێ نەهێشتایە لێرە تەنها خۆمم متمانەم بەکەس نییە و کارەکەمان باشە و لیرە خێر زۆرە.

وتم: من نیازم هەیە بڕۆم بۆ ئەڵبانیا بە داخەوە، ئەرێ وەڵلا بە جێت دێڵم.

سەمیر وتی: شەمس مەڕۆ ماریات ئەدەمێ بۆ خۆت!

وتم: بۆ کڕیوتە؟

وتی: نا بۆت دەکڕم!

هەستم کرد خەریکە وەزعەکە خراپ دەبێت ماوەیەك بەردەوام بووم، لەگەڵی دا.

شەوێکیان سەمیر وتی شەمس دەعوەتی منیت، بردمی بۆ چایەخانە و مەطعەمی ئوم کەلسوم لە یۆنان، نامان خوارد و شیشە میسریمان کێشا و بەرە و ماڵی ئەوان کەوتینە ڕێ.



وتم: سەمیر دەگەیەنم بە پیاسە و دوایی دەڕۆمەوە بۆ لای کاکە عەبەی ماڵتەپە.

سەمیر وتی: حەز دەکەم ئەمشەو لای من بی شەمس.

وتم: باشە!

لە یۆنان کەس نەیدەوت خەسرەو، هەموو دەیان وت شەمس لەسەر زمانی سەمیر، کە چووینەوە ماریاش بانگی دەکردم شەمس، سەمیر دەیزانی ڕۆشتنم نزیکە و من دەڕۆم بۆ ئەلبانیا وەک ڕێزێك گوایە بە ماریای وتوە لەگەڵ من دا بخەوێت ئەو شەوە وەك خۆی بۆی باسکردم تەنها ویستوێتی ئاواتێکی من بێنێتە دی.

تۆزێك دانیشتم بیرەیان هێنا ومنیش نوێژی عیشام نەکردبوو، هەڵسام بڕۆم سوێندی لێ خواردم دانیشم و منی نارده ژوورەکەی خۆی کە دەفتەری حیسابەکەی بۆ بێنم.

کە چووم بەدوای دا دەگەڕام، ئەوەندەم زانی ماریا هات، بەڵام ماریای چیی خەریك بوو باڵ بگرم لە دواوە باوەشی پێ داکردم، چووم بە ئاسمان دا منیش بە هیواشی دەستیم بەردا و لەسەر بێدەکەی واتا سیسەمەکە پاڵکەوت.

خوایە گیان فریام کەویت، توانام نەماوە، ئەوەی من دەمەوێت ئامادەیە، ئەی هاوار چی بکەم.




تانەو تەشەنم لێ مەدەن...من خۆم موعتەریفم بە هەڵەم بۆ ڕسوایی خۆم لە بازاڕ دا..خەریکی دەف ژەنینم.

ئەمەوێت ڕاکەمە دەرەوە دەوری یوسف ببینم، ئەژنۆکانم ناڕوات و داوای ماریا دەکات، هەرچی شەیتانی دنیایە لە دەورم کۆ بۆتەوە و دەڵێن جارێکی تر شتی وات دەست ناکەوێت لە دەست خۆتی نەدەیت.

خوایە فریام کەوە...

بەشێك لە جلەکانی داکەند ئەوەندەی تر جوانی نیشان دام و منی شێت کرد و وروژاندمی.

خوای پەروەردگار لە ڕووی خۆر و مانگ و ئەستێرەکان دا

شەرمەندەم لە مرۆڤ و پەریەکانیش شەرمەندەم

تەنانەت لە ڕووی شەیتانیش شەرمەندەم

چونکە هەموویان لە کارەکانیان پایە دارن تەنها منم کە ناپایە دارم

بمبەخشە ئیلاهی، ناتوانم ئیتر خەریك بوو پەلاماری بدەم.

وتم گەر وەکو یوسفم پێ ناکرێت با بەدەم قسەیەك بکەم، بەڵکو ببێتە حوجەیەك بۆ قیامەت.

وتم: ماریا من نەخۆشی ئایدزم هەیە، ئاساییە؟!



وتم بەڵکو بڕوات نەیە بەلام دا، مارٍیا (دەستی بە پیکەنین کرد) و وتی: شەمس ٣ ساڵە من ئایدزم هەیە.

خوای گەورە فریام کەوت، کەوای وت سوپاس بۆ خوا هۆشم هاتەوە بەرخۆم و لە خۆشی دا هەر ئەمووت.

ترێی عەتەم بوویت کردیانیت بە شەڕاب، تۆ ئەی شەڕاب هەوڵ مەدە ببیتەوە بە ترێ.

هاتمە دەرەوە بە سەمیرم وت: من ئیتر ئیش ناکەم، بەیانی دەڕۆم بۆ ئەلبانیا.

سەمیر توڕە بوو وتی: بۆ شەمس نەخەوت لەگەڵت دا؟

وتم: با، بەس ئەو نەخۆشی ئایدزی هەیە.

کەوام وت سەمیر ئەژنۆی شکا، من هاتمە دەرەوە سوپاس بۆ خوا شەمس بووم خوای گەورە ژیانی ڕوونکردمەوە.




## ئەلبانیا و یاری قومار بۆ ئیتاڵیا:-

لە دوای ئەوەی لەگەڵ قاچاخچیەک دا مامەڵەم کرد بۆ ئەلبانیا و لەوێشەوە بۆ ئیتاڵیا، ئێوارە سەرکەوتم بە پاس لە ئەسینا ڕیکەوتین دوای ٤ کاتژمێر چوومە ئەلبانیا و چوینە شارێك بەناوی فلۆریا، هەڵبەت لە ڕێگەی قاچاخ.

لە وێش بە نیاز بووین بە بەلەم بپەڕینەوە بۆ جێگایەك لە ئیتاڵیا_لیچە، بەلام قاچاخچیەکە بە ناوی (ئازادی سەعەکەلە) پارەی قاچاخچیەکانی ئەلبانیای نەدابوو، ئێمە ١٦ کەس بووین دەست بەسەر کراین لە ئەلبانیا بۆ ماوەی ١٤ ڕۆژ.

ماوەی ئەو ١٤ ڕۆژە لە ماڵێك زیندان بووین لە ئەلبانیا، دوای ئەوەش کە پارەکە نێردرا لە لایەن قاچاخچیەکەوە ١٠ ڕۆژی تر وەستاین بە هۆکاری شەپۆلی زۆری ئاو نەپەڕینەوە بۆ ئیتاڵیا.

ئەو ماوەیە لە ئەلبانیا بووین، چەند کوردێك بەیەکەوە بووین هەندێکیان شەو لە تاو بێ ئیشی تووشی قومار ببوون.

کەسێکیان خاوەنی خێزان بوو بە ناوی کاك ئاراس کە خێزانەکەی و دوو منداڵی لەگەڵ دا بوو، ١٠ وەرەقەی دۆڕاند بوو.

شەو بوو بە شەڕ لە ناو یەکتر دا لە سەر پارە، کوڕێکیان بە ناوی کارزان زۆری کێشا بە سەر و چاوی ئاراس دا پارەیەکی زۆری لێ بردبووەوە.



دەنگە دەنگی ئەوان منیان خەبەر کردەوە، خێزانی ئاراس لە کاتی شەڕەکە دا پەلاماری کارزانی دابوو، ئەویش پاڵێکی نا بە ژنەکەی ئاراس و خستی بەسەر مندا، زۆرم پی ناخۆش بوو تۆزێك تورە بووم و وتم: دەدانیشە هەتیو قومار چییە پیسە، ئەوەندە ئیزعاجن.

شەڕەکە دامرکایەوە، ئاراس کچ و کوڕێکی جوانی هەبوو ئەو ماوەیە لە ئەلبانیا دا بەینم خۆش بوو لەگەڵ ئەو منداڵانە.

چوومە لایان تەماشا دەکەم کاك ئاراس و خێزانەکەی کە ناوی ئاواز خان بوو هەردووکیان دەگرین.

وتم: کاك ئاراس ئەوە بۆ دەگریت؟

وتی: هەرچی پارەمان پێ بوو ئەو کارزانە خوێڕییە لێی بردمەوە.

وتم: خەتای خۆت بوو چۆن لەو کاتە دا ١٠ وەرەقە دەکەیت بە قومار، کاکە خۆت تاوانباری ئەبێ بەرپرسیارێتی هەڵگری.

**ئاواز خان وتی:** کاك خەسرەو ئەو پیاوەی من هەر خوێڕی بووە، ڕاستی کارزان خوێڕی نییە، بەڵکو ئاراس خوێڕییە.

وتم: بۆ خاتری خوا دەنگت نزم بکەوە لە ناو ئەو خەڵکە دا چۆن قسە بە هاوسەرەکەت دەڵێیت ئاوازخان با ئەوەندەی تر سوك نەبێت لەبەر چاوی ئەو گەنجانەی تر دا، دوایی شەخسیەتی نامێنێت، من دەچم قسە لەگەڵ کارزان دەکەم بزانم نیوەی لێ ناسەنمەوە بۆتان.

**ئاواز خان وتی:** مەمنون دەبین کاك خەسرەو گیان.





ئاراس قسەی نەدەکرد وەزعی زۆر ناڕەحەت بوو

چووم بۆ لای کارزان وتم: مامە کارزان ١٠ وەرەقەت بردۆتەوە لە کاك ئاراس، ئەزانم ١٠ی تریشت لە جەماعەت بردۆتەوە، تەکلیفێکت لێ دەکەم پارەکەی کاك ئاراس بدەرەوە خاوەن خێزان و دوو منالّە، قەیچیەکە بیکە بە دیاری دەستیان.

زۆر بێ ئەدەب بوو یەکسەر وتی: دەبا گوو بخوات، کێ وتی قومار بکات.

وتم: مامە کارزان من تەکلیفت لێ دەکەم.

کارزان وتی: مامە خەسرەو کێ لەم وەزعە دا تەکلیف قبوڵ دەکات؟ ئێمە یاریمان کردووە خۆی هاتووە دانیشتووە، بە زۆر بانگمان نەکردووە خۆ منالّ نییە.

بەجێم هێشت زانیم قسەکردن لە گەڵی دا هیچ سودێکی نییە، ناچار ٤٠٠ دۆلارم پێ بوو وتم: ٢٠٠ دۆلار بۆ ئێوە ٢٠٠ دۆلاریش بۆ خۆم.

ئاواز خان وتی: وەڵڵا نایدەیتێ ئەویش دەکات بە قومار، هەڵیگرە بۆ خۆت.

منیش لە ژێرەوە ٢٠٠ دۆلارەکەم دا بە ئاواز خان.

وتم: با پێتان بێت، ئەو ئافرەتە زۆر بە حوورمەت بوو لێی وەرنەگرتم وتی پارەی ترم شاردۆتەوە، خەمت نەبێت خەسرەو گیان.



بەس هەستم کرد راست نییە، تەنها ئافرەتێکی شەرەف بەرز و تەبیعەت قورس بوو.

٤ کەس لەوان شەو دانیشتن قوماریان دەکرد، تەنها من و کوڕێکە کە نویژمان دەکرد.

ئاگام لێبوو کارزان تانە و تەشەری ئەدا لە کاک ئاراس و وتی: لە کوردستان قومارمان کردووە ئەگەر کەسێك پارەی پێ نەبوایە ئەمان وت لە سەر ژنەکەت ئەیکەین.

کە وای وت خەریك بوو جنێوی بدەمێ، بەڵام دەمم بە زیکری خوا بوو زۆر تورە بووم نەشم دەتوانی هیچ بڵێم، چونکە راستە و خۆ قسەی دەکرد.

ئاگام لە ئاراس بوو لای ئێمەی بە جێ هێشت و چوو بۆ لای منداڵەکانی بۆ ژوورێکی تر زۆر بەزەیم پێ دا هاتەوە.

چوومە لای کارزان وتم: کارزان دەزانی کاتی خۆی منیش دەرپێم بە خەڵکێك داکەندووە لەسەر قومار و دەرپێکەشیم لێ بردۆتەوە، بەڵام سوپاس بۆ خوا ئێمە بووین بە پیاو وازمان لە کاری قۆڕ هێناوە.

کارزان وتی: تۆ پیاوی ئەوەنیت، ئەوە عەرز و ئەوە گەز ئەگەر پیاوی یاریکە.

وتم: ئاخە ئەوە کەی ئیشی پیاوە، حەرامە دەنا تۆ جوجکەی.

کارزان وتی: وەرە بزانە ناتکەمە فروج.

وتم: بانق دانێ هەر ریزێك ١٠٠ دۆلار بڕوات، بەیاری ٢١

دەستم کرد بەیاری قومار ٤٠٠ دۆلار شك دەبەم

سەرەتا ٣ ڕیز ڕۆیشت دۆڕاندم لە چوارەم دا هات لە پێنجەم دا زیاتر هات بە دوایەک دا هەموو نەخش بوو، وتم دەرچۆ دام لە بانقەکەی ٧٠٠ دۆلار بوو.

بانقەکەیم برد خۆم دەستم کرد بە تەوزیع تا درەنگانێکی شەو یاریمان کرد ئەمبرد و ئەدۆرام تەنانەت ئاواز خانیش هاتبوو تەماشای دەکردم بەدەم گۆرانییەوە توشی ئەعصابم کردبوو...٣٣ وەرەقەم لێیان بردەوە، هەر لەسەر یاریەکە دا بووم ١٠ وەرەقەکەم دایەوە بە کاك ئاراس لەبەر چاوی کارزان دا وتم ئێمە پیاوین!

کارزان پارەی پێ نەما وتم: لەسەر دەرپێکەت یاری دەکەم.

هەموو دەستیان کرد بە پێکەنین، ئەویش جنێوێکی دا بە من بۆی هەڵسام نەیان هێشت شەڕبکەین، وتم یاریکە.

کارزان وتی: یاری ناکام ماندووم!

وتم: درۆدەکەیت!لاتم کرد هیچت پێ نەماوە

وتی: ئیستاش لە تۆ زیاتر پارەم پێیە.

دیاربوو درۆی دەکرد هیچی پێ نەمابوو، وتم درۆ دەکەیت ٢٣ وەرەقەم پێیە ئێستا هەمووی دەسوتێنم، من پارەی حەڕامم ناخۆم، کەوام



وت هەموویان خەریک بوو شێت دەبوون، جەبار کوڕێکی سلێمانی ٢٠٠ دۆلاری دۆراند بوو بە منی وت غوڵامی قۆنەرەکانتم بیکە بۆ خاتری خوا پارەکەم بدەرەوە مەیسوتێنە، یەکسەر دامەوە پێی.

ئەوەی تر ناوی فەرمان بوو خەڵکی دوکان بوو ١٠٠ دۆلاری دۆراندبوو داوای کردەوە دامەوە بەویش.

تەپڵەکێکی جگەرەم هێنا بیست وەرەقەم دانا لەبەر چاوی کارزان چەرخم نا بە ١٠٠ دۆلارەوە بەس بۆ ئەوەی زەلیلی کەم تا داوای کاتەوە، ئاگام لێبوو عارەقی کرد کەگڕم بەردایە ١٠٠ دۆلاریان جوان سوتا، هەرچی جەماعەت دەیان وت بۆ خاتری خوا مەیسوتێنە وەڵڵاهی گوناهت دەگات، دەچین ئەیدەین بە خواردن بۆ هەموومان.

منیش زوو زوو ئەمووت ئەگەر پارەی ئێوەیە با بتان دەمەوە؟!

هەموویان ئەیان وت نا.

کارزان هەر قسەی نەکرد، دیار بوو زۆر ناڕەحەت بوو ١٠٠ دۆلاری ترم دەرهێنا، ویستم چەرخی پیوە بنێم ئاوازخان وتی کاک خەسرەو بیکە بە خاتری پێڵاوەکانی خۆت مەیسوتێنە و بیدەرەوە بە کاك کارزان.

وتم: کارزان پارەکەت بدەمەوە لەبەر خاتری پێڵاوەکانی ئاواز خان؟

کارزان وتی: خۆت دەزانی!

وتم: دەبڕۆ داوای لێبوردن لە ئاوازخان بکە و ئەوە پارەکەت، یەکسەر ١٩ وەرەقەکەم دایەوە دەستی و وتم بۆ ئەوەی ئەوەندەی تر زەلیلی

نەکەم چپاندم بە گوێی دا چ قسەیەکی قورسی کردبوو، بەرامبەر بە ئاراس و ئاوازخان.

کارزان خێرا هەڵسا چووە لای ئاوازخان داوای لێبوەدنی کرد و وتی خوشکی بەڕێزی منی و دەستی کردە ملی ئاراس_یش.

ئەو شەوە لەبەر چاوی هەمووان دا داوای لێخۆشبوونم لە خواکرد و چوومە سەر بەرماڵ و تەوبەم کرد و دوو ڕکعات نوێژی تەوبەم کرد و دوای نوێژیش ١٠٠ دۆلارم لە گیرفانی خۆم دەرهێنا دام بە کارزان وتم: ئەو ١٠٠ دۆلارە مافی من نەبوو بیسوتێنم، من هەڵە بووم، بەڵام ئەوە ١٠٠ دۆلاکەت.

سەری کارزانم ماچ کرد وتم: ببورە ماما کارزان گیان ئێمە برای یەکین.

هەڵسا وتی: بەشەڕەفم، بەشەڕەفم، بەشەڕەفم نایەتە گیرفانم.

وتم: ئەی هاوار بۆ سوێند بە شەڕەف دەخۆیت، شەرەف سوێندی پێناخورێ.چونکە مامە کارزان زۆر جار شەڕەفی خۆشمان لەسەر قومار دەدۆڕێنین، تەنها با سوێند بە خوا بخۆین کە هەرگیز نامرێت و وە هەمیشە ئاگای لیمانە.

کارزان وتی: خەسرەو بابە وازمان لێبێنە تا ئێستاش باوکم دەرسێکی وای دانە داوم و تەمێی نەکردووم، کاکە ئەوەندە بریندارم مەکە، تەواو پارەم ناوێت، بەخوا زۆر قسە بکەیت خۆم ١٩ وەرەقەکەش دەسوتێنم.



ئەو شەوە کۆتایی هات و ناخۆشترین شەوی من بوو، دوای دوو ڕۆژ چووینە ئیتاڵیا.

وڵاتی ئیتاڵیا ڕیسواتر بوو لە ئەسینا، هەر جێگا نەبوو هوتێل گران تر بوو پارەکەی گیرفانم بەشی چەند ڕۆژێکی دەکرد.

داوای پارەم کرد لەماڵەوە پارەی حازر نەبوو، حەزیشم نەدەکرد زەحمەت بخەمە سەر ماڵەوە، دایکم وتی ئەگەر زۆر زەروور نیت چەند ڕۆژێك بووەستە تا پارەیەك دێتە دەستمان، ئەوکاتەش ١٠٠ دۆلار بە ٢٠٠٠ دیناری سویسری بوو!

منیش برا و خوشکم زۆر بوو نەدەکرا لەبەر خۆم دەستی ئەوان ببەستم.

پارەم پی نەبوو لە ئیتاڵیا، چووم بۆ کرێکاری بە بۆنەی کوڕێکی کوردەوە لە ڕۆما، ٥ ڕۆژ چووم بۆ بارکردنی ئاسن و تەختە بۆ چەند قاتێك.

ئیشم بۆ کابرایەکی مەغریبی دەکرد، دوای ٥ ڕۆژەکەش پارەکەیان نەداینێ دەریان کردین وتیان قسە بکەن دەچین پۆلیستان بۆ بانگ دەکەین، ئێمە زمانمان نەدەزانی پۆلیسیش بهاتبایە دەگیراین و ئازاریان دەداین و لەوانە بوو قسەیەکیشمان بۆ درووست بکەن، دواترش نەمان دەزانی چمان لێ دەکەن.

من ئاسنێکم کێشا بە پشت ئەو مەغریبیەی کە ئیشمان بۆ دەکرد و بە عەرەبی پێم وت: (هذا هو حقي) خستم بە عەرزەکە دا، ڕامکرد و چوومەوە بۆ ڕۆما.

بەڵام ئەوەندە ماندوو بووم تەنانەت خوێنم دادەنا ئەو چەند ڕۆژە، خوای گەورە تۆڵەی زیاتریشیان لێ بستێنێت، هاتمەوە بۆ ناو شار چوومە چایەخانەیەك دانیشتبووم کوڕێکی کرمانج هات وتی: ئیش دەکەیت؟

وتم: دەیکەم، بردمی بۆ ماڵ گواستنەوە.

من و دوو کوڕی تر بووین دوای تەواو بوون کرمانجە هیچ و پوچەکەش بە جێیهێشتین و ڕایکرد، هاتینەوە بۆ ڕۆما.

ئەو ئێوارەیە زۆرم برسی بوو، ماندووم هیچ پارەم پێ نییە، نزیك تەنەکە خۆڵێك بوومەوە، بەڵکو شتێکی تێدا دەربهێنم و بیخۆم بە دزییەوە چوومە لای تەنەکە خۆڵەکە و هەر تەماشام دەکرد، چاوم بە ناو تەنەکە خۆڵەکە دا دەخشاند، دەستم برد شتێك دەربهێنم کوڕێکم بینی ناوی لوقمان بوو هات بۆ لام وتی: مامە خەسرەو چۆنی؟ ئەوە چی دەکەیت لێرە؟

وتم: تۆ تەماشای ئەو هەتیوە ناکەیت چۆن پەیدا بوو لێرە دا.

ناسیمەوە کە لە زیندانی سالۆنیك بەیەکەوە بووین ئەو کوڕە خانەقینییە بوو، لە کاتی شەڕی من و مەئمون لە پشتم وەستا.

لوقمان دووبارە وتی: ئەوە چی دەکەیت لێرە؟

وتم: وەڵڵا چاوەڕێی کوڕێك دەکەم، لە ڕاستیش دا چاوەڕێی کەس نەبووم، لە تەنەکە خۆڵەکە دا بۆ نان دەگەڕام بیخۆم.

لەم قسانە بووین ئەوەندەم زانی ئاراس مێردی ئاوازخان لەوێدا پەیدا بوو، وتی: مامە خەسرەو چی دەکەیت؟ لەگەڵ لوقمان دەستی کرد بە قسە

و وتی ئەم کوڕە ئەو کوڕەیە کە ئاواز بۆی باسکردی پیاوەتییەکی زۆر گەورەی لەگەڵ کردووم.

ئاراس زاوای لوقمان بوو، واتا ئاواز خان خوشکی لوقمان بوو.

لوقمان وتی: چی دەکەیت بڕۆ دەچین بۆ چایەخانەی عەرەبەکان دەعوەتی منی.

وتم: ئاخر چاوەڕێی کوڕێکم دێت بۆ لام، هیچ نەبوو بەس خۆم بادا و خۆم قورس کرد خەریکە دەمرم لە برسان دا، دەستی کرد بە گرفانی دا و بۆ یەکەم جار موبایلم بینی بەدەستی لوقمانەوە.

وتی: تەلەفۆنی بۆ بکە.

وتم: تەلەفۆنی نییە..کێشە نییە دێم لە خزمەتان دام، چووین بۆ ئەوێ بامێ و قۆزیان بۆ بانگ کردم و تێر و پڕ نانمان خوارد سوپاس بۆ خوا، تێرم خوارد.

لوقمان وتی: من لە زیندان بۆم باسنەکردی نەموێرا، بەڵام بۆ زانیاریت من جنسیەی ئەڵمانیم هەیە و خەریکی قاچاخچێتیم لە ئیتاڵیاوە بۆ ئەڵمانیا وەرە بەیەکەوە کار بکەین و تۆش کوڕێکی ئازا و باشی چاونەترسی ئەو ئیشە بە من و تۆ دەکرێت.

لەم قسانە دا بووم کابرایەکی کرمانجم بینی لوقمان_ م بەجێهێشت، چاوم زەوی نەدەبینی، ئەوەندە توڕە بووم لەو سەگبابە و ڕووم کردە کرمانجەکە و یەخەیم گرت.

وتم: ئەو پارەیەم بدەرێ.

وتی: ناتناسم، هەر وتی ناتناسم هەتا توانیم یەك کەلەم کیشا بە دەمیدا پڕم کرد لە خوێن، باش بوو بە شەق ٦٠ لیرەی ئیتاڵیم وەرگرت لە کابرای کرمانجی خوێڕی و وازم لێهێنا.

لوقمان وتی: بۆ ٦٠ لیرە وادەکەیت؟ ٦٠ لیرە چییە، ئەی ئەگەر بگیرێیت سنورداشت دەکەنەوە بەخوا ئێرە خەتەرە.

باسەکەی خۆمم کرد بۆ لوقمان کە هیچ پارەم پێ نییە، ئەوە وەزعەکەمە ٥ ڕۆژ ئیشم کردووە پارەیان نەداومەتێ ئەم کابرایەش بردومی بۆ ئیش هەر پارەی نەداومەتێ.

ئەی چیبکەم مافی خۆشم وەرنەگرمەوە؟ ئەو کاتەی منت بینی لای تەنەکە خۆڵەکەوە بۆ خواردن دەگەڕام!

کە وام وت لوقمان زۆر بێتاقەت بوو بردمی بۆ ئوتێلەکەی خۆی، خۆم شۆرد و جلی سەرتاپای بۆ کڕیم، مۆبایل و ٢٥٠ دۆلاریشی دا پێم.

لوقمان وتی: لێرە نەفەرم بۆ کۆکەرەوە لەم ئوتێلەی منیش بە، من دەیانبەم بۆ ئەڵمانیا، سی سەیارەم هەیە لەگەڵ دوو کوڕی ئیتاڵی شەریکم، تۆش لێرە کۆیانبکەرەوە هەر نەفەری ٥٠٠ دۆلاری لی وەربگرە و ١٠٠ دۆلاریش بۆخۆت.



مۆبایلەکەم دایەوە و ٢٥٠ دۆلارەکەشم بۆ دەرهێنا و وتم: قاچاخچیەتی بە من ناکرێت ئەوە کاری من نییە، خۆشت من باش دەناسی نابمە چەوری کەس.

لەم قسانە دابووین، ئاوازخان خۆی کرد بە ژوور دا، وەك ئەوەی من برای ئەو بم و لوقمان هیچ.

چەندجار وتی بەخوا لە لوقمان خۆشترم دەوێیت، بەردەوام بوو لە قسەکانی و وتی: لە ئەلبانیا شەرەفی منی کڕییەوە دەنا ئەو ئاراس_ە خوێڕییەی میردم ئەیدۆراندم.

عەرزی ئاوازخانم کرد تۆ خوشکی گەورە و ئازیزی منیت بەخوای لوقمانی براشت ئەو مەصلەحەت چییە، من دەڕۆم پارەی جلەکانیش ئەدەمەوە با تۆزێك ئیش بکەم مامە لوقمان گیان.

لوقمان وتی: ئیشی چی باشە ئەگەر کار ناکەیت لەگەڵم وەرە ئەتبەم بۆ ئەڵمانیا ئەم شەو، خۆ ئەتوانم پیاوەتی ئەوەت لەگەڵ بکەم.

وتم: ئەوە قسەی پیاوە، مەمنون دەبم ئەگەر ئەوە بکەیت.

ئاوازخان وتی: لوقمان بیبە و ئەوەی خەسرەو دەیەوێت بۆی بکە.

مەمنونیم دەربڕی بۆ لوقمان.

لوقمان وتی: زۆرباشە سبەی ئێوارە خۆت ئامادەکە ٤ کوڕی ترت لەگەڵ دا دەنێرم یەکی ٥٠٠ دۆلاریان لێوەربگرە و تەکسیەك دێت بە شوێنتان یەکسەر سەرکەون میوشن لە ئەڵمانیا.





وتم: چی بکەم لە پارەکە؟

وتی: ٥٠٠ دۆلار بدە بە شۆفێرەکە و باقیەکەی هەڵبگرە بۆخۆت با پێت بێت.

وتم: نامەوێت بۆچیمە کاکە.

ئاوازخان وتی: ئەوە دیاری خوشکی خۆتە با هەر پێت بێت.

شەو سەرکەوتم خۆم لە پێشەوەی سەیارەکە دانیشم و چواری تریش لە دواوە ٢٠ وەرەقەشم لی وەرگرتن، دوای ٥ وەرەقەم دایە کابرای ئیتاڵی.

پۆلیس لە ئەڵمانیا لە بانۆفی موشین گرتمی واتا وێستگەی میترۆکانی ئەڵمانیا لە ژێر زەوی دا بوو، ئەوبنێشتە و ساردیەی کە پێم بوو نەمساوی بوو.

وتیان تۆ لە نەمساوە هاتوویت سنورداشیان کردمەوە بۆ نەمسا.

## زیندانی نەمسا و ماسی قوتو مار و پەیژە:-

لە دوای ئەوە لە شاری موشن گیرام درامەوە بە نەمسا، بە هۆکاری چەند کەرستەیەکی نەمسایی کە پێم مابوو.

هەر ئەم شەوە چوومە زیندان بۆ بەیانی ناردیانم بۆ زیندانێکی تر پڕ بوو لە جەزائیری و مەغریبی و نەتەوەکانی تر.

ماوەیەك مامەوە کەسم تێدا نەناسی ٥٠ بۆ٦٠ کەس لەم هۆڵەدا بوون، کاتی نویژی نیوەڕۆ ڕووم کردە دیوارەوە بۆ نوێژ کردن، یەکێك لە جەزائیریەکان هات بۆ لام و وتی: قیبلەکەت خوارە راستی بکەرەوە، نوێژم کرد ئەوانیش لەگەڵم دا نوێژیان دابەست کە سەلامم دایەوە ماشاءالله لە دواوە ٢٠ کەس نویژی دەکرد.

کەسێک بە ناوی عەبدولقادر هاتە لام وتی: بۆ گیراویت؟

حاڵ و گوزەرانی خۆمم بۆ ڕونکردەوە.

عەبدولقادر وتی: ئەگەر بێت و خۆت نەخۆش نەخەیت لێرە بەرەو دادگات بەرن ئەوا یەك مانگ حوکوم ئەدرێیت، ئینجا ئەڵێن برۆ داوای ئیقامە بکە.

وتم: ئەی چۆن خۆم نەخۆش بخەم؟ عەیب نییە؟.

وتی: هەوڵ بدە ماسیەکی قوتو هەڵبچڕە با کۆن بێت و بۆگەن بکات، ئەو ڕۆژەی بانگت دەکەن بۆ دادگا پێشتر بیخۆ، بەڵکو نەخۆش بکەویت و تێکت بدات.

کە پشکنینیان بۆ کردی دەزانن گەر نەخۆش بیت هەر هەفتەیەك زیندانی دەکرێیت.

قوتیەك ماسی دامێ و هەڵم پچڕی و خستمە جێگایەك بۆ ئەوەی میکرۆب و ڤایرۆسی باشی بۆ بچێت، دوای سێ ڕۆژ ناوم هاتەوە بۆ دادگا، شەوەکی دەستم کرد بە خواردنی ماسییە بۆگەنەکە!

هەر سەری سەعاتێك عەبدولقادر دەهات ئەی وت: هیچت لێ نەهات؟

وتم: نەوەڵڵا عەیبم نییە!

دوای چەند سەعاتێکی تر عەبدوڵقادر پرسیاری کردەوە، منی ناونا بوو کوردی.

وتی: کوردی عەیبت نییە؟!

وتم: نا هیچ گۆرانکاری ڕووینەداوە.

شەو خەوتم بەیانی بردمیانە دادگا و یەك مانگ حکوم درام!

کە ماوەی ئەم مانگە دا لەگەڵ لیبیەکاندا فێری زمانی عەرەبی بووم، باشترین قوتابخانە بوو بۆ زمانەکەم، هیچ کوردی تێدا نەبوو.



دوای ئازاد بوونم لە ڤییەنا هاتمە دەرەوە ناردیانم بۆ کەمپ، دوای سەعاتێك سەیارەم گرت و هاتمەوە بۆ ئەڵمانیا.

چوومەوە میوشین و دیسانەوە گیرامەوە ناردیانم بۆ کەمپی بایەروت کە ٤ کوردی تێدابوو بەخۆمەوە، لەوێ پڕ بوو لە عەرەب و کۆسۆڤۆیی، شوێنێکی زۆر ناخۆش بوو زیندانی کۆنی نازییەکان بوو کردبوویانە کەمپ.

یەك دوو هەورامی لێ بوون زۆر کوڕی چاك بوون،

بەڵام بۆ من وەك کۆسۆڤی وابوون هەر بە هەورامی قسەیان دەکرد، منیش تەسجیلێکم دۆزیبووەوە چاکم کردەوە بەڵام شریتم پێ نەبوو.

چووم بۆ لای ئەو هەورامیانە وتم: هیچ شریتێکتان لایە؟

ئەوانیش شریتێکی هۆرەی هەورامی و گۆرانی و چەپڵەی هەورامی بێ موسیقایان دامێ و گۆرانی بێژەکە ناوی عوسمان کێمنەیی بوو.

شریتم خستە سەری ئاگاشم لێ نەبوو تەواوی دەنگیم دابووێ بە هۆرە و گۆرانییەکانی عوسمان کێمنەیی، بەرپرسی کەمپەکە و هەرچی کۆسۆڤۆیی و عەرەبە هاتن ئەیان وت توخوا مێشکان تەقی ئەوە چییە دات ناوە، منیش لامبرد.

ماوەیەکی پێ چوو ڕەفزم وەرگرت، شریتی عوسمان کێمنەیم خستەوە سەری هەورامییەکان دابوویانە خۆم، بەرپرسی کەمپەکە هات وتی: ئەو شریتە نافرۆشی.

وتم: با.

وتی: ٢٠٠ مارکت ئەدەمێ بەس بیشکێنە.

وتم: باشە

نەمشکاند و دامەوە بە هەورامییەکان و لە ڕێگەی کوڕێکی گەرەکی خۆمانەوە ناوی چەند خزمێکی خۆمم دۆزییەوە لە نۆرمبێرگ و کەمپم بە جێهێشت، هیچم پێ نەبوو لە نۆرمبێرگ کوردەکان شەڕە چەقۆیان کردبوو لە نیوان یەکێتی و پارتی دا، ئەو دەمە مامە ڕۆستەم لە نۆرمبێرگ بوو.

ڕۆژێك لای مزگەوتی تورکەکانەوە دەگەڕامەوە بۆ جێگایەك پێیان دەووت مارکاووف گیرام، ڕێك مەلەفم ئاشکرابوو کە لە نەمسا گیراوم نەمسا وتی نامەوێت پەنجەمۆری ئیتاڵیای هەیە، ئیتاڵیا وتی نامەوێت پەنجە مۆری یۆنانی هەیە، یۆنان وتی نامەوێت لە تورکیاوە هاتووە.

سواری تەیارەیەکی موحتەرەمیان کردم بۆ یەکەم جار سەرکەوتم بە فرۆکە بۆ تورکیا بە زیندان کراوی.

ناردمیانە ئەنقەرە هەرچۆن بوو لە مطار خۆم دزییەوە نەگیرام سوپاس بۆخوا هاتمە دەروە لە ئەنقەرە بەرەو بیوك چەکمەچە کەوتمە ڕێ بۆ فڕنی سەمونەکەی ماڵی ئایدن ئابێ.

چوومە ئەوێ سەیدا حیلمی هات بۆ لام وتی: ئەوە چییە کەریم نەڕۆشتووی؟

وتم: بەرێوەڵڵا لە ئەڵمانیا سنورداش کرامەتەوە.

زۆری پێ ناخۆش بوو، لە لایان دانیشتم تا ئایدن هاتەوە، ئەویش باوەشی پێ داگردم و خۆشحاڵی خۆی دەربڕی باوکی لەگەڵ بوو من هەر پێم دەووت (دەدە) واتا باپیرە.

کلیلی ژوورەکەی خۆمیان دامەوە، چوومەوە ئەو ژوورە سارد و سڕە، بۆ بەیانیەکەی دەستم کردەوە بەئیشکردن لە تورکیا وەك ژیانی ساڵ وساڵ و شتێک لەمەوبەر.

تەلەفۆنم کرد بۆ دایکم، دوای هەواڵ پرسین و خۆشحاڵی خۆیان دەربڕی و وتیان شکور گەیشتوویتە جێگای خۆت؟

دایکم: لە کوێیت؟

منیش یەك درۆی زلم بۆ کرد: لە ئەڵمانیام!

ئەویش ناوی خزم و کەسوکار بۆ هەڵئەدام لە ئەڵمانیا کێی لێیە و کێی لێنییە، منیش زۆر بەزەییم بە خۆم دا دەهاتەوە.

شەوێکیان خەوم لێنەدەکەوت چوومە دەرەوە بۆ کەنار دەریا لە بویك چەکمەچە.

دەفتەری تەلەفۆنەکەم پێ بوو، تەلەفۆنم کرد بۆ لوقمانی قاچاخچی هاوڕێم.

لوقمان: لە کوێیت؟

وتم: تورکیا.




یەکەم جار وای زانی گاڵتەی پێ دەکەم، دوایی بۆم باسکرد چیم بەسەر هاتووە.

لوقمان: برایەکم لە تورکیایە لەم ڕۆژانە دا دەردەچن بۆ یۆنان لەسەر ئاو بە سەیارەکەی خۆم چاوەڕێیان دەکەم، تۆش لەگەڵ ئەوان وەرە دوو وێنەی خۆشت بگرە لەوێوە بۆم بهێنە، با خێرا پاسپۆرتت بۆ درووست بکەم.

وتم: نەفەری کێن؟

وتی: کوڕێکی ئێرانییە ناوی شەهرامی بەلەمە، ئەدرەسی دامێ تەلەفۆنم داخستەوە.

لەو ماوەیە دا ئایدن وتی: یاسەمین لە ماردینە هەواڵم داوەتێ کە تۆ هاتویتەوە زۆری پێ خۆشە مانگی داهاتوو دێنەوە لەگەڵ عەلی کوڕم لەوێ مەشغولی ئوتێلێکن، لەوانەیە تۆش بچیت بۆ ماردین و یاسەمین وتویەتی بابێتە ئێرە کار بکات.

منیش زۆر قسەم نەکرد بەس بە پیکەنینەوە وتم: لای تۆ کار دەکەم ئایدن ئابێ.

شەهرامی بەلەمم دۆزیەوە، خوایە چیم دی چوومە شوقەکەی یەکێك تلیاك دەکێشێت، یەکێك حەشیش، یەکێکی تر هەموو گیانی خوێنە دووان لەولاوە دەخۆنەوە.

وتم: کامەیە کاك شەهرام؟

یەکێك جیقنی بۆگەن هات بۆلام: من شەهرامم، بزانم چیت دەوێت؟

وتم: خەسرەوم لوقمان ناردومی بۆلای تۆ کە دەردەچین لەگەڵ براکەی دا بۆ سەر ئاو، دەمەوێت کاك شێرزادی برای کاك لوقمان ببینم ئەمانەتم پێیە بۆی.

من نزیکەی دە وەرەقەم پێ بوو، لوقمان وتی ئەگەر پارەت پێیە بیاندەرێ تاکو دەگەیتە لام لەسەر ئاو.

شەهرام: خۆشحاڵم ئاغا خوسرەو ئاغا لوقمان باسی تۆی بۆ کردووم، نۆکەریت دەکەم، فەرموو بیرەیەك قلیانێك چیت دەوێت لە خزمەت دام.

وتم: سوپاس کاك شەهرام گیان، بەڵام کاك شێرزاد لەکوێیە؟

سەیارەیەکی فیاتی پێ بوو خۆی بردمی بۆلای کاك شێرزاد لە شوقەیەکی تر بوون، چوومە لایان و ٨ وەرەقەم دایە شێرزاد وتم لەو جێگایەم و ئەو پارەیەش کاك لوقمانی برات بۆی ناردوویت.

بە شەهرام_یشم وت کەی دەردەچین؟

وتی: شوێنەکەتم پێ بڵێ خۆم دێم بۆ لات و ئاگادارت دەکەمەوە.

هەفتەیەکی پێ چوو بەردەوام کارم دەکرد لای ئایدن ئابێ، بەڵام یەك لیرەم لێ وەرنەگرت.

ئەویش وایدەزانی داوای ناکەم بۆ ئەوەی کۆبێتەوە پێویستم بە پارەیە.




دوای ئەوە ئێوارەیەکیان شەهرام هات بۆلام وتی: ئەمشەو دەردەچین وەرە ئەو جێگایە.

ماڵئاوایم کرد لە حیلمی، بەس هیچم نەووت بە ئایدن.

خەریکی پێچانەوەی کۆڵە پشتێن بووم، ئایدن دای لە دەرگاکەم و هاتە ژوورەکەم، ٥٠٠ دۆلاری دامێ تەوقەی لەگەڵ کردم و ڕۆیشت وابزانم وتی یاسەمین دێتەوە بۆلات بەداخەوە تۆ نابینێت، من باش تێنەگەیشتم، هەر ئەمووت الله ڕازئۆڵسن.

دەرچووم چوومە سەر ئاوی گەورە، لەوێ تەماشا دەکەم شەهرام لەگەڵ کوڕێکی تری فارس دا لە پەنای دارێک دا ڕادەبوێرن، نەمزانی چی بکەم چوومەوە بۆلای شێرزاد و وتم:شتێکی وا بووە دەمەوێت لەو هەتیوە پیسە بەم.

شێرزاد: کاکە تۆ هەقت نەبێت، ئێمە ئیلاقەمان چییە هەرچووینە ئەوبەر لەمان جیادەبینەوە.

بەلەم ئامادە کرا ویستیان ژنەکەی شێرزاد بەرنە ئەوبەر بەتەنها و شێرزاد بمێنێت، قبوڵم نەکرد.

شێرزاد: ئاساییە!

وتم: ئاسایی نییە کاکە یان لەگەڵ خۆت دا دەیبەیت یان نابێت.

پەڕینەوە لوقمان چاوەڕێمان بوو سواری سەیارە بووین و یەکسەر بۆ بولغاریا و ڕۆمانیا دایبەزاندم چووم پەنجە مۆری پێ کردم لە دوکانێک دا



و خستیه سەر پاسەپۆرتەکەم و پاسەپۆرتی دامێ بە قسەی خۆش دوو ڕۆژ بە ڕێگاوە بووین بە ئیسراحەت تا گەیشتینەوە سلۆڤاکیا و هەنگاریا و چیك و پاشان ئەڵمانیا و لەوێوە منی سواری سەیارەیەکی دیکە کرد بۆ نەرویج و ٨٠٠ دۆلاکەشی دامەوە...

هاتمە ولاتی نەرویج خۆم تەسلیم کرد.

ئەوەی کە منی ناڕەحەت کرد ئەوە بوو دوای دوو ساڵ بیستم کە لوقمان لە یۆنان لە شاری ئەسینا بە چەقۆ کوژراوە.

نەرویج بۆمن وڵاتێکی نوێ بوو، لە هەمان کات دا نامۆ بوو، دوای چەند ڕۆژێك بردیانین بۆ شارێك بە ناوی هامەرفێست کە لوتکەی جیهان بوو، شەو و ڕۆژ تیایدا یەکسان بوو، لە هاوینەکەی دا، نیوەی شەو ڕۆژ بە ئاسمانەوە بوو، لە زستان دا هەر شەو بوو.

ئەی خوایە کە بێزار بووم، چۆن لەگەڵ ئەو ژیانە نوێیە دا هەڵبکەین و چی ڕووئەدات و چی دێتە پێشەوە؟

# چیرۆکی یانزەیەم
## (ژیانێکی نوێ و نەرویج و سەرەتای چالاکییەکان)

لە دوای گەڕانێکی زۆرم بە جیهان دا و تێڕامانم بە هەموو ئەو کۆمەڵگایانەی کە پێیاندا تێپەڕیوم و ورد بوونەوەم لە ژینگە و کەش و هەوای ئەو جێگایانە، لە هەمان کات دا ئەو هەست و ناخۆشیەی کە کوردەکان لە دەرەوەی وڵات تێیدا دەژیان.

دووری لە وڵات و لە کەسوکار هەموو ئەمانە کاریگەرییەکی یەکجار زۆریان خستبووە سەر خودی خۆم و پەیوەندیەکانیشم.

زۆر کات دوو کەسایەتیم لە خۆم دا بەدی دەکرد، واتا کەسایەتییەکی دوو جەمسەرم هەبوو لە زانستی دەروونی دا پێی دەوترێت دەروون پارسۆیی یاخود دوو جەمسەری.

کەسایەتی یەکەم: زۆر ناسك بوو لە کاتی جوڵاندنی هەست و سۆزم بەکارێکی زۆر بێ بایەخ فرمێسك لە چاوانم دا ڕێژنەی دەکرد.

کەسایەتی دووەم: زۆر دڵ ڕەق زۆر بێ بەزەیی زۆر جار لەسەر پارچە نانێك لە زیندانی ئەو وڵاتانەی پێیدا تێپەڕیبووم دەم کردە شەڕە چەقۆ.

لەو کاتانە دا زۆر کەسێکی دڵ ڕەق بووم، هەموو ئەمانە و جێگربوونم لەو وڵاتەی کە تێیدا نیشتەجێ بووم، نەزانینی زمانی ئەو وڵاتە و دوور




خستنەوەم بۆ شارێکی بچووك و تێکەڵ نەبوونم لەگەڵ خەڵکی دا ئەمەش کاریگەریەکی زۆری هەبوو لە سەرم.

جاری واهەبوو شەوان لەبەر تەنهایی فرمێسك لە چاوەکانم دا گۆمیان درووست دەکرد، زۆر جار ڕووباری گریان بە چاوانم دا دەریان دەکرد لەسەر کوڵمەکانم ڕێچکەی گرتبوو بێ لەوەی بەدەم گریانەوە بیرەکانی خۆم دادەمرکاندەوە.

تا ماوەیەکی زۆر بەم شێوەیە مامەوە، بەڵام بێزاری زیاتر تەنگی پێ هەڵدەچنیم.

لە دوای دا هەر لەم شارە خولێکی زمانی ئەو وڵاتە کرایەوە منیش بەژدار بووم.

تۆزێک سەبووری بە دڵ و دەروونما دا هات، بۆ ماوەی ساڵێك بەردەوام بووم زۆر بەسوود بوو توانیم سەرەتایەکی باش فێربم.

وردە وردە لەگەڵ بەکارهێنانی وشەکانی توانیم لەگەڵ خەڵکی دا بکەومە گفتوگۆ.

لە هەموو ناخۆشتر ئەوە بوو ئەو جێگایە زۆربەی کاتەکانی شەو بوو یان ڕۆژ واتا هاوین لە نیوەی شەو دا ڕۆژ بەسەرمانەوە بوو وەک نیوەڕۆ، لە زستانیش دا خۆر هەڵنەدەهات، لە نیوەڕۆ دا ئەستێرە بە ئاسمانەوە بوو.

ئەو کەشە زیاتر باری دەروونیمی ئاڵۆزتر کردبوو زۆر نامۆ بوو بەلامەوە، هەنێ پەیوەندیم لەگەڵ خەڵکە پەنابەرەکان دا درووستکرد بوو وەك کورد و عەرەب و هەندێك نەتەوەی تردا.

ئێوارەیەك ماسییەکی زۆرم ڕاو کردبوو زۆر حەزم لە ماسی بوو بە برژاوی لەگەڵ لیمۆ و تەماتە و پیاز....هتد، بێ ئێوە ناخۆش گەڕامەوە باڵەخانەی پەنابەرەکان کە خۆشم هەر لەوێ دەژیام.

هەرگیز پێم خۆش نەبوو بە تەنها خواردن ئامادە بکەم هەر لەبەر ئەوە پیاوێکی بە تەمەنمان لەگەڵ دا بووخەڵکی بەغداد بوو لە هەمان کات دا کەسایەتییەکی بەهێزی هەبوو لەناو هەموو پەنابەرەکان دا وە پێشتر لە بەغدا پزیشك بوو.

زۆر ڕێزی لەمن دەگرت زۆرجار لەبەر ئەوەی زمانی ئینگلیزی باش بوو یارمەتی منی دەدا لە کاروباری ڕۆژانەم لەو وڵاتە ئەویشم بانگێشت کرد و دانیشتین بەیەکەوە دەستمان کرد بە ماسی خواردن، کەوتینە باسی گێرانەوەی وڵاتی خۆمان و جار و باریش گلەییمان لە بەختی خۆمان دەکرد.

لەم گفتوگۆ و ئاڵوگۆڕکردنی بیروباوڕ و ئەو وشانە دابووین لە ناکاو بە هێمنی لە دەرگای ژوورەکەی من درا و منیش هاوارم کرد فەرموو، لەبەر ئەوەی دەرگای ژوورەکەم دانەخستبوو بەڵام جارێکی تر هەر لەدەرگاکە درایەوە، کە بەرەو ڕووی دەرگاکە چووم سێ ئافرەتی نەرویجی لەگەڵ پیاوێك لەبەر دەمی دەرگای ژوورەکەی من دا بوون داوایان لە من کرد کە بێنە ژوورەوە منیش وتم بە خۆشحاڵییەوە فەرموون.

لە ڕاستی دا من زۆرم پێ خۆش بوو بۆ یەکەم جار بوو خەڵکی ئەو وڵاتە بێنە لام.

منیش کەسێکی کۆمەڵایەتی بووم زۆر حەزم بە تێکەڵ بوونی خەڵك بوو، لە دوای خۆناساندنیان بە من و پزیشکەکەی هاوڕێم کەوتنە پرسیار لێمان کە خەڵکی کام وڵاتن و هەندێ وتە و باس، پیاوەکە ڕووی کردە من و پێی وتم ڕۆژی شەمە کاتژمێر پێنجی ئێوارە بانگێشتن بۆ کلێسای (ئەنطۆنیۆ) لەوێ سەیری فیلمێك دەکەن و پاشان هەندێ کێك و چا بەیەکەوە دەخۆین.

ڕووم کردە پزیشکەکەی هاوڕێم وتم: دەڵێ چی؟

پێی وتم کە کابرا دەڵێ چی و وتیشی، خۆ ئێمە بێ کارین با بڕۆین کارمان چییە کات بە سەر دەبەین و هەرندێ کێك دەخۆین دەڵێی چی؟

وتم: باشە بێ کارین بابڕۆین من پێم خۆشدەبێت.

کە ئێمە ڕەزامەندی خۆمانمان نیشان دا ئیتر ئەوانیش ڕۆیشتن.

من و پزیشکەکەی هاوڕێم هاتینە دەرەوە چوینە لای پەنابەرەکانی تر ویستمان بەوان بڵێین، دیار بوو ئەوان پێش ئێمە بانگهێشتکرا بوون.

لەویا بۆمان دەرکەوت کە ئێمە دواین کەس بووین، چاوەڕێ بووین تا ڕۆژی دیاری کراو لە بەردەم باڵەخانەی پەنابەرەکان دا هەموو پەنابەرەکان خۆیان ئامادەکردبوو، هەندێکیان وا خۆیان گۆڕی بوو وایان دەزانی بۆ ئاهەنگ دەچن.

له ئافرەتێکی کوردم پرسی: ئەوە بۆ وا خۆت گۆڕیوە و جلی کوردیت لە بەردایە؟

وتی: کوڕە با تۆزێ هەڵپەڕم خۆ دڵم شەقی برد لەم کەمپە دا!

وتم: ئێمە بۆ ئاهانگ ناچین کەس هەڵناپەڕێت ئەوە کڵێسایە و جێگایەکی ئایینیە.

وتی: بۆ ئاخوندن؟

دیاربوو لە ئاخوند ڕایکردبوو، هەر لەو کاتە دا پەشیمان بوو، وتی من حەزم پێی نییە وام زانی هەڵدەپەڕین.

بۆم باسکرد کە ئەمانە ئاینێکی جیاوازن و لەوانە نین کە تۆ بیری لێ دەکەیتەوە.

دیار بوو بە تەواوی پەشیمان بووەوە چونکە ئەو خۆی بۆ هەڵپەڕکێ ئامادە کردبوو، بەڵام بە داخەوە ئاواتەکەی نەهاتە دی.

لە دوای چاوەڕوانیمان لەبەردەم باڵەخانەکە دا پاسێك ئامادە بوو تا هەموو پەنابەرەکان سەرکەوتن، بەرەو کەڵێسای (ئەنطۆنۆ) بەڕێکەوتین.

کە گەیشتینە جیگای مەبەست لە دوای پێشوازیکردنێکی گەرم، فلیمی عیسای کوڕی مەریەمیان بۆ لێدان، لە دوای تەماشاکردنی فلیمەکە کە دوو کاتژمێری خایەند، کەمێك دانیشتین و دەستمان کرد بە کێك خواردن و چا خواردنەوە..




لە دوایدا کەسێك بە ناوی سیامەك خەڵکی ئەهوازی ئێران بوو، ئەیتوانی بە زمانی فارسی و عەرەبی و ئینگلیزی و زمانی نەرویجیش قسەکە، لە پاشان دا قەشەی کڵیساکە داوای لێ کردین چی سەرنج و تێبینییەکمان هەیە دەربارەی فلیمەکەی عیسا بە ئازادی دەری ببڕین.

## ناو کڵێسا و دۆزینەوەی مامۆستاکەم عیماد:-

لە کڵێساکە دا تەماشای فلیمەکەی عیسامان کرد، دوای ئەوە چا و کێك خورایەوە یەکێك داوای کرد لە ئامادەبووان کە ببنە گاور.

زۆر لەوانە بە ئاسانی وڵامی بانگەشەکەی (تۆماس)یان دایەوە کە قەشە بوو لەو کلێسایە دا ٣ لە کوردەکان بوون بە مەسەحی، یەکێك لە وانە خەڵکی سلێمانی بوو ناسرا بوو بە جەزای زەڕەنگەر لەگەڵ چەند کەسێکی تر کە نەمدەزانی خەڵکی کام وڵاتن بەهەرحاڵ زۆرم بەلاوە سەیر بوو نەمزانی بوو کە گۆڕینی بیروباوڕ هەروا ئاسانە.

ئەو دەمە زانستی وام نەبوو لەسەر ئایینی نەسرانی، بەڵکو زانیاری سادەم هەبوو، ئەوانەشی کە هاتبوون تەنها بە ناو موسڵمان بوون، هەموو زانیاری زۆر سەرەتاییان هەبوو لەسەر ئیسلام، بەڵام زۆربەیان بڕوایان هەبوو کە هەموو ئایینەکان لە لایەن کەسێکەوە نێردراوە و بە یەك چاو سەیری هەموو پێغەمبەرانیان دەکرد محەممەد (دروودی خوای لێبێت) لە هەموویان خۆشەویست تر بوو بەلایانەوە.

هەندێکیشیان ئەوەندە شارەزابوون کە خاوەنی ئایینی ئیسلامن، ناکرێت هەروا بە ئاسانی واز لە دیینی دایک و باوک و کەسوکارم بهێنم.

ئەو خەڵکەش یەکجار بەو شێوەیە نەبوون کە هەر کەس وتی فکری خۆتانم بدەرێ ئەوانیش بڵێن بەسەر چاو!ئەو کارە زۆر گران بوو بەلایانەوە، یەکێك لە تەنیشتم وتی ئەرێ کاکە بۆ دەبێت هەمیشە ئەوان




ڕاست بن ئێمەش هەڵە، من وەك موسڵمانێکی سادە بەو بانگهێشتە ڕازی نابم، وەڵا عەیبە ئەو خەڵکە دینی خۆی بگۆڕێت بۆ کێك و شەربەت.

هاتە سەڕەی من کە ببمە گاور، منیش تەنها سوپاسم کرد بۆ کێکەکە و وتم موسڵمانم هاتمە دەرەوە.

بەڵام زۆرم پێ ناخۆش بوو کە ئەو موسڵمانانە بوون بە مەسیحی وە زۆر ئاستەم بوو بەلامەوە، بەڵام چار نەبوو مرۆڤ ئازادە وە ئەشم زانی کە ئەو جەزای زەڕەنگرە کەسێکی سوکە، کوڕێکی ڕانییەم لەگەڵ دابوو ناوی کاك محەممەد بوو پێی وتم لە ماڵی شێخ عوسمانی بیارە لە ئەستەنبوڵ ئەم جەزایە بەیانیان بۆ نوێژی بەیانی خەڵکی ئاگادار دەکردەوە کە گەیشتە یۆنان هەر لەو جێگایەش ماستاو و چەوریی بۆ قاچاخچیەکان دەکرد، کە کاك محەممەد ئەوەی بۆ باسکردم ئیتر زۆر بەلامەوە گرینگ نەبوو دیار بوو کەسێکی بودەڵە و سوك و کەم کەسایەتی بوو.

من لەگەڵ کاك محەممەد لە دەرەوەی کڵێساکە وەستابووین گفتوگۆمان دەکرد، تۆماس لەگەڵ ئافرەتێکی تەمەن ٢٦ ساڵ کە ناوی _یەنیکا_ بوو لەگەڵ ئاغای ئێرانی سیامەك هاتنە لای من و کاك محەممەد، دوای سڵاو پێیان وتین بۆ نابن بە مەسیحی من بێ دەنگ بووم، بەڵام کاك محەممەد وتی ئەوە شتێکی پێویستە بیری لێ بکەینەوە، منیش لەسەر دڵم گەورە بوو بە زەردەخەنەیەکەوە وتم: ئەی ئێوە بۆ نابن بە موسڵمان؟!

دەستیان کرد بە پێکەنین و تۆماس دەستی خستە سەر شانی من پێی وتم: بە ناوی باوکی ئاسمان قسەت لەگەڵ دەکەم من واهەست دەکەم تۆ کەسێکی زۆر باشیت خوا دەیەوێت پاکت بکاتەوە، ئێستا ئەوانم لە



ژوورەوە بە ئاو پاككردەوە واتا مەسحم كردن پێم خۆشە تۆش لەو كەسانە بیت كە عیسا خۆی لە خاچ دا لەبەر تاوانەكانمان داوات لێ دەكەم با دڵ و دەروونت پاك بێتەوە خۆت بكە بە ناو دەریایی ئیمان دا لە ناو مەسیحیەت دا.

زۆر شەرم گرتمی لەوەی زۆر بە ئەدەبەوە وشەكانی دا بەگوێم دا و نەیهێشت كە من هیچ وڵامێك بدەمەوە پاشان بەوە وازیان نەهێنا بەدەم قسەكردنەوە منیان بردەوە ناو كڵێساكە بردمیە بەردەم تابلۆیەكی بە ناو مەریەم كە بەخەیاڵ درووست كرابوو باسی مەریەم و عیسا و باوكی بۆ دەكردم كە هەرسێكیان خوایان پێك هێناوە، لەو كاتە دا منیش داوای كاتم لێ كردن.

وتم: من هیچ زانیارییەكم نییە لە بارەی ئایینی مەسیحیەوە، پێویستم بە سەرچاوە هەیە بۆ وەرگرتنی زانیاری لە ئایینەكەتان.

لە هەمان كات دا ویستم لەو پەنجەرەوە خۆم دەرباز بكەم وە سەرەنجی ڕابكێشم بۆ لای خۆم وتم ئەگەر دەكرێت هەندێك سەرچاوەی مەسیحیم بۆ پەیدا بكە تا بتوانم سەرنجی خۆمم هەبێت و كوێرانە دوای نەكەوم ئەگەر هەر بیروباوڕێك هەڵبژێرم لە هەمان كات دا كاری بۆ دەكەم.

دیاربوو وتەكانی من سەرنجی ڕاكێشا و وتی تۆ فلیمی ژیانی عیسات بینی ئەوە بەس نییە؟!




دیاربوو پێی وابوو منیش وەك پەنابەرەکانی تر هەروا بەئاسانی بیروباوڕم خۆم دەخەمە دەستی ئەو بۆیە من هەر سور بووم لەسەر پێشنیارەکەی خۆم کە کاتم پێ ویستە.

تۆماس: باشە من هەوڵ دەدەم هەندێك سەرچاوەت بۆ پەیدا بکەم بە زمانی عەرەبی یان کوردی.

زۆر سوپاسم کرد و هاتمە دەرەوە، بەڵام هەر خۆ دەربازکردن بوو لە تۆماس.

بەپەلە خۆم گەیاندە کاك محەممەد پێم وت: ئەمانە دەڵێن بنێشتە تاڵن لە کەس نابنەوە، ئەی تۆ چیت لێ بەسەرهات بۆم باس بکە؟

بۆی باسکردم کە بەهەمان شێوەی من خۆی دەرباز کردووە و داوای کاتی لێکردوون و لە پرسیار و داواکانیان وتی داوام لێ کردن کە کاتێکی تر فلیمەکەی عیسا ببینمەوە بۆ ئەوەی باشتر تێبگەم لەو ئایینە، ئەوانیش ڕازی بوون بەداواکام.

بە هەرجۆرێك بوو گەڕاینەوە بۆ باڵەخانەکەی کەلێی دەژیاین، جەزای زەڕەنگر لە ناو پاسەکە دا لە لای منەوە دانیشت بوو.

وتم: ئەوە بۆ بوویت بە گاور؟

جەزا: ئاخر بۆ ئیقامەکەم باشە.

پرسیاری ترم لێ نەکرد زۆر گرینگ نەبوو بەلامەوە.



له دوای چەند هەفتەیەك هەت لە هەمان كات دا هاتنەوەلای من هەندێك پەرتوك و ئینجیلیان بە زمانی عەرەبی بۆ هێنابووم.

پێیان وتم لە دوای خوێندنەوەی تكایە سەرنج و تێبینی خۆتمان پێ بلێ.

وتم: بە گوێرەی توانای خۆم بەسەرچاو ئاگادارتان دەكەمەوە.

بەڵام ئەو ئێوارەیە یەنیكا لەگەڵ تۆماس لای من مانەوە زۆر پرسیاری تایبەت بە خۆمیان كرد، كە ڕاستی دا منیش ترس گرتمی گومانی ئەوەم بوو كە ئەمانە پۆلیسی نەهێنی بن منیش زۆر پاشەڵم پیس بوو، پەنجە مۆری زۆربەی زۆری وڵاتەكانم ئەوروپام هەبوو.

لە هەمان كات دا لەوە دەترسام كە پێم بزانن بمگەڕێننەوە، هەر چۆن بوو كات ڕابورد.

لە راستیدا من توانای خویندنەوەی پەرتوكەكان و ئینجیلەكەم نەبوو، زۆر گرنگ نەبوو بەلامەوە چونكە من بەدوای وەرگیران و بەدەست هێنانی هەندێك پارە بووم بۆ ئەوەی بینێرمەوە بۆ كەسوكارم وە بتوانم ژیانێك بۆ خۆم دابین بكەم، ئیسلامەتی خۆشم خۆش دەویست.

لە دوای دوو ساڵ دەربەدەری خاوەنی هیچ نەبووم هەمیشە وەك قەرەج ئەو وڵات و ئەو وڵاتم دەكرد، ژیانی من تەنها گەڕان بوو بە دوای درووست كردنی ژیانێك بۆ خۆم و هاوكاری كەسوكارەكەم بكەم لە بەرئەوەی لە وڵاتی خۆمان زۆرجار هەژاری و دەوڵەمەندی و كەمدەستیم بە خۆمەوە بینی بوو.

ئێوارەیەکی هاوین بوو زۆر بێزار بووم تەنهایم کردبووە هاوڕێم پێم وت: با پێکەوە پیاسەیەك بکەین بە یادی جارانی شارەکەم، لە سەنتەری ئەو شارەی کە تیایدا نیشتە جێ بووم دەسوڕامەوە لەسەر کورسییەکی ئەو بازاڕە ئارامم گرت.

لە ناو ئۆتۆمبێلێك دا ئافرەتێك بانگی کردم خەسرەو، کە نزیك بوومەوە یەنیکا بوو، پرسی پێت خۆشە پیاسەیەك بکەین؟

وتم: نا ببورە چاوەڕوانی هاوڕێکەمم لێرەدا یەکتری ببینین.

لە ڕاستی دا بێزار بووم لە تۆماس و یەنیکا و کلێسا هەر ئارەزوومەند بووم بەوەی وازم لێ بهێنن، بەجێی هێشتم و ڕۆیشت.

لەگەڵ خۆم دا کەوتمە گفتوگۆ، گەنجێك هاتە لام و بە زمانی ئینگلیزی پرسی: ئەو جێگایەی کە پەنابەرەکانی لێ نیشتەجێن لە کوێیە؟

من لەم شارە دا تازەم، تازە گەیشتوم ئەگەر دەکرێت یارمەتیم بدە.

لێم پرسی خەڵکی کام وڵاتی؟

وتی: تونس.

بە عەرەبی کەوتمە وتوێژ لەگەڵی دا پێم وت کە منیش لەوێ دەژیم، دیار بوو زۆر خۆشحاڵ بوو کە کەسێکی ناسیوە بە زمانی خۆی ئاخافتن بکات.

یارمەتیم دا هەندێك لە كۆڵ و بارەكەیم بۆ هەڵگرت و بەرەو جێگای مەبەست كەوتینە ڕێ، هەر لەوێ لەگەڵ پرسگەكە دا كەوتە وتووێژ و ژوورێكیان بۆ دەست نیشان كرد.

من هەر لەگەڵی دا بووم كەلوپەلەكەیم لەگەڵ هەڵگرت.

داوام لێ كرد كە پاش حەسانەوەت وەرە لای من خواردن ئامادە دەكەم بەیەكەوە نانێك بخۆین.

ئەوەندەی تر خۆشحاڵ بوو، گەڕامەوە دەستم كرد بە خواردن ئامادەكردن لە دوای چەند كاتژمێرێك چوومەوە بۆ لای و بانگێشتم كرد وە زۆربەی پەنابەرەكانم ئاگادار كردەوە بۆ ئەوەی كەمێك لە ئازاری نامۆیی ئەو گەنجە كەم بكەینەوە، ئەوانیش بەخێرهاتنێكی گەرمیان لێ كرد.

ئەویش خۆی ناساند كە ناوی عیمادە، خەڵكی تونسە تا درەنگانێك بەیەكەوە بووین هەر خەریكی گفتوگۆ و ئاڵوگۆڕی بیروڕا بووین، عیماد كوڕێكی زۆر وتوێژ شیرین بوو، خاوەنی زانیارییەكی زۆر باش بوو، بەڕاستی منی سەرسامكرد بوو بە زانیارییەكانی.

لەسەر مێزی چەرپاكەم ئینجیلەكەی بینی وتی: تۆ مەسیحی؟

وتم: نەخێر، من موسڵمانم سوپاس بۆ خوا.

عیماد: سوپاس بۆ خوا.

وتم: ئەو پرسیارەت تەنها لەبەر ئەوەیە كە ئەو ئینجیلە لەم ژوورەدایە.

کاك عیماد: ڕاستە ئینجیل لای خوای پەروەردگارەوە هاتووە بۆ پێغەمبەر عیسا سڵاوی خوای گەورەی لێ بێت، بانگەوازی بۆ کردووە، بەڵام ئیستا ئەو ئایینە دەستکاری کراوە و گۆڕاوە، ئارەزوو و ویستی پیاوانی کڵێسای تیادا تێکەڵاو بووە.

منیش باسەکەم بۆ کرد کە چۆن ئەم ئینجیلەم دەستکەوتووە تا بیخوێنمەوە ئەو کۆمەڵە کە لێرە خاوەنی بەڕێوەبردنی کڵێسای ئەم شارەن چاوەڕوانی بە گاوربوونی منن، بۆیە ئەو پەرتوکانەیان بۆ هێناوم، بەڵام سوپاس بۆخوا بیروباوەڕ دامەزراوم و شوێن شتی کوێرانە ناکەوم.

کاك عیماد دەستی خستە سەرشانم و وتی: تۆ نەوەی سەلاحەددینی ئەیوبیت خوای گەورە لێی ڕازیبێت ئەو داکۆکی کردووە لە خاکی موسڵمانان و لە ژێر دەستی گاورەکانی سەندەوە، تۆ ئەگەر باپیرە گەورەت خزمەتی ئیسلامی بەو شێوەیە کردبێت دەبێت تۆش هەروا بیربکەیتەوە، نابێت ڕێگاکەی فەرامۆش بکەیت.

منیش سەرێکم بۆ بادا و وشەیەکی دووبارە کراوەم بیستبوو کە گوایە سەلاحەدینی ئەیوبی هیچی بۆ کورد نەکردووە زۆر گرینگ نییە بەلامەوە، هەرچەندە ئەوە بڕوای خۆم نەبوو قسەی لاوەکانی ناو کۆمەڵگاکەم بوو دووبارەم کردەوە، زۆری پێ ناخۆش بوو کە ئەو وتەیەم پێ وت.

وتی: راستە سەلاحەدین کورد بوو، بەڵام ئەو نە بۆ عەرەب کاری کردووە نەبۆ فارس و نەبۆ کورد، بەڵکو سەرکردەیەکی موسڵمان و کورد بووە، جڵەوی موسڵمانان لە ژێر دەستی ئەو دابووە.



هەموو موسڵمانان و عەرەب و عەجەم و مەسیحی لە ژێر ڕکێفی ئەو دابوون با من پرسیارەکەت بۆ ڕاست بکەمەوە.

سەڵاحەدین موسڵمانێکی کورد بوو ئەو دەسەڵاتی تەواوی بەسەر هەموو وڵاتانی عەرەب و موسڵمانان بە گشتی دا هەبوو، واتا کورد حوکمی کردووە ئەگەر نەتەوەیی بیر دەکەیتەوە، هەرچەندە ئەو وەك موسڵمانێك کاری کردووە، بەڵام خاچ پەرستەکان دەیانەوێت لەبەر چاوی ئێوەی کورد لە شان و شەوکەتی ئەو کەم بکەنەوە تا ئێوەی کورد شانازی بەو کەڵە سەرکردەوە نەکەن کە کورد خاوەنی سەرکردەیەکی وا قارەمان و بە ئەمەکی موسڵمانانە.

لە ڕاستی دا گاور و بێ باوڕەکان دەیانەوێت لە ناو ئێوەی کورد دا سەرکردەی وا قارەمان درووست نەبێتەوە، چونکە ئەو شکستەی کە بە دەست سەلاحەدین بینیویانە هەرگیز لە بیریان ناچێتەوە.

ئێستا لە هەموو مێژووەکانی خۆیان دا باسی دەکەن پێوەی دەناڵێنن، خۆ ئەگەر شەڕی نێوان فەڕەنسا و فەڵەستین بوایە یان شەڕی نێوان سوریا و ئیتاڵیا بوایە یان کوردستان و یۆنان بوایە دڵنیابە کە سەلاحەدین ئەوکاتە بۆ نەتەوەی خۆی دەجەنگا و بە ناوی کورد ئاڵای بەرز دەکردەوە، بەڵام عەرەب، تورك، فارس و کورد هەموو موسڵمان بوون، کوردێکی موسڵمان سەرپەرشتی دەکردن ئەو سەردەمە نەتەوە هیچ بایەخێکی نەبووە لە ژێر ناوی ئومەتی ئیسلامی کاریان دەکرد، ئەوان بە ناوی خاچ پەرستەکان لەگەڵیان دەجەنگان خۆ زۆربەی خاچ پەرستەکانیش خەڵکی وڵاتی جیاواز بوون کە بریتی بوون لە: فەرەنسا و ئیتاڵیا و...هتد لە ژێر ناوی خاچ پەرستەکان دەجەنگان تا سەلاحەدین تێکوپێکی شکاندن.




لە دوای بیرکردنەوە لەو وشانەی کە عیماد بۆی ڕوون کردمەوە زۆر دڵخۆش بوو هەستم کرد کە منی کورد کەم نیم و خاوەنی سەرکردەیەکی بە ئەمەك و قارەمانم وە خۆشەویستی لە دڵم دا زیاتر چەسپی، لە راستی دا وتەکانی عیماد هەموو ئەقڵانی بوون.

ئینجا تێگەیشتم دابەشکردنی وڵاتی من هەروا بێ هۆ نەبووە، دیارە نایانەوێت سەلاحەدینێکی تر دروست بێتەوە بۆیە هەر ژێر دەستەین.

لە پاشان دا عیماد درێژەی دا بە گفتوگۆکە و بەردەوام باسی چاکە و پیاوەتی کورد و باسی ئەبوبەکری باقەڵانی بۆ کردم و باسی ئیبنو تەیمەی بۆکردم و باسی سینانی فوراتی ئەسەدی بۆ کردم و باسی جەزەری و محیدین ڕەئیس و زۆری تر، کە ئەوانە هەموو زانا و ناوداری کورد بوون.

لە ڕاستی دا بۆ یەکەمجار بوو باسی هەندێك لەو مرۆڤە بەڕێزانە ببیستم کە کورد بوون، لە سەردەمی خۆی دا نوێنەری جیهانی ئیسلامی بوون، بۆ گفتوگۆ لەگەڵ گاور و جولەکەکان دا باسی لێهاتوویی و زیرەکی ئەوەی بۆ کردم کە چۆن لە ئاستی ئەو پیاوە دا دەم بەستراو بوون نەیان توانیوە ئاخافتن بکەن.

ئەوەندەی تر شانازیم بە خۆمەوە دەکرد و بە ئیسلامەتیەکەمەوە، هەڵسام بۆ ئەوەی ئینجیلەکە فڕێبدەم.

عیماد وتی: ئەوە گوناهە کارێکی باش نییە، موسڵمان کاری وا ناکات بیدەرەوە خاوەنەکەی.



زۆر سەرسام بووم لە گفتوگۆ و شێوەی دوانینەکەی زۆرم خۆشویست، وا دیار بوو کەسێکی بە توانا بوو لە ڕووی ئاینی پیرۆزی ئیسلام.

داوام کرد ببێتە مامۆستا و فێرکاری من.

وتی: بە مەرجێك لە قسەم دەرنەچیت، تۆ بڕیار نادەی من بڕیار ئەدەم وەك مامۆستا چی بخوێنیت و چیت پێ دەڵێمەوە.

وتم: باشە!

پاشان ئەو شەوەمان بە وتوێژ بردە سەر گەڕاوە بۆ ژوورەکەی خۆی هەر لەو دەمەوە پەیوەندی و هاوڕێیەتیمان زۆر خۆش بوو کەسێکی زۆر یارمەتی دەربوو.

هەمیشە عیماد ئەوەی بیری من دەخستەوە کە چۆن یەکەم جار یارمەتیم داوە بە گەرمی پێشوازیم لێکردوە، دیارە هەر لەو کاتەوە سەرنجی منی دا بوو وە ڕەوشتی منی بەدڵ بوو، عیماد تەمەنی ٤٠ ساڵ بوو، ئەو دەمە من ٢٢ ساڵ بووم.

بە هەرجۆرێك بوو زەمەن چرکەکانی و خولەك و کاتژمێر و شەو و ڕۆژ و هەفتە و مانگ و ساڵ هەموو پێش بڕكێیان لەگەڵ دەکردین ئێمەش لەم نیواندە بەجێ مابووین.

ڕەمەزان هاتوو هەموو بەیەکەوە بەڕۆژوو بووین، خەریکی وەرگرتنی زانست بووین لە بیروباوڕ و تەفسیر و فەرموودە و هەموو بوارەکان، نوێژ و تەراویحمان هەموو بەیەکەوە بوو.

نیوەڕۆیەك لە خوولی زمانەوانی گەڕامەوە عیماد بە خێرایی بەرەو ڕووی من هات وام زانی تووشی شەڕ بووە لەگەڵ جەزای زەڕەنگەر، چونکە جەزا زۆر ڕقی لە من و عیماد بوو، پرسیم خێرە چی بووە؟

وتی مژدەم بەرێ پۆستێکت لە بەشی پەنابەرانەوە بۆ هاتووە، منیش خۆم پینەگیرا و کردومەتەوە سوپاس بۆ خوا لەم وڵاتە وەرگیراویت، لە خۆشی دا هاوارم کرد و دەم قیڕاند.

عیماد: سوجدەی سوپاس گوزاری بەرە بۆ خوای تاك و تەنها.

لەسەر ئەو شەکرە بەفرەی وڵاتی سارد و سەرمایە سوجدەی شوکرم برد بۆ خوای پاك و بێ گەرد.

بە کامەرانییەوە گەڕاینەوە لە پاشان دا لە دوای چەند هەفتەیەك نامەیەك بۆ جەزای زەڕەنگر هات لە بەشی پەنابەرانەوە بەداخەوە وەرنەگیرابوو، زۆر نارەحەت بوو، لە راستی دا پێم ناخۆش بوو، بەڵام لە لایەکیترەوە ئاسایی بوو بەلامەوە، لە بیرمە کاتی خۆی پێی وتم بۆیە دەبم بە مەسیحی بۆ ئیقامەکەم باشە.

بەڵام دڵم نەهات لەو کاتە دا پێی بڵێم کاك جەزا ئیقامەکەت جوانە، وتم با کێشە درووست نەبێت وازم لێهێنا.

من زۆر دڵ خۆش بووم بە دوای کار دا وێڵ بووم، م و هەر لە پەیوەندی دابووم لەگەڵ هاوڕێکانم ئەمویست ئەو جێگایە بە جێ بێلم و بەرە و شارێکی گەورە تر بڕۆم.



ئێوارەیەك لەگەڵ عیماد و كاك محەممەد لە ناو بازاڕ دا دەسوراینەوە، دیسانەوە تۆماسی قەشەی كلێساكەمان بینی و هات بۆ لامان و سڵاوی لێكردین بە گەرمی هەواڵی من و كاك محەممەدی پرسی، لە دوای باسێكی زۆر و پیرۆزبایی لە من و كاك محەممەد كرد، كە وەرگیراوین لەم وڵاتە و تۆماس وتی خوسرەو ئینجیلەكەت خوێندەوە؟

وتی: سەنج و بۆچونت چییە؟

وتم: لە راستی دا سەنج و تێبینیم زۆرە تۆماس، بەڵام لێرە نابێت كێشەیەكیتر دێتە پیش ئەویش ئەوەیە كە ناتوانم ئەوەی لە دڵم دایە دەری برم خۆت دەزانی من زمانەكەم زۆر باش نییە پێوستمان بە سیامەك دەبێت، بۆ ئاخافتن و گفتوگۆ.

تۆماس: باشە كەی پێتان خۆش بوو وەرن بۆ كلێسا بەڵام كاتێك دابنێن.

وتم: خۆم وڵامت دەدەمەوە.

ماڵ ئاوایمان لە یەكتر كرد، ڕووم كردە عیماد و پێم وت كە من نەوەی سەلاحەدینم، ئیتر كاتی ئەوەیە پێیان بڵێم ئایینەكەتان دەسكاری كراوە.

بەڵام دیار بوو عیماد زۆری پێ ناخۆش بوو حەزی بەو دانیشتنە نەبوو، بەڵام من داوام لێ كرد كە لەگەڵمان دابێت لە دوای ئەوەی زۆرم لێكرد رازی بوو.

عیماد: باشە، بەڵام بەمەرجێك تۆ نابێت ئاخافتن بكەیت، تەنها من گفتوگۆ دەكەم.

منیش لەبەر ئەوەی عیمادم باش دەناسی دەمزانی منی خۆش دەوێت بە دوای چاکەی من دا دەگەڕێت ڕازی بووم، بەڵام زۆرم بەلاوە سەیر بوو، وتم: بۆ عیماد گیان؟!

وتی: لەبەر ئەوەی تۆ شارەزانیت لە ئایینی ئیسلام سەرەتاتە هەست و سۆزت ناسکە لەوانەیە زوو هەڵبچیت یان بە وشەیەکی ئەوان بیرت بگۆڕێت، یان زۆر جار بەهۆی فڕێدانی وشە مرۆڤ لە ئیسلام دەردەچێت، لەوانەیە ئەو کەسێکی بە توانابێت لە کاتی ئاخافتن دا بیرو هزری تۆ بشێوێنێت.

وتەکانی عیمادم بە باشزانی کە من تەنها گوێگر بم بەڵێنم دا کە دانیشم بە هیچ جۆرێك ئاخافتن و موناقەشەیەك نەکەم.

چووین بۆ کتێبخانەی ئەو شارە لە پرسگەکەی هەندێك پەرتووکی نووسی تا بۆی دەستەبەر بکەم، یەکێك لەوانە بیرم دێت پەرتوکێکی ئەحمەد دیدات بوو، بۆ یەکەمجار ناوی ئەحمەد دیدات_م لەوێ بیست، پرسیاری لە من کرد ئەمانە لە سەر چ بیروباوڕێکن.

ئۆرتۆدۆکس، کاتۆلیك یاخود پرۆتستانت.

من نەمدەزانی بەڵام ئەو زانیاریەمان وەرگرت لە پاشان دا کە پەرتوکەکانی بە دەستگەیشت لە دوای یەك مانگ ئامادەیی خۆی نیشان دا و وتی من ئامادەم بە پشتیوانی خوای گەورە.

من زۆرم بەلاوە مەبەست بوو کە گوێم لە وتوێژی عیماد و تۆماس بێت بۆیە خێرا پەیوەندیم بە تۆماسەوە کرد کە کات دیاری بکات بۆمان، ئەویش



به خۆشحاڵیەوە کاتی بۆ دیاری کردین و من وڵامەکەم داوە بە عیماد، بەڵام دیار بوو عیماد زۆر دەترسا.

پێم وت زۆر شڵەژاو دیاری عیماد_ی برام.

عیماد: ئەمە شەڕە دەمە دەترسم توانای ئەو شەڕە دەمەم نەبێت.

پاشان بیری چەند کەسێکی وەك تۆ تێك بچێت لە پاشەڕۆ دا من بەرپرسیار بم، ئەم ئایینە کێشەکەی لەوە دایە کە بە ئارەزووی خۆت ناتوایت وتوێژ بکەیت بۆیە دەترسم برا گیان، دەستی کرد بە گریان باوەشی پێدا کردم و من ئەوەندەی تر خۆشەویستی عیمادم چووە دڵ، گەورەی و پاکی ئەو دینی ئیسلامەم بۆ دەرکەوت دڵ خۆشیم دایەوە ئەو ئایەتەم بیر خستەوە کە دەفەرموێت (وإن كنتم في ريب مما نزلنا على عبدنا فأتوا بسورة من مثله) کە خوای گەورە بە هەموو خەڵکی دەڵێت ئەگەر ئێوە لە گوماندان لەو قورئانەی کە بۆ پێغەمبەرمان ناردووە وەرن سورەتێك وەك ئەوە بنوسن کە هەرگیز ناتوانن، بۆ کۆتایش هەر ناتوانن بێگومان هەرگیز ناتوانن.

لە پاشان دا بیرم خستەوە هیچ نوسراوێك لەم بوونە دا ناتوانێت ئاوا بێ پەردە بە خەڵکی ڕاگەیەنێت کە هیچ خێچ و خوارییەکی تێدا نییە، گەر ڕاست دەکەن وەرن وردبنەوە لە قورئان، بەڵام نووسەرانی هەموو پەرتوکێك دەڵێن جێگای ڕەخنەیە تەنها قوڕئان نەبێت، تۆ بە قورئان ئاخافتن بکە.

كە ئەم وشانەم بۆ باسكرد باوەشی پێدا كردمەوە دووبارە وتی خوای گەورە بتپارێزێت بە دەنگە خۆشەكەی خۆی سەرەتایی سورەتی كەهفی بۆ خوێندمەوە.

پاشان بە دڵ ئارامییەوە بەرەو كەڵێساكە كەوتینە ڕێ كە گەیشتینە ئەوێ زۆر بەگەرمی بە خێرهاتنیان كردین ڕێزێكی زۆر باشمان گیرا، تۆماس ڕووی كردە من و بە پێكەنینەوە وتی: بزانین چی سەنجی ڕاكێشاویت.

وتم: من سەرنجەكانی خۆم بۆ عیماد باسكردووە ئەو ئینجیل و پەرتوكەكانی خوێندۆتەوە ئەگەر دەكرێت تۆ و سیامەك و عیماد وتوێژ بكەن، من جارێ گوێگر دەبم تا كۆتایی وتوێژەكانتان ئەو كاتە من بە گوێرەی توانای خۆم لە دیرۆكەكانتان دا بەشدار دەبم، بەڵام تۆماس هەرچی عیماد بڵێت من لەگەڵی دا هاوڕام واتا زۆر بێ پەردە دەڵێم ئەو نوێنەری منە هەرچی ئەو بڵێت من پشگیری دەكەم.

كەوام وت عیماد زۆری پێ خۆشبوو بە هێمنی وتی خوا بتپارێزێت.

من چاوێكم لێ داگرت و وتم ئێمە نەوەی سەلاحەدینین دەستی كرد بە پێكەنین، بەڵام سیامەك مۆڕەی لێ دەكردین.

لەو كاتە دا تۆماس ڕووی كردە عیماد و وتی: من بانگێشتان دەكەم بۆ ئەم دینە من مژدە دەرم بۆ ئێوە تا لەو بەهەشتەی كە عیسا خۆی بۆ لە خاچدا جیگایەك بۆ ئێوە دابین بكات، من خۆشحاڵ دەبم گەر ببنە گاور و خۆشبەخت بن نەوەك سەرگەندان و بێ ئایین بسوڕێنەوە، زۆربەی زۆری كوردەكان و عەرەبەكان لەسەر دەستی من بوون بە گاور هیوادارم ئێوە

چاو لەوان بکەن ئێمە هیچمان ناوێت لە ئێوە تەنها ناسنامەی ئایینی خۆتان بگۆڕن.

لەو کاتەدا یەنیکا خۆی کرد بە ژوورەکە دا و لەگەڵمان دا دانیشت بەخێرهاتنێکی گەرمی کردین وە خۆشحاڵی خۆی دەربڕی بەهاتنمان، تۆماس هەر بەردەوام بوو لە وتەکانی دۆسیەکی بۆ من و عیماد دەرهێنا و کە گوایە چەند یارمەتی خەڵکی لێقەوماو دەدەن لە ئەفریقا و ئاسیا و وڵاتانی تری جیهان دا، بەڵام عیماد هەر بێ دەنگ بوو تۆماس ڕووی کردە من و وتی: بۆ بێ دەنگن؟!

وتم: چاوەڕێی عیماد دەکەم تا بکەوێتە گفتوگۆ.

سەیرێکی عیمادم کرد و وتم: ئەگەر ناتەوێ ئاخافتن بکەیت با بڕۆینەوە؟

عیماد: سیامەك ئەوەی کە من دەمەوێت بیڵێم ئەتوانیت وەریگێڕیت بۆ زمانەکەی ئەوان؟

سیامەك: من ماوەی ٢٨ ساڵە لەم وڵاتەم توانام باشە بۆ وەرگێڕان.

عیماد: من هەندێك پرسیار دەکەم لە دوایی دا وەڵامان بدەنەوە ئەگەر وڵامەکانیان جێگای بڕوا بوون ئەقڵ بڕوای پێکرد ئەوا من و خەسرەو هەردووکمان دەبینە مەسیحی و بە دڵی ئێوە دەبین وە لە پێناوی دا کاریشی بۆ دەکەین.

عیماد بەردەوام بوو لە وتووێژەکەی سەرەتا سوپاس و ستایشی خوای تاك و تەنهای کرد خۆی ناساند کە موسڵمانێکی تونسییە هەموو پێغەمبەرانی وەك یەك خۆشدەوێت کە پێنج پێغەمبەریان جێگایەکی تایبەتیان هەیە و پاشان وتی لە ناو ئەو پێغەمبەرانە کەسێکیان کە ناوی محەممەدە (دروودی خوای لێبیت) کۆتایی هێناوە بە پێغەمبەرایەتی لە دوای ئەو ئازیزە نێردراویتر نایەت وە بڕوامان وایە کە (عیسای کوڕی مەریەم) سڵاوی خوای گەورەی لێبێت، بەندە و نێردراوی خوای گەورەیە وە برای پێغەمبەری ئازیز محەممەدە (دروودی خوای لێبیت).

هەموویان کاریان بۆ ئەوە کردووە کە نیشانی بدەن بەندایەتی لە خواکانەوە بۆ یەك خوای باڵادەست بگۆڕن و تەنها بەندایەتی بۆ خوای پەردوەردگاری ئەم بوونە بکەن.

وە زۆر بە ڕاستگۆیی پێتان دەڵێم ئەو دینەی ئێوە دەستکاری کراوە و گۆڕاوە تەنانەت ئینجیلەکەتان بە ئارەزووی قەشەکانتان نوسراوە زۆر بەی مێژوونوسان و لێکۆڵەرەوەکان ئەوەیان سەلماندووە، باشترین بەڵگەش بۆ ئەم وتانەم ئەوەیە کە پێنج سەدە دژایەتی ئێوە کراوە واتان لێ هاتبوو کە بەهەشت و جەهەندەمتان بە خەڵکی دەفرۆشت، وە فەیلەسوفی فەڕەنسی (ڕینان) دەڵێت گەر دەتانەوێت لە ژیانی (مەسیح) تێبگەن هەرگیز لای قەشەکان و کتێبە مەسیحییەکان فێرنابن لەبەر ئەوەی هەمووی درۆی گەورەیە بۆ مەسیح بەرەو سەر لێشیواوی و تاریکیتان دەبات.

مێژوو نووسی بەناوبانگی ئینگلیزی کە کەسێکە لە سەرچاوە باوەڕ پێکراوەکانی ئینگلیز و ئەوروپا بە گشتی ناسراوە ئەویش (ویلز) کە دەڵێت:



سەر هەڵدان و گۆڕینی ئایینی مەسیحی بە دەستی (شاوڵ ترسوسی) یان (بۆڵس) کە لە ڕاستی دا ئەو کەسە یەهودی بوو ڕاستە هەندێ سەرچاوەی یەهودی ئەو زانیارییە ڕەت دەکەنەوە، بەڵام زاندراوە و گومانی تێدا نەماوە.

کەشتیوانێك بوو لە (لاهوتیات ئەسکەندەریە هلینی) (لاهوتیات الاسكندرية الهلينية) هەر لە قوتابخانەی فەلسەفی (اکهلینیة) خوێندویەتی زۆر کاریگەری فەلسەفەی لێکچواندنی لەسەر بووە هەر لەو سەردەمە دا لە ناو خەڵکی دا بە عیسای ناسری ناسراو بوو، زۆربەی زۆرتان باش دەزانن ئەو نوسراو و دەقانەی هەمووی لە شاوڵ وەرگیراوە کە ئێستا ڕەنگ دانەوەی هەیە لە ئینجیلەکەتان دا زۆربەی زۆری لە بیری ئەوەوە وەرگیراوە.

هەموو لایەك دەزانێت لە دوای ڕوخاندنی دەسەڵاتی ئێوە لە ڕۆژئاوا دا ناونراوە بەچی.

ناونراوە سەردەمی لە دایکبوونەوە، واتا ئێوە خەڵکیتان لە ناودەبرد تەنها بەگزادە و پاشاکان و قەشەکان سودمەند بوون کاتێك (عیسای کوڕی مەریەم) سەلامی خوای لێبێت ئەو داکۆکی لە مافی هەژاران دەکرد من چۆن بڕوا بە ئایینێك بکەم کە ڕۆژێك لە ڕۆژان لە دوای دەستکارییەوە مافی خەڵکی تێدا نەپارێزراوە.

لە پاشان دا ئێمەی موسڵمان بڕوامان بە خوایەکی تاك و تەنهایە کەچی ئێوە بڕواتان بە سێ کەس هەیە کە خوایەتیان پێك هێناوە لە راستی دا هیچ مرۆڤێکی خاوەن بیر و تێڕامان لەم گەردوونە ئەوەی پێ قبوڵ ناکرێت





و پەسەندی ناکا، گریمان ئەگەر خوا باوکی عیسا بێت وە مەریەم ژنی خوابێت کە پەنا بە خوای مەزن ئەمە درۆیە و کوفرە کەواتە خودا پێویستی بە منداڵ هەیە منداڵەکەیش عیسایە.

ئەم خوایە بەکەڵکی خوایەتی نایەت لەبەر ئەوەی پێویستی هەیە، نابێت خودا پیویستی هەبێت، خۆ ئەگەر پیویستداربێت ئەوە خوا نییە، چونکە خودا واتا خودی خۆی هەموو شتێك دەبەخشێت وە ئەمە جێگای بڕوایە، نەك خودایەك پێکهاتبێت لە کۆمەڵێك بەش، وە خوای گەورە لە قورئان دا بە ڕوونی باسی دەکات و دەفەرموێت ( سورەتی الاخلاص) واتا خوای گەورە تاکە و تەنهایە و پاك و بێنیازە، نە منداڵی دەبێت وە نەئەو لەکەس بووە.

پاشان من پرسیارێك دەکەم لە ئێوە، بەڵام تکادەکەم بەڕاستی وڵامم بدەنەوە.

ئایە ئێوە بڕواتان بە پێغەمبەر محەممەد (دروودی خوای لێبیت) هەیە؟!

تۆماس: بێگومان نەخێر.

عیماد: کەواتە موسڵمانەکان لە ئێوە باشترن ئەوان بڕوایان بە (عیسای کوڕی مەریەم) و هەموو پێغەمبەران هەیە، سڵاوی خوایان لێبێت وە هەر (عیسای کوڕی مەریەم) بوو مژدەی دا بە ئێوە کە پێغەمبەرێك لە دوای من دێت ناوی (محەممەد)ە ئەتوانن بڵێن نووسراوی وا نووسراوە.



من گومانم نییە لەوەی کە بێدەنگن لە ئاستی ئەوە دا، بەڵام زۆر جار دڵی خۆتان بەوە خۆش دەکەن کە گوایە ناوی ئەحمەدە نەك محەممەد، بەڵام (ئەحمەد، محمود، محەممەد) هەرسێکیان یەك واتا دەدەن بەدەستەوە واتا سوپاسکراو وە ئێمە بڕوامان وەك ئێوەیە کە عیسای کوڕی مەریەم دێتە خوارەوە لە ئاسمان و سەر لە نوێ شەڕی خاچپەرستەکان و جەلاددەکان دەکات وە دەبێتە کەسێک لە شوێنکەوتوانی پێغەمبەری ئیسلام.

ئەمەش بە جۆرێك لە ئینجیلی پیرۆزدا نووسراوە، دەڵێت خەڵکی ئازاد دەکات منیش دەڵێم کام خەڵك، ئەگەر (عیسای کوڕی مەریەم) لە قودس بێتە خوارەوە دژایەتی هاوپەیمانانی جولەکە و مەسیحی دەکات، وشەی قودس بەکارهاتووە لە ئینجیل و تەورات دا نە وشەی هەیکەل وە نە ڤاتیکان وە نە کەڵێسای مەریەمی عەزرا لە فەڵەستینە بەکار نەهاتووە تەنها قودس، خۆتان باش دەزانن کە قودس مزگەوتی موسڵمانانە و (عیسای کوڕی مەریەم) لەوێ دێتە خوارەوە و پشگیری موسڵمانان دەکات.

لەگەڵ ئێمە دایە نەك ئێوە تۆماس!من بانگێشتان دەکەم بۆ ئایینی پیرۆزی ئیسلام کە ئایینی چاکە و بێگەردی خواداوەندە وە ئێمە بڕوامان بە هەموو پێغەمبەران و پەرتووکە ئاسمانییەکان هەیە، ئەگەر دەتانەوێت لە ئایینی مەسیح تێبگەن تەنها لە ئیسلامەوە سەرچاوەی گرتووە عیسا تەنها پێغەمبەر و بەندەی خوای گەورەیە.

نازانم ئێوە هەمووتان بێ دەنگن لە ئاستی دانوستانەکەی من چۆن ئێستا ئێوە شەریعەت لە ئینجیلی سەردەمی کۆنەوە وەردەگرن واتا تەورات بۆ جارێکیش لە سەرچاوەی پاکی ئیسلام هەڵگۆزن لە کاتێک دا



کە ئێمە بڕوامان بە عیسا هەیە، بەڵام جولەکەکان نە بڕوایان بە ئینجیل هەیە وە نە بڕوایان بە (عیسای کوڕی مەریەم) هەیە، بەڵکو (عیسای کوڕی مەریەم) بە درۆزن و دایکیشی بە داوێن پیس لە قەلەم دەدن، لە ڕاستی دا ئێوە (عیسای کوڕی مەریەم) تان خۆشناوێت وە یاری بە ئایینی پاکی مەسیحی کۆن دەکەن، تا ئارەزووەکانی خۆتان پێ دامرکێننەوە و دەسەڵاتی کڵێسەی خۆتان لە دەست نەدەن، لەگەڵ ڕێزم دا بۆتان من ئیتر گفتوگۆ ناکەم زیاد لە پێویست دووام تاکو وڵامی پرسیارەکانم نەدەنەوە من پرسیاری تر ناکەم، هەرچەندە دەریایەك پرسیار خۆی ماتداوە لە سینەم دا.

عیماد سوپاسی هەموویانی کرد بۆ گوێ گرتنیان وە بە بێدەنگی دانیشت منیش لە دڵی خۆم دا دەمووت ئێستا هەڵنەستی ماچێکی بکەیت زۆر بە شێوەیەکی جوان وشەکانی لە زارییەوە دەهاتنە دەرەوە بە ڕاستی من و ئەوانیشی سەرسام کردبوو، تۆماس سەیرێکی من و عیمادی کرد و وتی بەڕاستی من نەمدەزانی کە ئێوە خاوەنی زانیارین لەسەر ئایینەکەی ئێمە و وە ئەو پرسیارانەی کە تۆ کردت من توانام نییە وڵامت بدەمەوە، ئەگەر پێتان خۆشبێت من دانیشتنێکی تر سازدەکەم وە لەگەڵ ئەو کەسانەی کە لە سەرو منەوەن و زانیاریان باشترە لەسەر ئینجیل و عیسا وە ئایینەکە بەگشتی لە کاتی ئامادەبوونی ئەوان دا من ئاگادارتان دەکەمەوە زۆر سوپاس بۆ ئامادەبوونتان بەخێربێن سەرچاو.

عیماد: هەرکات ویستان دەنیشتن ساز بکەن تکایە مانگێك پێشتر ئاگادارمان بکەنەوە ئێمە هەمیشە ئامادەین.



لە کۆتایی دا عیماد وتی خوای گەورە هیدایەتمان بدات بۆ سەر ڕێگای ڕاستی وە بۆ ناسینی خوای تاك و تانها ئامین خواتان لەگەڵ.

لە دوای دەرچوونمان لەگەڵ عیماد زۆر دڵ خۆش بووین من هەر بەدەم ڕێگاوە سوپاس گوزاری خوای گەورە بووم هەر ئەمووت سەرکەوتین عیماد.

بە پێکەنینەوە عیماد: ماڵت ئاوابێت خۆ شەڕە بۆکسمان نەکردووە ئەو وتی کوا سەرکەتوو بوین؟

وتم: ئێمە سەرکەوتوو بووین کەس نەیتوانی وڵامت بداتەوە.

وتی: سەرکەوتن بریتییە لەوەی کە بمان توانیایە ئەوان موسڵمان بکەین ئەوکات دووجار سەرکەوتوو دەبووین، جارێك لە دونیا دا جارێك لە قیامەت، خەسرەو کوردی برام سەرکەوتنی قیامەت زۆر گرینگە...بەدەم قسەی خۆشەوە گەڕاینەوە بۆ باڵەخانەی پەنابەرەکان.

من و عیماد خەریکی بەندایەتی خۆمان بووین ئەو سەردەمە مزگەوتێکی خنجیلانەمان کردەوە زۆربەی مرۆڤە ئیماندارەکان لە دەوری ئەو مزگەوتە کۆببونەوە.

ڕۆژێکیان زۆر سارد بوو کڕیوەی بەفر لەگەڵ بادا بەدەورم دا لوولی دەخوارد منیش لە بازاڕ بۆ کڕینی پێداویستیەکان بە کۆمەڵێ شتوومەکی زۆرەوە کە بەدەست هەڵم گرتبوو دەگەڕامەوە بۆ جیگای تایبەتی خۆم زۆر شەکەت بووم، تۆماسم بینی وتم ئیستا دەمگەیەنێتەوەماڵەوە، کەچی ئەو پیاوە باشە هەرسەیریشی نەکردم، ئیتر لەو کاتەوە تێگەیشتم کە ئەوان




شەڕ لەگەڵ بیروباوەڕەکەمان دا دەکەن، بڕیارم دا کە ئایینەکەی خۆم خۆش بوێت و هەرگیز نکۆڵی لێ نەکەم و دەست لە بەندایەتی هەڵ نەگرم تا خوای گەورە ئایینەکەی خۆی سەردەخات.

بڕیارم دا هەمیشە موسڵمانیشم خۆش بوێت و منیش بۆ سەرکەوتنی هەوڵبدەم، تا ساڵیکیش من و عیماد چاوەڕێمان کرد، بەڵام ئەوان ئامادە نەبوون ئێمەش لە دوای ئەو ساڵەوە ئەو شارەمان بەجێهێشت، من چووم بۆ ئۆسلۆ.

# چیرۆکی دوانزەیەم
# (من و ترێ)

چووینە ئۆسلۆ بۆ کارکردن، سێ کەس بووین هەموومان ڕەبەن بووین هەرسێکمان چووینە شوقەیەك بەیەکەوە دەژیاین، ژیانێکی سادە و ئاساییمان هەبوو.

لە ئێوارەیەکی ساردی ئەم سەهۆڵستانە دا خەم و خەیاڵ لە دەروازەی من دا خەریك بوو دەڕەوایەوە، ڕەمەزانێکی زۆر خۆش بوو دڵم ئارامی گرتبوو، ئەو ساڵە بە ڕۆمان و شعری تەڕاویح وا بەستە بووم هەمیشە ئاوازی من لە سورەتی (الکهف)، (الأخلاص)، (الواقعة) و (الرحمن)دا سەرچاوەی گرتبوو، ئێوارانی بەربانگم بە سێ دەنکە خورما و لە پاشان دا بەتەلەفۆنێك بۆ دایکە ئازیزەکەم فرمێسك لە چاوە قەتیس ماوەکەم دەشکاند، ئاماندووی کاری دە سەعاتم لە دەنگی ئەو دا بێ کە پێم دەڵێ: ڕۆڵە بەو دوعا و نزا و خێرانە بێ کەمن بۆتی دەکەم.

لە پاشان دا خۆشەویستی ئەم ئایینە وای لێ کردبووم کە لە وڵاتی تاراوگە دا ئولفەتم گرتبوو بە دوو هاوڕێی خۆم کە هەردووکیان وا بەستەی دینی پیرۆزی ئیسلام بوون.

دەبوایە سەعات چواری ئێوارە ئەوان ڕۆژوویان بشکاندایە، بەڵام لەبەر ئەوەی من سەعات شەش لە کار تەواو دەبووم، خۆشەویستیان بۆمن

چاوەڕێیان دەکرد تا هەموومان بەیەکەوە ڕۆژوومان دەشکاند، تا دوانزەی ڕەمەزان بەم شێوەیە بردمانە سەر.

بەڵام ئێوارەیەکیان زۆر بەپەلە دەستم لە ئیش هەڵگرت زۆر غەریبی دایکمم دەکرد، دڵم وەك باخە هەنارەکانی شارەبان و سێوە لاسورەکانی بلکیان و باخە ترشەکەی سەرو دێمەکە چۆن شەماڵێك لار و لەنجەی پێ دەکات ئاوا بیروهۆشم یادی وڵاتی بێ کەسی دەکرد.

کە لە کارەکەم دەستم هەڵگرت بە خێرایی دەستم خستە ناو گیرفانی کۆتە سارد و سڕەکەم، بەفریش پرۆشەی دەکرد، تەنانەت برژانگەکانی چاومی گرتبوو بە ئاستەم بەرپێی خۆمم دەبینی.

بەدەم خەیاڵەوە سەرکەوتم بەرەو ماڵی سارد و سڕم کەوتمە ڕێ، بەڵکو حەسانەوەم لە مەحزونی نەجاتی بێ.

پشوێکی خۆشەویستی و دەست نوێژێك بۆ ئارامی دڵ و دەروونم بگرم، چونکە هەموو ئەو کاتانەی کە خەفەتبار دەبم بیر لەوە دەکەمەوە کە چۆن چڵکی تاوان بە ئاوی دەست نوێژ پاك بکەمەوە.

کە گەیشتمە بەر دەرگای باڵەخانەی ماڵە خنجیلانەکەم، لەبەردەم دەرگای ئەو باڵەخانەیە دا گوێم لە دەنگی گریانێکی ناسك و زۆر مەحزوون بوو، سەرنجی ڕاکێشام سەیرم کرد لە بەردەمی دەرگاکە کیژۆڵەیەکی ئەگریجە ڕەش دانیشتبوو، سەری خستبووە سەر باڵەکانی و سەری بۆ زەوی شۆڕ کردبووەوە.



چیچکەیەکی نەرم و بەردەمیشی سێ چوار دڵۆپی فرمیسکی جاوی تەڕی کردبوو، زۆر ئاستەم بوو بەلامەوە دەبێ لەم وڵاتی باکورە دا کە ئازادی ڕەها دراوە بە ئافرەتان بۆ دەبێ ئەم ناسکە بەم شێوەیە ئەشك و حەسرەت دەرببڕێت؟

لەو کاتە دا وەیلێ لە حاڵی دڵم وەیلێ لە ناڵەی خەمم، بە زمانی باوکوری پێم وت: سڵاو!ئەو زیاتر هەنسکی هەڵدا و منیش زیاتر خەفەت باربووم دووبارە پێم وت: ئایە ئەتوانم یارمەتیت بدەم؟!

ئەگەر سەرماتە من دەتوانم بتبەمە لای خۆم؟

ئەگەر پێویستت بە پارەیە ئەوە لایمن ئاساییە.

گەر برسیتە نانت دەمێ وە ئەگەر نەخۆشی با بەرەو خەستەخانەت بەرم.

دیار بوو قسەکانی من کاریگەر بوون، چونکە لە ناخی دڵەوە ئاڕاستەم کرد بۆیە بە کەساسی سەری بەرز کردەوە دیم تاڵی ناڵۆزکاوی قژی بە ڕوومەتی فرمیسکاوییەوە وەستاوە و شکۆفەی خەمی لێ دەوەرێت.

هەناسەی لە تاو هەنسك سەمفۆنیای گریانی لێ دەباری، بە تێڕامانێکەوە و بە لێوێکی چرچی خەمبارەوە بەمنی وت: تۆ خەڵکی چ وڵاتیکی؟

زۆر خێرا وتم: من کوردم!




بۆ ئەوەی پیاوەتی و شەرەفمەندایەتی کورد دەربخەم، لە بیرم دێت لە ئەستەنبوڵ هاوڕییەکی پیرم هەبوو زۆرم خۆشدەویست.

پێی وتم: لە وڵاتی غەریبستان تا دەتوانی کاری جوان بکە، چونکە تۆ کارەکتەر و شانۆمەندی وڵاتەکەتی.

بۆیە خێرا وتم: کوردم!

کەچی ئەو زیاتر فرمێسکی وەك هێشووی بەرسیلەی ترێ سپیکە دەهاتنە خوارێ.

ئەو ناسکەش بە زمانی شیرینی کوردی پێی وتم: نەفرەت لە تۆ و لە وڵات و لە خاك و ئاوت.

هەر کەمتیارێکی کورد بوو بە ناوی ئازادی دەروازەی لەشی منی ئازاد کرد.

من سەربڕاوی دەستی ئێوەی کوردم ماڵ وێران و دەربەدەری و سەرما خواردوی ئێوەی کوردم.

لە دوایی دا خێرا بێدەنگ بوو سەری خستەوە سەر باڵەکانی هەر هەنسکی هەڵدەدا.

زۆر سەرسام بووم لە توڕەیی ئەو نامۆیە، ترسی ئەوەم لێ نیشتبوو گەر من خۆم توڕەکەم هەوری ڕەشی ئەو زیاتر بێت و من هیچ لەو تێنەگەم.



بۆیە کوردە ناموسی سەرم شۆڕ کرد لە بەردەم ئافرەتێک دا، بەڵام بەدەنگێکی سامناك پێم وت: خوشکی خۆشەویست تۆزێك هێمن بە من تەنها مەبەستم چاکەیە و بەدوای خێر دا دەگەڕێم.

چونکە کەوتوومەتە وڵاتێکی خێر لە ناویدا زۆر ئاستەمە، لە پاشا چاکە و پیاوەتی قسەم پێ دەڵێیت؟ بە خراپی ناوی وڵاتە بێ کەس و خامۆشەکەم دەبەیت، خۆشت خەڵکی ئەوێیت؟ گەردەنت ئازاد بێت.

لەبەر خوا پاشان لەوانەیە دەردە داریان کردبێت، بەڵام ئازیز من لەم دنیا نەم بیستووە و نەم دیوە کە پەنجەکانی دەست وەك یەك بن، بە هەرحاڵ من گومانم لە خەمباری تۆ دا نییە تۆ ئازادی و هەر ئازادیشە کەتۆی هێناوەتە بەردەرگای ماڵەکەی من.

ئازادی یە تۆی لە خێزانت دابڕاندووە و دەنگ بەسەر من دا بەرز دەکەیتەوە کە دەستی یارمەتیت بۆ درێژ دەکەم.

فەرموودەی پیاوێکی بەرزم بیر کەوتەوە کە دەڵێت: لەگەڵ خەڵکی دا وەك دارێکی بەرداربن ئەگەر بەردیان تێگرتن ئێوە بەرهەمیان تێبگرن، من هیچ خراپەیەکم نەکردووە.

بۆ دوا جار پێت دەڵێم: ئەگەر یارمەتیت پێویستە با یارمەتیت بدەم، ئەوەش لەبەر ئەوەی بە کوردی قسەت کرد، هەرچەندە زۆر ناشرین دوایت بە زمانەکەم، بەڵام دواجاریش دەڵێم هاوکاریت دەوێت؟!

سەری بەرز کردەوە بەدەمی چکەیەکی زۆر سەیری کرد.

پێی وتم: بڕۆ من پیویستم بە تۆ نییە و عەرەبانەت ڕاكێشە.

بەس گەر دەكرێت دەرگاكە لە دوای خۆت دامەخە با سەرمام نەبێت، چونكە هاڵاوێكی گەرم دێت لەوێوە.

وشەی عەرەبانەكەم زۆر پێ ناخۆش بوو، جوابم نەدایەوە بەرەو هەڵكێشی باڵەخانەكە ڕۆیشتم، تا هاتمەماڵەوە و دەرگای ژوورەكەم كردەوە، براكانم دانیشتبوون چاوەڕێشیان دەكردم ئەوەندەمان یەكتر خۆشدەویست ڕۆحمان تێكەڵی ڕۆحی یەكتری ببوو، هەمیشە بە ئازار و خەمی یەكتریمان دەزانی بۆیە خێرا سەرخێڵ وتی: خەسرەو_ی برام بۆ خامۆشی و بزەی ئێوارانت نییە؟

یوسف: وازی لێ بێنە تۆ ئەتەوێت بە ئاسانی توشی خەمی بكەیت من دەزانم برسییەتی و زۆر ماندووە لە هەمان كاتیش دا بیری دایكی دەكات، بزانە دوای ئەمانە و تەڕاویحیش وازمان لێ دێنێ كەكەسمان بخەوین.

من و سەرخێڵ پێكەنینمان بە قسەكانی یوسف دەهات.

نانیان تێكرد و منیش بە زۆر توانیم كەوچكێك بۆ دەمم بەرم هەر خەیاڵم لای ئەو كچە بوو، زوو زوو دەم وت تۆ بزانە لێم پرسی ناوت چییە؟

بۆ خۆش بەختی دەبوو ئەو ڕۆژەش من قاپ و قاچاخ بشۆم كە ناخۆشترین كار بوو بەلای منەوە.

وتیان: هەڵسە ئەوە ئیزرائیل چاوەڕێتە لەبەردەمی سنگەكە دا بڕۆ بەلوعەی مردن بكەرەوە و لاشەی خۆت بشۆ.



به تەوەزەڵی هەڵسام دەست بکەم بە قاپ شۆردن، کە سەیرم کرد زاهی قاپ شۆردن نەمابوو پرسیارم کرد: ئەرێ برادەران زاهیمان نییە؟

هەموو سەیری یەکمان دەکرد یوسف وتی: ویستم بیکڕم لە یادم چوو ئەگەر دەتوانی لە جیاتی من تۆ پانتۆڵەکەت لە پێ دایە بامن خۆم نەگۆڕم ئەچی ئەیکڕیت؟

خێرا وتم: بەسەرچاو ئەویش سەرسام بوو، لەو بیرە دا نەبوو کە بەو ئاسانییە من ڕازی بم، بەڵام رازی بووم.

موگناتیسێك رای دەکێشام ئەویش ئەو کیژۆڵەی بەردەرگای باڵەخانەکە بوو.

کە چوومە خوارێ دیم ئەو جێگایە چۆڵ و هۆڵە زۆرم پێناخۆش بوو وەستام و هەڵوەستەیەکم کرد پرسیم لە خۆم ئەو هەڵوێستەیە چی بوو بۆ ئەو کیژە شەرمەزارییە بۆ تۆ.

دڵیشم دەیوت نا بابە تۆ دەتەوێت خێر بکەیت خێرا بە خۆمم وت ڕاستە من دەمەوێت خێر بکەم، بەڵام بەداخەوە دەستم نەکەوت ئەو خێرە.

بۆ دواجار دوای هەیڤی دڵی خۆم کەوتم لە دوڕیانی خێرکردن و بەزەیم بۆ ئەو کچۆڵە، ملی ڕێگام گرتەبەر بۆ کڕینی زاهی تا قاپەکان بشۆم کە هەریەکەیان لە ڕەنگێك بوون، هەر لە قاپی قەرەج دەچوون.

چەند هەنگاوێك دووركەوتمەوە لە كرێوی بەفر و تاریكی ئەو زستانە ملی ڕێگام گرتبوو لە پێشی خۆم سەرم هەڵبڕی دیم دوو گەنجی سۆماڵی لەگەڵ ئافرەتێكی باكور دا بەسەر لاشەی ئەو كیژۆڵەیە وەستا بوون، منیش زوو ناسیمەوە كە خۆیەتی ئەوەی كە من گلاراو بووم بە شوێنی دا.

خێرا دەستم خستە ژێر سەری و وا خۆم نیشان دا كە دەیناسم.

وتم: كێ وای لێ كردووە؟

گەنجەكان ترسان پاشەكشەیان كرد و وتیان: ئێمە ئاگاداری هیچ نین تەنها بینیمان لە وێ دا بە بێ هۆشی كەوتووە، جار و باریش هەڵدەلەرزی، ئەوان ڕۆشتن، بەڵام ئافرەتەكەی باكور لەگەڵم دا مایەوە پێی وتم: دەیناسی؟

وتم: بەڵێ!

ئەویش وتی: ئەم ناسیاوەی تۆ، كۆردۆیین، هێرۆین، مۆرفین، یان حەشیش وەیان تلیاكی سادده بەكاردەهێنێت؟

زۆر ترسام وتم: تۆ باسی چی دەكەیت ئەو هیچ لەمانە بەكار ناهێنێت، بەڵكو تەنها تووشی نەخۆشی دەروونی بووە تۆزێ بێ تاقەت بووە.

بە زەردەخەنەیەكەوە پێی وتم: (ok)

منیش خێرا تەلەفۆنم كرد بۆ ئەمبۆلانس (ئۆتۆمبێلی فریاگوزاری نەخۆش خانە).

ناونیشانی جێگاکەم پێ وتن، پشتی ئەو کچەشم خستە سەر ئەژنۆم بە چاکی کۆتەکەی سەریم داپۆشی تا تۆزێك گەرم بێتەوە، بەڵام بە داخەوە ئەمبۆلانس هەر نەگەیشت.

خۆم لەسەرمان دا هەڵدەلەرزیم بێ ئەوەی کەسێك لێم بپرسێت ئەرێ کابرا لەگەڵ ئەم ئافرەتە چیتان بەسەر هاتووە تەنها بەلام دا تێدەپەڕین و زوو زووش دەیان وت ئەی بێچارە، وەك نە بینن دوو مرۆڤی ڕۆحانی بین تەنها خۆمان بەلای یەکترەوە ئاراممان گرتبێت.

زوو زووش لە دڵی خۆم دا دەمووت بڵێی ئەم ئافرەتە راست بکات ئەمە تلیاکی بێت، هەر لە دووڕیانی دڵی خۆم دا مابوومەوە و دەم وت خێرکە خێر ئەمە پێویستی بە تۆیە هیچ نەبێت کوردە هاوڵاتی خۆتە ئافرەتیشە ئاگادار بە.

لە پڕ لولەی ئۆتۆمبێلی ئمبولانسم گوێ لێبوو هەستامەوە ڕووم کردە ئەوان بە دەستم سەرنجی خێرایی ئەوانم ڕاکێشا بۆ ئەوەی زوو بگەنە لامان، گەیشتن و بە چاپوکی هەڵیان گرت و لییان پرسیم: بۆ وای لێ هاتووە؟

وتم: نازانم بەس ئەوەندە دەزانم کە ئەمە کوردە و خەڵکی وڵاتی منە تەنها حەزم کردووە یارمەتی بدەم دەتوانم لەگەڵتان بێم بۆ یارمەتی ئەو نەوەك زمان نەزانێت تا یارمەتی ئەویش بدەم ڕازیم کردن.

وتیان: باشە.




لەگەڵ تەرمی بێ هۆشی ئەو دا کەوتینە ڕێ تا گەیشتینە جێگای مەبەست کە نەخۆشخانە بوو.

بە منیان وت: ناوی چییە؟

وتم: نازانم

وتیان: بگەڕێ بزانە ناسنامەکی پێ نییە؟

دەستم کرد بەگیرفانی دا یاداشت نامەیەك لە گیرفانی دا بوو، لە یاداشت نامەکە دا نووسرابوو (ترێ جەمال فرەج) لەگەڵ ژمارەی دەستی یەکی دا.

خێرا تەلەفۆنم کرد بۆ ئەو ژمارەیە زەنگی ئەو ژمارەیە لە گیرفانی دا لێی دەدا.

ئیتر بۆ دوا جار گومانم نەما کە ئەمە ناوی خۆیەتی و تەنها (٥٠) کرۆنی نەرویجی تێدا بوو لە بەینی یاداشت نامەکە دا.

تا سەحات هەشتی شەو من لە هۆڵی چاوەڕی چاوەڕێی ترێ_ م دەکرد.

دەم وت ئاخۆ دەبێ نەخۆشییەکەی چی بێت؟ یا خود ئەم بێ چارەیە تووشی چی بووبێ، پەرستارێك هاتە لام وتی: ترێ پیویستی بە کەسێکە لە ژوورەکە دا بێت، ئەوبەئاگا بوو.

لێم پرسی: حاڵەتەکەی چییە؟



وتی: ئەمە ئیشی من نییە پێت بڵێم.

منیش وتم: باشە، چووم بۆ ژوورەکەی وەك سۆپایدار خەفەببوو هەناسەی قوڵی هەڵدەکێشا، منیش بەزەییم پیا دەهاتەوە حەزمنەکرد لەلایەوە دانیشم خێرا چووم دەست نوێژم گرت و دەستم کرد بە نوێژکردن نوێژی عیشا و تەڕاویحم هەر لە ژوورەکەی ئەو دا کرد و جاروباریش دوعای خێرم بۆ دەکرد کە خوای گەورە شیفای بەخێری بۆ بنێرێت و بیخاتە سەر ڕێگای ڕاست.

لە ڕکاتی کۆتایی نوێژ دا بووم هەڵسایەوە بەسەر سورمانێکەوە سەیری منی کرد و بە بێدەنگی دانیشت هیچی نەوت تا من لە دوعا و ویردەکانم بوومەوە، منیش خێرا هەڵسامە سەرپێ و وتم: خوشکی ئازیز سڵاوی خوات لێبێت شکور بۆ خوا باشیت، حەز لە چی دەکەیت بۆت بهێنم من کە لێرەم تەنها دەمەوێت خزمەتی جەنابتان بکەم لەبەر خاتری خوا، لە بیریشت نەچێت زۆر دوعام بۆ کردوویت کە خوای گەورە شیفای بە ڕەحمەتت بدات و چاکبیتەوە جا چیت دەوێت بۆت بێنم؟

ئیتر زۆر بەکەمی خۆم پیشان دا بۆ ئەوەی پەردەی شەرمی بشکێت و بە ئاسانی قسەم لەگەڵ بکات، ئەویش بە شەرمێکەوە لە ژێر لێوی پێی وتم: زۆر حەزم لە شیرینییە ئەگەر دەکرێت بۆم پەیدا بکەیت؟

وتم: بەسەرچاو هەر تۆ و شیرینی، هەر ئێستا تۆ خۆت شیرینی خوشکی شیرینم دەستی کرد بە پێکەنین و پێی وتم بەڕاتسی تۆ لایەقی هەموو شتێکی باش و جوانیت ئەتوانم بپرسم ناوی بەڕیزتان؟

وتم: ترێخان من ناوم خەسرەوە و کوڕێکی زۆر چاکم بە پیکەنینەوە.



هەردووکمان دەستمان کرد بە پێکەنین، من بە پێکەنینەوە دەرگاکەم کردەوە و بەرەو فرۆشگای ناو خەستەخانە کەوتمە ڕێ.

لە ناو فرۆژگاکە دا هەندێك شیرینیم بۆ کڕی زۆر بە خۆشحاڵی گەڕامەوە بۆ لای، کە چووم ڕاکشابوو کە منی بینی خێرا بە ئەدەبەوە هەڵسا و وتی: ببورە.

وتم: خوای گەورە بمان بورێت، ئارام بە جەنابتان چۆن پێتان خۆشە ئاوا ئیسراحەت بکەن.

لێی پرسیم چۆن ناوی منت زانی؟

بەسەرهاتەکەم بۆ باسکرد، زۆر ئاستەم بوو بەلایەوە.

وتی: توخوا لێم ببورە.

دووبارە وتم: خوای گەورە بمان بورێت، من تەنها مەبەستم چاکەیە لەگەڵ ئێوە دا، ئەگەر خوای گەورە لێم قبوڵبکات.

ترێ: زۆر ناوی خوا دەبەیت شتێک هەیە لەم کەونە دا ناوی خوا بێت؟

بە زەردەخەنەیەکەوە پێم وت: ئەگەر لەبەر خاتری خوا نەبوایە من یارمەتی تۆم نەئەدا!.

زۆر بوون ئەوانەی کە بەلاتا تێدەپەڕین و بڕوایان بە خوا نەبوو کە تۆیان دەبینی وازیان لە لاشەی تۆ دەهێنا و دەڕۆشتن!.

سەری داخست و وتی: ببورە.

وتم: خوا بمان بورێت.

ترێ وتی: بۆیان باسکردوم کە گوایە ئەوانەی باوەڕیان بە دین هەیە ئافرەت زۆر بەکەم سەیر دەکەن، وە هەمیشە وەك کارەکەرێك یان ژمارە دوو سەیری دەکەن.

خێرا پێم وت: ترێ خان!ئەوەی کە جەنابتان فەرمووتان تەنها قسەی کۆمەڵێك نەزان و بێ ئاگا لە دینە بە تایبەت لە دینی پیرۆزی ئیسلام، کە من زۆر وابەستەم بە دینی پیرۆزی ئیسلامەوە، هەر ئەوەشە فێری کردووم دەستی یارمەتی درێژ بکەم بۆ خەڵکی لێ قەوماو بێ هیچ مەبەستێك چاوەڕوانی کەرەمی خوای گەورە بم، پاشان فێری کردم کە ئافرەت و پیاو وەك یەك سەیر بکەم، بەمانای ئەوەی کە هەردووکیان مرۆڤن، لە بیرت نەچێت لە دینەکەی من دا بەهەشت خراوەتە ژێر پێی تۆ، بەڵام ئەو وەعدە بەمن نەدراوە.

ئایا کامیان مافیان زۆرترە، لە ئایینی من دا پاداشتی چاکە و خراپە وەك یەك بەشدارن، بەڵام چۆن شەو و ڕۆژ هەیە شەو تامی تایبەتی خۆی هەیە و ڕۆژیش تامی تایبەتی خۆی وە بە هەردووکیان دەوترێت زەمەن ئاواش ژن و پیاویش تامی تایبەتی خۆیان هەیە و ئەرك و فەرمانیان جیاوازە و بە هەردووکیشیان دەوترێت مرۆڤ.

زۆر جوان گوێبیستی قسەکانم بوو، خێرا وتی: بەخوا ڕاستە تا کاتێ لە وڵاتەکەی خۆم بووم منیش وابەستەبووم بە ئایینەکەی تۆ، زۆر باش بوو ڕێز و حورمەتێکی باشم لەناو خەڵکی و کەسوکار دا هەبوو، بەڵام بە




داخەوە هەموویم لە دەست دا، وا بەتەنها لە ناو ئەم جێگایە دا بێ کەس کەوتووم و گۆرانی بۆ تەنهایم دەڵێم.

منیش کردم بە قسەی خۆش لەگەڵی دا و خێرا پێم وت: کەواتە ئێوەی ئافرەت هیچ نرخێك بۆ پیاوان دانانێن، کەچی خۆتان داوای مافەکانیش لە ئێمە دەکەن، ئەی من کەس و برای تۆ نیم مەگەر پیاو لای ئێوە ژمارە دووە؟!

دەستی کرد بە پێکەنین و وتی: خەسرەو بەڕاستی من لە ئاستی تۆ دا شەرمەزارم و نازانم چیت پێ بڵێم مەگەر بتکوژم ئەوجا چاکەی تۆ بدەمەوە.

منیش بەزەردەخەنەیەکەوە وتم: نەوەڵڵا چاکەی وام ناوێت تۆ من بکوژیت، ئیتر دەستمان کرد بە پێکەنین و هەندێك نوقڵیشمان خوارد، کەمێك بێدەنگی ڕووی تێ کردین.

وتم: ئەتوانیت باسی ئەم بێتاقەتیەی خۆتم بۆ بکەیت بۆ گیرۆدەی بە گریانەوە؟

ترێ: باس و بەسەرهاتی من زۆت درێژە چۆن ئافرەت دەکەوێتە ناو خوێن و بۆگەنی ناشرینەوە، باسەکەی منیش باسی شەرمەزارییە، باسی خۆمت بۆ بکەم یان کلۆڵی و بێ ئاگایم لە دونیا و ساویلکەیم لە بەرامبەر مرۆڤەکان دا و دڵپاکی خۆم بۆ خەڵك نازانم لە کوێوە دەست پێ بکەم با ناوی لێبنێم شەوی سوور وە لە شەوی سوورەوە دەست پێ بکەم.



شەش مانگ لەمەوبەر جەژنی لە دایك بوونی من بوو لە قوتابخانە نەم ویست کەس بزانێت، بەڵام دوو هاوڕێی کوردم لەگەڵ دا بوو پێیان وتم تۆ دەبیت بە ٢٥ ساڵ جوانترین تەمەنی مرۆڤە، بۆ جەژنی لە دایکبوون ناکەیت؟

ئەمانە و چەند قسەیەکی تر وای لێکردم کە ڕازی بم بە قسەکانیان بە گوێیان بکەم ئەوەشم بەبیرداهات وتم نەوەك بڵێن ترێیە نایەوێت پارە بەکاربهێنێت و کچێکی دەست داخراوە وتم باشە چووینە دەرەوە.

سەرەتا وتیان دەچین بۆ کافترییەك (قاوەخانە) لەوێ دوو کەپەچینۆدەخۆینەوە، کەچووین دانیشتین و دەستمان کرد بە قسەی خۆش و گاڵتە و گەپ لەپڕ دوو گەنجی جوانخاس هاتنە لامان و چۆنی و چاکیان لەگەڵ ئاڤانی هاوڕێم کرد، ئاڤان_ئش ئێمەی بە نامۆ و ئازاد ناساند کە گوایە ئەم دووانە هونەرمەندن و گۆرانی بێژن.

داوایان کرد لەگەڵمان دانیشن!

**ئاڤان:** ئەمڕۆ جەژنی لەدایك بوونی ترێیە.

هەموویان پیرۆزباییان لێکردم، بەڵام ئازاد زۆر بە شێوەیەکی سەیر تەماشای منی دەکرد و وتی هاوڕێیان ئەگەر پێتان خۆشە وەك دیارییەك بۆ ترێ خان، پێم خۆشە من بانگهێشتان بکەم، من خاوەنی ئەم مێزە دەبم.

بەبەردەوامی ئەم قسەیەی دووبارە دەکردەوە و وای لەمن کرد کە ڕازی بم.

زۆر سەرنجی منی بۆ لای خۆی ڕاکێشا و خێرا باسی ئەدەبیاتی کرێکاری کرد لەسەر ئازادی مرۆڤ بەتایبەت ئافرەت، ئیتر وامزانی کە ئەمە باوکی مارکس_ە لەلای سارتەر گەڕاوەتەوە و دایکیشی سیمون دیبۆفوار_ە و باسی زۆربەی تابلۆکانی ڤانکوخی بۆ دەکردم و هۆندراوەیەکی تایبەتی هەبوو بۆ ژیان لە ڕێگەی بیروهزری چەپی ڕادیکاڵەوە باسێکی فەلسەفەی پۆست مۆدێرنی بۆ کردم، چونکە حەزم لە فەلسەفە دەکرد.

ئیتر زیاتر سەرنجی ڕاکێشام زوو زووش ناوی منی دەهێنا و سەیری دەست و پەنجەکانی دەکردم وام لێهاتبوو بە ئاراستەیەك بڕۆم کەخەیاڵم لە ئەسپی ئەو دا تاو بدەم، بەو قسانەی زۆر سەرنجی منی گرت.

## من و ترێ و ژیانێکی نوێ:-

دوای ئەوەی ترێ بەردەوام بوو لە گێڕانەوەی ژیانی خۆی و ئازاد...

ترێ وتی: ئازاد ژمارەی تەلەفۆنەکەمی لێ وەرگرتم تا کۆمەڵێك کتێبم بۆ پەیدا بکات، منیش زۆر بە خۆشحاڵیەوە ژمارەی تەلەفۆنەکەم دایە، ئەو ڕۆژەمان بەم شێوەیە بردەسەر، بە هەفتەیەك دوای دانیشتنەکەمان لە کتێبخانەیەکەوە تەلەفۆنی بۆ کردم ئەگەر دەکرێت من ببینێت، چونکە کتێبی باشی بۆ پەیدا کردبووم بۆ ئەوەی بمداتێ.

منیش چووم بۆ کتێبخانەی گشتی بینیم، چووینە کافتریایەکەوە دەستمان کرد بە قسەکردن زۆر باسی ئازایەتی ئافرەتی بۆ کردم، تەنانەت وام لێهاتبوو وام دەزانی ئافرەت سەرکردە و شای هەموو بونەوەرەکانە لە ڕووی ئازادییەوە بۆیە زۆر بە لێزانانە منی هەڵخەڵەتان و بە شێوەیەك کە منی کردە پەیکەری ڤینۆس و خۆشی کردە بەندەی من، ئیتر لە باسی ئازایەتییەوە بەرەو خۆشەویستی منی برد و منی کردە خۆشەویستی خۆی.

بە ئازادی منی هەڵخەڵەتاند تاوای لێهات هەموو لەشی منی بۆخۆی ئازاد کرد وە زۆر دووری خستمەوە لە دایك و باوك و خوشك وبراکانم، گوایە کە من ئازادم و پێویستم بەکەس نییە و ئابوری ئازادم هەیە لەم وڵاتە دا.





تا بە ئازادی بێ کەس بووم، ئازادیش دادی منی نەدا پاشان فێری شتێکی تری کردم کە ئەو ناوی لێنابوو مەزاج من نەمدەزانی چییە.

ڕۆژێك پێی وتم حەزدەکەیت بڕۆین بەرەو بەهەشتێك کە من و تۆ تێیدا سەرکردەبین؟

وتم: بەڵێ!

پێی وتم بۆنی ئەو سپیاییە بکە و نزیکی بکەرەوە لای لوتت بزانە چەندە جوان مەزاجت خۆش دەبێت هەرچی وت کردم، کردم، کردم، تا بەئازادی ڕسوای کردم، لە کۆتایش دا فڕێی دامە سەرجادە و تۆش وەك شتی فڕێدراوی سەرجادە منت هەڵگرتەوە، تۆزێك منت تەکاندووە لەوانەیە تۆش سوودێکم لێ وەربگریت!

کەوای وت زۆرم پێ ناخۆش بوو، بەڵام هیچ قسەم نەکرد.

کەمێك بێ دەنگ بوو دڵی پڕ بوو هەستم کرد فرمێسك بە چاوی دا وەك بۆڵە ترێ دێتە خوارێ وە لە نێو چاوانیشی دا عارەقی شەرم دەتکێ.

پێم وت ئارام بەرەوە کۆتایی بە باسەکە بهێنە گرنگ ئەوە کە تۆ ئێستا لە شوێنێکی زۆر هێمنی وە برای خۆت لە تەنیشتەوەیە و ئامادەیە هەموو خەمەکانت لە کۆڵ بگرێت.

ترێ خان پیویست ناکات ئاوا بەکۆڵ بگریت ئارام بە، شەویشمان درەنگ کردووە من دەبێت بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە تۆش پشویەکی ئەرخەوانی بدە، سبەینێ خوا یار بێ دێمەوە بۆ لات، تکایە هەست بە



هیچ ناڕەحەتییەك مەکە وەك پێشتریش پێم وتی مەبەستی من تەنها چاکەیە، دەمەوێت لە دەروازەی خێر دا ئارام بکرم، وە هیچ ئیشێکم بە تۆ نییە، جارێ بە خوات دەسپێرم من دەڕۆم ئەوەشت لە بیر نەچێت ئەو خوایەی من سپاردە زایە ناکات.

دەستم کرد بە گیرفانم دا مەبلەغێك پارەی بۆ بەجێبهێڵم نەوەك پێویستی بە پارە بێت، پارەکەم خستە ژێر سەرینەکەی و سەرم داخست و گەڕامەوە دواوە دووبارە ماڵئاواییم لێکرد،

لەژێر لێوەوە وتی خوات لەگەڵ، بەڕاستی نموونەی مرۆڤ لەتۆدا ببینم ماڵئاوا.

هێدی هێدی کەوتمە ڕی لەو شەوە دا خۆشییەك بەری دڵمی گرتبوو وە ئارامیش وەك چەرچەفێکی ناسك هەموو ڕۆحی دا پۆشیبووم، هەرچەندە کۆتەکەم لە ژوورەکەی ئەو دا بەجێ هێشتبوو، بەڵام سەرمای ئەو باکورستانە هیچ کاری لە لاشەی من نەدەکرد بۆیە زوو زووش بەدەم ڕێگاوە دەم وت وەرە ئێستا بگەڕێوە ماڵەوە بەم هیلاکییە دەست بکە بە قاپ شۆردن.

کە گەڕامەوە سەرخێڵ و یوسف لە ژێر جێگاکەیانەوە بە بێ دەنگی و بەچرپەوە باسی منیان دەکرد.

گوێم لێبوو سەخێڵ وتی: ئەوە ئەو زاڵمە گەڕایەوە هەر لەبەر ئەوەی کە قاپەکان نەشوات چۆن خۆی لە ئێمە ون کرد، ئیستا هەزار و پێنج سەد عوزرمان بۆ دێنێتەوە و ڕازیمان دەکات.

منیش چوومە نێوان هەردووکیان دانیشتم و پاڵم دا بە دیوارەکە، بە زەردەخەنەیەکەوە ئاهێکی خۆشیم هەڵکێشا.

یوسفی هاوڕێمان شاعیر بوو زۆرجار بە ئەدەبیانە قسەی دەکرد.

یوسف: دەی چیت پێیە باسی بکە بۆمان نازانم پێت بڵێم دڵت خۆشە یان بێزاریت؟

زەردەخەنەی لێوت پرشنگی خۆشەویستی دەڕوێنێ و ئاهەکەشت لەگەڵ هەناسەت حەسرەتی مەئیوسی پێوە دیارە لێت تێناگەم؟ جاروبار وا دەتبینم کە هەنگوینت لە دارگوێز دا دۆزیبێتەوە و هەناسەکەشت ئەشك و خەفەت تیایدا بەرجەستە دەبێت.

سەرخێڵ: واز لەم قسە ئەدەبیانە بهێنن چیبووە بیڵێ وا من خەریکە گوێرەکەیەکم دەبێت؟

منیش دیسانەوە ئاهێکی ترم هەڵکێشا و وتم جارێ پێم بڵێن قاپەکانتان شۆردووە یان نا تاریکە هیچ نابینم، چونکە ئەگەر قاپەکانتان نە شۆردبێت توانای ئەوەم نامێنێت کە پێتان بڵێم چی ڕووی داوە.

سەرخێڵ: توانات هەبێت خەسرەو گیان هەر منی کڵۆڵ نیم ئەبێ لە زەحمەتا جێگری تۆ بم و لە خۆشیش دا یوسف_ی برام، جا لەبەر ئەوە قسەکانت بکە بە ئارامی.

یەکسەر باسی هەناسەساردی کچۆڵەکەم کرد کە بەدوای ئازادی و یەکسانی دا وێڵ بووە ئازادی وەك زەنەقوتەی بێ دایك برسی کردووە وەك



منداڵانی بێ سەپەرشت کە هیچ هەستێکی نەبێت بۆ ژیان، یەکسانی ڕەقی کردبووەوە.

تا لە هەوری دونیا دا وەك ئاوێنە بە مەلولی خۆی لەسەر شەقامی ئەم وڵاتە دا دەبینییەوە وەك بوخچە و پریاسکەی ژنە لادێیی تەڵاقدراو لوولکرا بوو لە بەردەمی دەرگایەك دا بە چیچکەوە بوخچەکەی ڕۆحی دەمی کردبووەوە.

پریاسکەی نانەکەی کەڕووی کردبوو، هەناسەی وەك بەنەخوێنی شەڕواڵ پیسەکان ڕەوابووەوە لەنگێز ببوو، هەرەس ماتی کردبوو بورانەوەش وەك هاوسەری دەستی لەملی ئەو کردبوو، خۆشی لێ ببووە دێوەزمەیەك، ئەو چۆڵەکە و پەپولانەی کە خەیاڵی بە هەشتین بەسەرسەریەوە وەك مۆرفین و کۆردۆین سەمایان دەکرد.

تلیاك و حەشیش ببوونە ئەسپی سپی باڵدار بەرەو زەبەلاحێکی بێبەزەیی هەڵی دەگرت و دەیبرد بۆ لای کەسێك کە بە سحری وتە وای لێکردبوو لەبەردەمیا وەك یوسفی کەنعان خۆی نیشان دا.

تا ئێرە تێگەیشتووم لەوە زیاتر نەمویست دەرگای دەمی ئەو زێرابە بکەمەوە و بۆگەن و هاڵاوەکەی بەسەرم دا بێت، بۆیە زوو خەفەم کرد وەك زۆپای دار هەموویم کردە ژیلەمۆ لە سەنگەری بەرگری دا دامنا و خۆم ئامادە کرد بۆ مەتەرێزی شەرەف.

بە تەواوی بەسەرهاتەکەم بۆ یوسف و سەرخێڵ گێڕایەوە.

ئاگام لە یوسف بوو کە لەتاوان دا باوەشی کردبوو بە بەتانییەکەی دا و زوو زووش پەنجەی خۆی دەگەست، سەرخێڵی_ش دەیووت کوا پیاوەتی؟ کوا ئازادی؟

ئەمە بەس تەنها جێگایەتی بکوژرێت و لە ناو قەبردا سەربەرەو خواری دابنرێ ئاخ و حەسرەت ببوونە گۆرانی لە بەینی یوسف و سەرخێڵ دا یارییان دەکرد، یوسف وەك حەیرانی دەشتی هەولێر دەیسەندەوە و سەرخێڵ_یش وەك مەقامی بەیان وا وەیلای بوو بەلایەوە هەر دووکیشیان مۆرەی ڕقیان لەمن دەکرد، کەسێك نەبوو کە ڕقی ئەوان دامرکێنێتەوە.

وتم: من هیلاکم بەیانی (سپێدە) کە نوێژمان کرد دوعای خێری بۆ دەکەین لە پاشان ڕووەو جەستە داڕووخاو و ڕۆحە بەزیوەکەی ترێ دەڕۆین تا بزانێ کە سێ کۆڵەکە و سێ پایە لە ڕووی ئەو دا دیوان دەگرن، مەبەستم ئەوەیە یەکێکیان بۆ ژێر باڵی ڕاستی و یەکێکیان بۆ ژێر باڵی چەپی و ئەوی کەشیان لە پشتیەوە، ئامادە باشی خۆیان دەربڕی.

بخەون تا بەیانی خوا لە سوڵتان محەممود گەورە ترە کە چووینە لای، شتی زیاتر ڕوون دەبێتەوە.

سەرخێڵ لە ژێر جێگاکەیەوە هەر ئاخی قینی هەڵدەکێشا و دەیوت: ئاخ چۆن کەوتینە وڵاتێك کە غیرەت و شەڕەف مەندی بۆتە هەڵمی ئاو، زۆر بە ئاستەم دەبیندرێت.

زوو زووش پرسیاری لە من دەکرد ماڵی ترێ لە کوێیە و دایکی ترێ کێیە و ئایە باوکی ماوە ئەی براکانی ئیشیان چییە وە پرسیاری زیاتر و زیاتر.





وتم: ئەگەر دەکرێت با بخەوین بەیانی خۆت دەتوانی هەموو پرسیارەکانی لێ بکەیت ئێستا لە کۆڵی من بەرەوە هەر دەڵێی پیرەژنەکانی ئەم وڵاتەی ئەوەندە پرسیار دەکەیت.

توڕە بوو پێی وتم: گەردەنت ئازاد نەبێت، ئیتر بێ چرپە لێی خەوت تا کاتی نوێژ، هەڵساینەوە من خۆم گۆڕی و یوسف و سەرخێڵ خێرا بەدوام دا هەڵسانەوە دەستم کرد بە پێکەنین وتم: ئەگەر ئەوە کوڕێك بوایە دەهاتن لەگەڵم دا؟

یوسف پێدەکەنی و سەرخێڵیش وتی: من نایەم ئەگەر بێم لەبەر خاتری تۆیە دانیشت و دەموچاوی دا بەیەك دا من هەر بەپێکەنینەوە خێرا چوومە لای دەستم خستە سەرشانی ماچی سەریم کرد و وتم: ئەوە چییە شێتە گیان کەس ناوێرێ بڵێت بەری چاوت کلی پێوەیە،

یوسف: نا ماسکارەی پێوەیە باوی کل نەماوە.

سەرخێڵ بەزەردەخەنەوە هەڵساوە و پێڵاومان کردە پێمان و بەرەو نەخۆشخانە کەوتینە ڕێ بە قسەی خۆش و گاڵتەوگەپ چوینە ناو نەخۆشخانەکەوە.

یوسف: خەسرەو برۆ پێی بڵێ کە ئێمە هاتووین بۆ لای ئەوەك ئامادە نەبێت با ئاگادار بێت.

وتم: باشە چوومە ژوورەکەی سەیرم کرد لە ژوورەکەی دا نەبوو وا هەستم کرد کە چوبێت بە لایەك دا یان ئیشێکی تایبەتی هەبووبێت زۆر چاوەڕێم کرد، بەڵام هەر دیار نەبوو چووم لە پرسگەی نەخۆشخانەکە







پرسیارم کرد پەرستارێك وتی کە ئەم شەو درەنگ ڕای کردووە، نازانین کە بەرەو کوێ ڕۆیشتووە، بەڵام ئێمە بە تۆ هەڵخەڵەتاین وتمان کە لەلای دا دەمێنێتەوە تۆ چۆن خوشکی خۆت لەو کاتە دا بەجێ دەهێڵیت ئەی دکتۆر پێی نە وتی کە نابێت پارە یان شتی گران بەهای پێ بێت وەك زێڕ و زیوو.

زۆر سەرسام بووم وتم: نەخێر، نە ئەو خوشکی منە و نە دکتۆر هیچی بە من وتوە.

پەرستارەکە: ترێ لە ناو پەرتوکی زانیاری نەخۆشخانەکە دا ناوی تۆی بە برای خۆی بردووە بەداخەوە ئەو ڕای کردووە، چونکە پێویستی بە مادده سڕکەرەکان بووە.

دەبوو تۆش و ئێمەش زیاد لە پیویست ئاگادار بووینایە بە داخەوە!

ئیتر من تێگەیشتم کە هەڵەیەکی زۆر گەورەم کرد کە پارەم بۆ بەجێ هێشت زۆر بە مەئیوسی گەڕامەوە لای یوسف و سەرخێڵ زۆر مات ببووم.

سەرخێڵ: ها ئەوە چییە؟ چی ڕووی داوە خۆ سەلامەتە؟

وتم: نەخێر.

سەرخێڵ: مرد!

وتم: نا، بەڵام خۆزگەم بمردایە و پارەم بۆ بەجێنەهیشتایە بە داخەوە ڕای کردووە، چونکە لەشی پێویستی بە مادده سڕکەرەکان بووە.



نازانم چی بکەین بابڕۆین دیارە ئەوەی کە ئێمە چاوەڕێمان دەکرد نەبوو، خێرەکەمان تا کۆتایی نەبردە سەر، بەڵام خوا چاکەی چاکەکاران ون ناکات بەویستی خۆیەتی، با بڕۆین برایان.

سەرخێڵ: خەسرەو ئەی تۆ نەت وت کە کاتێ ترێ بێ هۆش بووە ژمارەی تەلەفۆنەکەی ئەوت لێداوە.

وتم: با وابوو.

وتی: کەواتە سەیری ناودەستییەکەت بکە بزانە ژمارەکەی چەندە؟ تەلەفۆنی بۆبکە تا بگەڕێتەوە یان بچێن بیبینین.

بۆ چوونەکەی سەرخێڵ زۆر باش بوو گەڕام بە دوای ژمارەکەیدا و دۆزیمەوە، بەڵام هەر چەندەدە پەیوەندیم پێوە کرد بەداخەوە تەلەفۆنەکەی داخرابوو.

هەرچۆن بوو ژمارەکەیم لەناو دەستییەکەم دا یادداشت کرد تا لێم ون نەبێت.

گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە ئەو ڕۆژە هەموو داوای پشومان کرد بوو لە کارەکانمان، یوسف_یش شێخ مەحشی یەکی خۆشی بۆ درووست کردبووین بۆ بەربانگ بێ ئێوە ناخۆش خواردمان.

سەرخێڵ: من دووجار قاپ پیس دەکەم جارێك لە پاداشتی دوێنێ جارێکیش ئەمڕۆ.

پاشان دانیشتین و قسەی خۆشمان دەکرد، بیرم کردەوە کە جارێکی کە پەیوەندی بە ترێوە بکەم.

بە سەرخێل_م وت: دەتوانم تەلەفۆنەکەی تۆ بەکار بهێنم؟

سەرخێڵ: دیسان بۆ ترێخان!بەکاری بێنە تا دەیدۆزیتەوە، بەڵام من تێناگەم تۆ بۆ ئەوەندە خۆتی پیوە هیلاك دەکەیت.

وتم دیارە لەبەر تەلەفۆنەکەیەتی کەوا دەڵێت، ڕووم کردە یوسف و پێم وت: یوسف ئەوەی تۆ بەکار دەهێنم.

سەرخێڵ سوێندی خوارد کە مەبەستی ئەوە نییە، بەڵکو_ مەبەستی منە دەیەوێت ئارام بم وە خۆم وابەستەی نەکەم تا ژیانم وەك جاران بە ئاراستەی سادەە و ساکاری خۆیدا بڕوات.

سەرخێڵ: خۆم و دەستیەکەشم لە خزمەت داین هەموو جارێك بە من دەڵێیت شێتە ئارام بە، بەڵام ئەم جارە سرەی منە پێت بڵێم لە من شێت تر ئارام بە، دەستمان کرد بە پێکەنین و دەستییەکەیم دایەوە دەستی سەرخێل و وتم: ڕاست دەکەیت پێویست ناکات ئەوەندە سەرتێشە بۆخۆم درووست بکەم با کۆتایی بەو باسە بهێنین خوای گەورە بمان پارێزێت چ دنیایەکە تێی کەوتووین برایان من تێناگەم ئەو کەسانەی کە باسی ئازادی ژن دەکەن دەیانەوێت ئافرەت بکەنە کەرستەیەك بۆ خۆشییەکانی خۆایان کە باس لە ئازادی ئافرەت دەکەن دەبێت ئافرەت خۆی دانەپۆشێت ئەمەش لەبەر ئەوە نییە کە مافی ئەوان زیاد بکەن، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە ئارەزووی شەهوانییەکانی خۆیانی پێ دامرکێننەوە، هەمیشە ئەو پیاوە

شەهوانییانە یان ئەوانەی کە سەرمایەداری گەورەن دەیانەوێت ئافرەت بکەنە دارستەی خۆیان.

سەرخێڵ: چۆن؟ من لێت تێناگەم دەتوانی بۆمان ڕوون بکەیتەوە.

وتم: برای بەڕێزم کاکە سەرخێڵ گیان، کاتێك کە باسی ئازادی دەکرێت بۆ ئافرەت دەیانەوێت ئافرەت ئازاد بێت نەك لەبەرامبەر خۆیان دا وەك مافی مرۆڤ، بەڵکو ئازادی لەشی دەکەن، بۆ نموونە کاتێک شۆڕشی ئافرەتان کرا لە شیکاگۆ لە ئەمریکا بۆ ئەوە نەبوو کە ئافرەتان ڕزگار بن، بەڵکو جولەکەکانی شیکاگۆ دەیانویست ئەو کارخانەیە ئیفلاس پێ بێنن کە زۆربەی زۆری ئافرەتان ئیشیان تێدا دەکرد، بۆیە دەیان ویست لە ڕێگەی ئەوانەوە کارخانەکە بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆاین کە مەسیحییەکان سەرمایەیان تێدا کۆکردبووەوە، بۆیە ئەو شۆڕشەیان ناو نا شۆڕشی ئازادی ئافرەتان.

هەر لەو کاتەوە سەرمایەداران ئافرەتیان کردە داردەست بە ناوی ئازادییەوە توانیان مۆنۆپۆلی لاشەی ئافرەتان بکەن.

ئێوە دەزانن نووسینەوەی مافەکانی ئافرەت چەند ئافرەتێکی سۆزانی نووسیویانەتەوە؟!

یوسف: چۆن؟

بزوتنەوەی ئافرەتان کە دامەزراوە بە پێی فەرهەنگی جیهانی نوێ کە لە هەناوی قوتابخانەی سەرمایە دارییەوە سەرچاوەی گرتووە، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ڕێنەسانس.

یەکەمجار لە جاڕنامەی ئافرەتێکی داوێن پیس کە ناسراوە بە (ئۆلیم دی ژۆژیە)ی فەرەنسی لە ساڵێ ١٧٩١ هاتووە، پاشان لە ١٧ ماددە پێکهاتووە یەکەم کەس کە راڤەی کردووە ئافرەتێکی وجودی خیزانی سارتەرە بە ناوی (سیمۆن دی بوفوارە) کتێبەکە بەناوی ڕەگەزی دووەم نووسراوە، پاشان ئەم بزوتنەوەی ژنانە نەهامەتییە بۆ ئافرەت لە سەدەی نۆزدەدا ئەم یەهودیە پیسانە، جموجۆڵێکیان پێ درووست کرد لە ئەوڕوپا و ئەمریکا نارەزایی و تا چەند کۆرس و سمینار و شتی لە وبابەتەیان بۆ گێڕا و دوایی لەگەڵ گەشەی مارکسیەت و شۆڕشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ زۆر گرینگی پێ درا لە لایەن مارکسییەکانەوە لە سەدەی بیست دا لەبەر کۆمپانیا گەورەکان بۆ دەستەبەرکردنی کارێکی زۆر تر و هێنانە دەرەوەی ئافرەت لە ماڵەکانیان بە پارەی کە.

ئەو ڕاپەڕینە سەرتاسەرییە ی پێ هەڵسێندرا کە لە ئێرلەندا وە دەستی پێکرد تا ئوستراليا، داوای ڕیزگرتن و مافی سیاسی و کۆمەڵایەتی دەکرا.

کە بەدرێژایی مێژووی ئیسلام ڕێز و حورمەتی لە ئافرەت گرتووە لە هەموو کایەکانی ژیان بەژداری پێ کردووە، مەگەر هەندێك پۆستی دژوار و سەرەکی نەبێت لەبەر سۆز و هەست ناسکی ئافرەت لە هەندێك پۆست دوور خراوەتەوە، لە بەڕیتانیا بەهەمان شێوە ئافرەتێکی دەم شڕ و داوێن پیس بە ناوی (پانك هریست) کە لەبەر جوانی و شەدەلاری کچەکانی کە زیاد لە ١٩ کچی هەبوو هیچی کچی خۆی نەبوو، بەڵکو ئەو ئافرەتانە بوون بۆ لەشفرۆشی بەکار دەهاتن پیاوانی شەهوەت بازیش بۆ خاتری جوانی و تێری حەزی خۆی و ماستەوکردنی لەبەردەم ئافرەت بزوتنەوەکانیان بە ناوی کچەکانی میسز پانك ناونرا.

له ئەمریکای سەرمایە داری لە ویلایەتی وایۆمینگ لەساڵی ١٨٦٩ مافی ئافرەت درا کە تانها مافی دەنگ دانیان هەبێت ئەویش ئافرەتی سپی پێست، ڕەش پێست هەر حیسابی بۆ نەدەکرا بۆ پیاوەکانیشیان، ئەویش لە ١٩٢٠ لە دەستووری ئەمریکی بووە قانون بڕیاری لەسەردرا و تۆمار کرا، لە نیوزلەن دا ١٨٩٣، لە ئوستراڵیا ١٩٠٢، لە نەرویج و سوید و دانیمارك ١٩١٣، لە کەنەدا ١٩١٧، لە بەریتانیا و نەمسا وپۆڵەندا و مەجەر و چیکۆسلۆڤاکیا و ڕوسیا ١٩١٨، بەلجیکیا ١٩٤٥، بۆ زانیاریت وڵاتی سەرمەشقی عەلمانی کە فەڕەنسایە ١٩٤٦ تەنها مافی دەنگدانیان بەخشیە ئافرەت، دوای هەریەکە مەدرەسەیەکی درووستکرد بە ناوی قوتابخانەی شوعییەت، سۆسیالیستەکان، لیبراڵ دیموکراسی و مەدرەسەی ئایینی جولەکە و مەسیحی، کە مەسیحی و جولەکە ئافرەت بە ڕۆحی پیس دەزانن بۆ خزمەتی پیاو درووست کراوە.

ئەمە مافەکانیانە، بەڵام بە خۆیان نازانن کە مافیان تەنها لای پیاو ڕووتکردنەوەیانە بۆ حەزی پیاو.

لە ئیسلام دا مافی ئافرەت لە سەردەمی خدیجە_وە (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەستپێدەکات کە سەروەت و سامانی خۆی بۆ پشتیوانی هاوسەرەکەی دەخاتە کار و یەکەم شەهیدی بۆ خەباتکردن سومەییە_یە.

ئیتر ئەمانە سەرمەشقی ئەم پەیامەن، یەکەم پاسەوانی ئافرەت ئوم عیمارە_یە، یەکەم موفتی خاتوو عائیشە_یە (ڕەحمەتی خوای لێبێت) یەکەم بەرپرسی حەسبە ئافرەتە خەولە، یەکەم دەنگی ئۆپۆزسیۆن ئافرەتە لە ئیسلام دا کە هەڵسایەوە بەدەم عومەری کوڕی خەتاب دا وتی تۆ ناتوانیت دەستنیشانی مارەییمان بکەیت، زۆری تر لەم باسانە.




هەروەها بۆیە لە جێگا گشتییەکان دا ئافرەتە جوانەکانیان دادەمەزراند، بۆ ئەوەی جێگای سەرنج بن بۆ پیاوە شەهوانییەکان وە کۆکردنەوەی سەرمایە بێت بۆ پیاوە دەوڵەمەندەکان.

باشە بۆ سەرپۆش بووە بە مۆرکی ئیسلام، من پێموایە ئەوان تەنها دەیانەوێت ئەو حورمەت و ئازادی و خۆشبەختیەی کە ئیسلام داویەتی بە ئافرەت بی پوکێننەوە تا ڕەوشت لە فەرهەنگی ئەوان دا نەمێنێت وە لەبەر شەهوەتی خۆیان ئافرەتان ئازاد بکەن، بەڵام چۆن ئازادییەك کە ئازادی بێت تەنها بۆ کڕین و فرۆشتن و لە تەنیشت کاڵاکانی خۆیان دا بازرگانیان پێوە بکەن ئەم داپۆشینە تەنها لەسەر ئیسلام کراوە بە ماڵ، کە چی بەهەمان شیوە لە ناو هەموو ئایینەکان دا ئافرەت نابێت ڕووت بێت بێجگە لە ئایین لە فەرهەنگی زۆربەی زۆری وڵاتان دا بە تایبەتی فەڕەنسا سەرپۆش باو بووە تەنانەت بۆتە مۆدێلێکی جوانی خۆیان کە پێی دەڵێن مۆدێلی لەچکی فەڕەنسی.

پێش هاتنی ئایینی ئیسلام، لە کلتور و فەرهەنگی میللەتان دا هەمیشە ئافرەتان داپۆشرا و بوون تا ئەوکاتەی شۆڕشەکەی شیکاگۆ کرا، تەنها بۆ ئازاد کردنی لەشی ئافرەتانی دونیا بوو.

بۆ نمونە ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ پێشینەی گەلی کورد ئەوان هەردەم داپۆشراو بوون زیاد لە پێویست، بەڵام ئیسلام هات تۆزێك ئاسانتری کرد، چونکە ئەو وەختە سەروفێست و کۆڵوانە و چارشیو یان عەبایان بەکاردەهێنا خۆ ئەگەر سەیری سەروفێست بکەین زۆر گران بوو بەسەر ئافرەتانەوە بە هەرجۆرێك بێت ئەمانە دەیانەوێت ئافرەت وەك ترێ لێ بکەن، هەمیشە وەك لۆتییەکان دەهۆڵێك و مەیمونێك بە دوای خۆیان



دەخەن دەڵێن ئیسلام دوو ئافرەت بە شاهیدێك قبوڵدەكات ئەم قەوانە ئەوەندە لێدراوە كورد وەتەنی قەوانەكەیان سواوە.

دەتوانم بڵێم كە ئافرەت لای ئێمە شازادە و ئێمەش خزمەتكاری ئەوانین، بەڵام بە داخەوە زۆربەی زۆری ئەو ئافرەتانە لەمە تێناگەن و نازانن كە ئەوان مامۆستا و بونیادنانی خێزان لە ڕووی ڕەوشتەوە لە ئەستۆی ئەوان دایە كەچی داوای مافەكانیان لە پیاو دەكەن، دەبوو ئەوان مافەكانی خۆیان بەسەر پیاوان دا بسەپێنن و سەرچاوەی مافەكانیان لە قورئانەوە وەربگرن كە خوای گەورە مافی ئەوانی دابین كردبێت كەواتە موسڵمانان لە ئاست فەرمانی خوای گەورە دا ملیان تاڵە موویەكە، بۆیە دووبارەی دەكەمەوە كە ئەوان سەركردە و ئێمەش جەنگاوەر.

ئاگادار بووم سەرخێڵ سوور ببووەوە بۆیە خێرا وتی: ئەرێ خەسرەو تۆ ئافرەتت كرد بەچی وات لە من كرد كە نەوێرم لە ژیانما ژن بهێنم زۆر قورسی مەكە لەسەرمان.

وتم: سەرخێل، برام ئەمە راستییە دەبێ هەموو بزانین كە ئێمەی پیاو بێدادین و ئەوانیش خۆیان ساویلكەن هەمیشە داوای ماف لە پیاو دەكەن بۆیە دووبارەی دەكەمەوە دەڵێم سەرخێڵ گیان ئەگەر ئەوان تێگەیشتبێتن لەو پەرتووكەی كە خوای گەورە ناردوێتی بە خەڵات بۆ محەممەد (دروودی خوای لێبیت) ئوممەتی ئیسلام ئەویش كە فەرقیانە واتە فەرقە لە بەینی حەق و باتڵ دا دەبێ لەو دەقانەوە مافەكانی خۆیان بەدەستبهێنن لەو كاتە دا زەنگی تەلەفۆنەكەی من لێی دا، بەڵام دیار نەبوو كە لەكێوەیە كە هەڵم گرت، ترێ بەدەنگێكی ناسكەوە وتی: ئێوارە باش كاك خەسرەو، داوای لێبوردن دەكەم كە نەدەبوو ئاوا بەجێت بێڵم، بەڵام

توانام نەمابوو دەبوایە هەڵبێم لە دەست چارەسەرکردن، خۆت ئاسایی نەك بم بەخشە بەڵکو گەردەنم ئازاد کە چەند خۆش بوو کە گوێم لە وشەجوانەکانت بوایە لە دەمی گوڵبارانی تۆ ڕۆحی منی بۆن خۆش ئەکرد، بم ببورە من زۆر بێ هێزم داوات لێدەکەم دەستم لێ بەرنەدەیت.

وتم: تەلەفۆنەکەت داخراوە، بیکەرەوە تا من پەیوەندیت لەگەڵ بکەم.

وتی: دوو سەعاتی کە تەلەفۆنەکەم دەکەمەوە من پارەم پێنەما جارێ بەخوات دەسپێرم.

ئاگادار بووم کە قوڕگی پر بوو لە گریان، بەڵام بە زۆر خەفەی کرد دیسان هەوای ترێ کەوتەوە ناو هەست و بیرم.

سەرخێڵ و یوسف وتیان: یارمەتی بدە، چونکە زۆر بێچارەیە بەڵکو خوای گەورە توشی خێرمان بکات.

وتم: باشە، با چاوەڕێبین تا دەستیەکەی دەکرێتەوە.

هەر چۆن بوو کاتمان بردە سەر تا کاتژمێر ڕابوورد تەلەفۆنم کردەوە بۆی، بەڵام دەستیەکەی داخرابوو کەمێکی تر چاوەڕێمان کرد دووبارە پەیوەندیم پێوە کرد زەنگی لێ دا خۆی بە دەنگێکی هێمنەوە وتی: بەڵێ!

پرسیم بۆ نەخۆشخانەکەت بەجێ هێشتووە تۆ نازانیت کە پێویستت بە چارەسەر هەیە؟

کەچی ئەو هەر قوڵپی گریانی دەدا لێی پرسیم کە کەست لەلایە؟ من لەبەر ئەوەی کە ئەو شەرمەندە نەبێ وتم: نەخێر.

ترێ: ئەگەر دەکرێت من دێم بۆ لات، چونکە زۆر پیویستم بە حەوانەوە هەیە زۆرماندووم ئەکرێت بۆ چەند سەعاتێك بێت بێمە لای تۆ تا بحەسێمەوە؟

وتم: فەرموو وامن چاوەڕێت دەکەم، بەڵام من لەگەڵ دوو هاوڕێم دا دەڕێم دوای سەعاتێك ئەوان دەگەڕێنەوە ماڵەوە.

لەبەر ئەوە وام بە ترێ وت بۆ ئەوەی هێلێکی پێشین بۆ خۆم و یوسف و سەرخێڵ دا بنێم.

وتم: بە زوترین کات وەرە، تەلەفۆنەکەم داخستەوە.

یوسف و سەرخێڵ خێرا خۆیان پێچایەوە وتیان: دەڕۆین، بەڵام من ترسێکم بۆ دروست ببوو نەم دەزانی چییە؟

بە سەرخێڵ و یوسفم وت ئەگەر کرا دوای هاتنی ئەو بە کاتژمێرێك بگەڕێنەوە، چونکە نەوەك شتێکی لێبێت و بەسەرم دا ساغبێتەوە.

سەرخێڵ دەستی کرد بە پێکەنی و وتی: بۆ بەتەمای چی؟ ئاگاداری خۆتبە.

خۆ ناتخوات لەوانەیە داوای پارەی تر بکات بۆ مەزاجەکەی ئەگەر وابوو پشتە ملی بگرە و فڕێی دەرە دەرەوە.

پاش چەند خولەکێکی کەم لە جێگایەکی کەوە پەیوەندی کردەوە وتی پاش پێنج دەقیقەی تر من دێمە بەردەم ماڵەکەت.

وتم: باشە، زۆرم بەلاوە سەیر بوو زوو ماڵەکەم پاك کردەوە هەوای ژوورەکەم گۆڕی و ئاوم گەرم کرد تا چایی ئامادە بکەم، پسکیتم خستە سەر قاپ و خۆشم پێکەنینم دەهات، وام دەزانی کە ئەلیزابێتی یەکەم ڕوو لە ماڵەکەم دەکات.

بە ئاستەمێك چوومە بەردەرگای باڵەخانەکە و دیم وا بەکەساسی ڕووە و من سەر دەکێشێت و کۆتەکەمی لەبەر دایە، دەستی خستۆتە ناو گیرفانی و وەك هەوری ڕەش چۆن مانگی تابان دەگرێت ئاوا شەرم ڕووی ترێی گرتبوو بە کەساسییەوە سڵاوێکی کرد.

ترێ: ببورە من مایەی ناڕەحەتی و سەر ئێشە بووم بۆ تۆ.

وتم: خوا بتبورێت خوشکی ئازیزم، تۆ خوشکی بەڕێزی منیت ئەگەر هەردوو خوشکەکەی خۆم لێرە بوونایە هەر ئەوەندەی تۆ بەڕێز و خۆشەویست بوون فەرموو بابڕۆینە ماڵەوە ماندوو دیاریت، من پێش کەوتم و ئەویش بە دوام دا.

بردمە ماڵەوە بە هێمنی شریتێکی قورئانم خستە سەر چووم بەلای چا تێکردن، بەڵام کاتێك گوێم لە ئاوازی منشاوی بوو کە سوڕەتی مەریەمی دەخوێندەوە، هەموو گیانم ئارامی باڵی بەسەر دا گرتبوو لە دەروازەی بەهەشت و دۆزەخ دا خۆم دەبینمەوە چوومە لای تەسجیلەکەوە و کزمکرد کە بەئاستەم گوێم لێبوو.

وتم: ترێ خان بۆ ڕۆشتی لە نەخۆشخانە زۆر بێ تاقەت بووم.

بۆی گێڕامەوە کە لاشەی پیویستی بە ماددەی سڕکەر هەبووە دەبوایە بڕۆشتایە.

وتم: دەکرێت من برا بچوك یان ناوی لێبنێ کوڕی خۆت یان من قوتابی و تۆ مامۆستا چیت هەیە بیگێڕەوە ئەگەر چاك بوو بافێربم خۆ ئەگەر خراپ بوو با خۆمی لێ دوور بخەمەوە وا بزانە کە من تەنها بۆ گوێگرتن درووستکراوم فەرموو با گوێم لێبێ بیگێڕەوە با یارمەتی یەکتری بدەین؟!.

ترێ: زۆر باشە، بەڵام سوێندم بۆ بخۆ کە ئەوەی پێت دەڵێم تەنها بەینی خۆم و خۆت بێت.

وتم: ناتوانم سوێند بخۆم لەبەر ئەوەی من دوو هاوڕێم هەیە ناویان سەرخێڵ و یوسفە وە ئاگاداری هەموو شتێکی تۆن تا ئەو کاتەی هاتویتە لای من، چونکە من و ئەوان یەك گیان و یەك باوەڕین، جوانتر بڵێم تەواوکەری یەکترین.

ئەوەش بزانە کە چەپڵە بە دەستێك لێنادرێت.

سێ ژیری بکەونە کار باشترە تایەك دانە، لێرەوە سوێندت بۆ دەخۆم کە ئەوان لە من دڵسۆزترن بۆ تۆ.

ترێ: لە چاوی تۆوە بڕوادەکەم بەوانەی کە تۆ پشتگیریان دەکەیت، چونکە بە ڕاستگۆیی هەموو شتەکان دەخوێنمەوە لە تۆ دا.




قسەکانیم پێ بڕی و وتم: خوشکی ئازیزم ئەگەر دەکرێت با بانگیان بکەین بڕوام پێبکە کە ئەوان پشتگیری تۆ و منیش دەبن، چونکە ئەوان لە دەروازەی میحراب دا پەروەردە کراون هەر چۆن بێت کۆڵەکەن بۆ تۆ.

ڕازیم کردوو ئەوانیشم بە تەلەفۆن بانگ کردەوە.

سەرخێڵ و یوسفم پێناساند، بەڵام ترێ سەرسام بوو لەوەی کە دەستی برد تا لەگەڵ یوسف تەوقە بکات، بەڵام یوسف تەوقەی لەگەڵ نەکرد، بەڵکو دەستی گرت بە سینگییەوە بۆی، بەڵام سەرخێڵ دەستی هێنا و بەگەرمی لاواندییەوە و بە خێرهاتنی کرد، لە دوایدا دانیشتین وەك منالێك چۆن داپیرە چیرۆکی بەر ئاگردانیان بۆ دەخوێنێتەوە گوێ بیستی قسەکانی ترێ بووین.

هەموو لە ئاستی ئەو دا سەرمان داخستبوو بۆ ئەوەی بتوانێت بە ڕاشکاوانە قسەکانی خۆی بکات.

دیاربوو ترێ کەشێکی باشی بۆ درووست ببوو ڕەوشەکەی بەلاوە سەیر بوو بۆیە وتی: پێشتر زۆر سانا بوو بەلامەوە کە لەگەڵ پیاوان دا قسە بکەم بەبێ هیچ پەردە و شەرمێك، بەڵام لەگەڵ ئێوە دا زۆر شەرم دەکەم هەر چۆن بووە قسەکانم وەك خۆی دەگێڕمەوە ئەگەر توانیتان یارمەتیم بدەن خۆ ئەگەر نەتان توانی لەبیریکەن ناوم با نەزڕێت لەوە زیاتر ئەگەر زۆریشم بۆهات خۆم دەکوژم.

وتم: ئێمە بە دڵنیایەوە جێگای باوەڕی تۆ دەبین تکا دەکەم بەردەوام بە ئێمە گوێبیستین فەرموو.



ترێ: له دوای ئەوەی که خۆم فێربووم به کۆردۆین و مۆرفین بەکارهێنان، ئێستا ئازاد داوای ئەوەم لێ دەکات که هاوڕێکانی خۆم فێربکەم و له گەڵیان دا بیفرۆشم ئەوان باندێکی زۆر گەورەن له دوو کەسی ئەلبانی و سێ کەسی فارس و چوار کورد و به منەوە پێنج ئافرەت که دووانیان بێ چارە کراون فارسن و ئەوانی که خەڵکی وڵاتی باکورن وە سەرۆکی ئەم باندە پیاوێکی دەوڵەمەندی ئەم باکورەیە ناوی (فین ئەندریاسە) ئێستا ئەگەر من شکایەتیان لێ بکەم خۆم ماڵ وێران دەبم، چونکە کەسێکی کە ناناسم تا بتوانم ئەم ماددەیە بۆ خۆم دەستەبەر بکەم، له هەردوو لاوە ڕۆچووم ئەگەر وازبێنم ئەوا ئەوان خەڵکی کەی وەك من فێردەکەن بۆیە پێتان دەڵێم توخوا یارمەتیم بدەن، ئیتر ئەوەندە گریا فرمێسك و هەنسك ودەنگی تێکەڵی یەك ببوون.

یوسف تەحەمولی نەما دەستی کرد به گریان، سەرخێڵ لەتاوان دا لیوی خۆی دەگەزی و منیش وەك بیری ئیرتوازی هەناسەکەم قوڵتر دەبوو.

سەیرێکی یەکتریمان کرد و یوسف وتی: برایان چی بکەین؟

سەرخێڵ وتی: بابچین بیان کوژین!

یوسف وتی: سەرخێڵ گیان ئەوە ڕێگا نییە و به ئێمە ناکرێت، چونکە ئێمە پیاو کوژ نیین.

سەرخێڵ هاواری کرد وتی: ئەی چی بکەین؟ چی دەبیلێن.

من بێ دەنگی دایگرتبووم نەم دەزانی کە بۆ کوێ هەنگاو بنێین.




یوسف کوڕێکی زۆر ئیماندارتر بوو لە ئێمە پێی وتین: گوێ بگرن برایان ئەوەی ئێمە مەبەستمانە ترێ_یە.

یەکەم: بابزانین چۆن ترێ بپارێزین لە دەستی ئەوانە و بشتوانین کە ئەو ماددەیەی بۆ دەستەبەر بکەین.

دووەم: هەموو یاساکانی دوونیا دژی ئەو کارەن با ئێمە بەرپرسانی لێ ئاگادار بکەینەوە ئەوانیش ڕێگامان بۆ دادەنێن و لە دوعای خێریش یەکتر بێ بەش ناکەین.

بەلای منەوە ڕاکەی زۆر پەسەند بوو..

یوسف: ئەگەر هاتوو سەری نەگرت ئێمە لە دینەوە فێری ئازایەتی بووین وە هەر بەم ئایینە پیرۆزە زەلیلیان دەکەین، چونکە کاری ئێمە بۆ خوایە وە خوای گەورە پشت و پەنای لێقەوماوانە بۆیە پێتان دەڵێم بە قسەم بکەن و بە هێمنانە کارەکان ئەنجام بدەن.

سەرخێڵ: چۆن؟

یوسف: برام هێمن بە زۆر ئاسانە ئەو کەسانەی کە بەدوای خراپە دا دەگەڕێن زۆر ترسنۆکن من لەگەڵ ترێ_ دا دەچم بۆلای پۆلیس و لە وێ سکاڵای خۆمان دەکەین، بەڵام ترێ دەبێت پەیمانم بداتێ کە لە قسەی من دەرنەچێت.

ترێ سوێندی بۆخوارد بە سوێندێکی سەقەت.



یوسف: ئەو سوێندەی کە من لە تۆم دەوێت سوێند خواردنە تەنها بە ناوی خوای پەروەردگار دەستپیبکات تا ئەویش کۆمەکیمان بکات.

ترێ زۆر بەشەرمەوە وتی بە خوای پاك و بێ گەرد سوێند بێ لە قسەت دەرناچم.

یوسف: پاش ئەوەی لەلای پۆلیس ڕۆشتین دێینەوە ماڵەوە بەیەکەوە دەچین بۆ نەخۆشخانە و سەر لە نوێ ناوت تۆمار دەکەینەوە دیاربوو یوسف شارەزا بوو، چونکە خۆی جێگری پزیشك بوو واتە (معاون طبي) بوو بۆیە بەرنامەی هەموو شتەکانی بۆ ترێ داڕشت و وتی: دەبێت شتێکی ترم بەقسە بکەیت کە لە هەمووی گرنگترە ئەویش ئەوەیە کەمن فێری قورئان خوێندن و نوێژ کردنت بکەم، تا بە یادی خوای گەورە هەموو ناڕەحەتییەکانت لە بیر بچێتەوە، چونکە تەنها بە یادی خوا دڵ و دەروون و لاشە وڕۆح ئارام دەبێت هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت ﴿... أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ﴿٢٨﴾﴾ [الرعد] ئاسایی خۆت دەچێیتەوە دۆخی جاران با ئێستا ترێ بچێت ئیسراحەت بکات ئێمە ماڵەکەی بۆ چۆڵ دەکەین تا بەیانی با خۆی لەماڵەوە بێت، من خێزانی کوڕێکی هاوڕێم دەنێرم بۆ لای ئێمەش دەچین بۆ لای ئەو هاوڕێیەم.

هەڵساینەوە سەرپێ و خواحافیزیمان لە ترێ کردوو بەرەو ماڵی هاوڕێکەی یوسف کەوتینە ڕێ کە گەیشتین یوسف لەگەڵ کاك ئەحمەد_ی هاوڕێی کەوتە قسە و بە جوانی لە خۆی و خێزانەکەی گەیاند و پێشنیاری کرد کە خیزانی کاك ئەحمەد دەستێ جل بۆ ترێ بەرێت.

ئەو شەوە تادرەنگێ هەر لە مشت و مڕ دا بووین وە بەیانی یوسف و ترێ کارەکەیان گەیاندە ئەنجام.




دوای مانگێك هەموو باندەکە گیرا ترێ_ش دوای سێ مانگ لە خەستەخانە چاك بوویەوە و چەند مانگێك زیندانی بۆ دەرچوو، بەڵام چاوەڕێی دەکرد و هاتەوە سەر بار و دۆخی جارانی خۆی.

پاشان سەرخێڵ دڵی چوو بە ترێ دا و مارەی کرد، ئێستا کوڕ و کچێکی جوانیان هەیە کوڕەکەیان ناو ناوە توانا وە کچەکەشی ناو ناوە نور ژیانێکی خۆش دەبەنە سەر.

خێزانەکەی یوسفیش لە کوردستانەوە گەیشتنە ئەم وڵاتە.



## چیرۆکی سیانزەیەم
## (سەرەتای تێکەڵ بوونم لەگەڵ پاکستانییەکان و عیشقی لیندا)

دوای ئەوەی هاوڕێکانم جێیان هێشتم و هەریەکە بەلای کار و بەڕێوەبردنی ماڵ و ژیانی خۆی بوو، منیش بەتەنها لە شوقەکە دا مامەوە ڕۆژانە دەچوومە سەرکارەکەم.

وڵاتی نەرویج بڕیارێکی دەرکرد کە ئیقامە لە دوو هەزار کوردی عێراقی وەردەگرێتەوە، یەکێك لەوانە بەندە بوو کە بەر ئەو بڕیارە کەوتم.

بەم هۆکارەشەوە کارەکەم لە دەست دا، سەرەتا ڕێگای کارکردنم هەبوو، بەڵام دەبوو مانگانە بچوومایە نوێم بکردایەتەوە ئەو کۆمپانیایەی من کارم بۆ دەکرد ئەوەی قبوڵ نەکرد و کارەکەم لە دەست دا.

کرێی شوقەکەم زۆر گران بوو، ئەو بڕیارەش بووە هۆکاری ئەوەی کە زۆرێك لە کوردەکانی ئەو وڵاتە بەجێبهێڵن و بڕۆن بۆ بەڕیتانیا، منیش ئەو بیرۆکەیەم لە مێشك دابوو، بەڵام نەمکردبووە بڕیار.

بەیانییەك بەلای مارکێتێك دا ڕۆیشتم نوسرابوو خەڵکمان پێویستە بۆ کار، مەرجی وەرگرتنی کەسەکەش دەبوو بیزانیایە لە کاشێر و داواکردنی

کەرستەی مارکێتەکە و ناوی هەموو کەرستەکانی بزانیایە بە زمانی نەرویجی و هەندێك مەرجی تریش.

لە ڕاستی دا هیچم نەدەزانی تەنانەت زمانەکەشم باش نەبوو، پێشتر بەقاڵی و کاری کرێکاریم دەکرد، چوومە ناو مارکێتەکەوە کچێك لەسەر کاشێرەکە دانیشتبوو، بە زمانی شەق و ئاڕیکوی خۆم وتم: دەمەوێت قسە لەگەڵ بەڕێوەبەر بکەم.

کچەکە زۆر بەئەدەبەوە هات و بە پێکەنینەوە بردمیە بەردەمی دەرگایەك لە پشتی مارکێتەکە، هاواری کرد عاتیف عاتیف، کوڕێکی گەنجی پاکستانی هاتە دەرەوە، تەوقەمان کرد وتی: فەرمووو؟

بە ئاسایی پێم وت بە دەرگای مارکێتەکەوە ئیعلانێکم بینیوە هاتووم کار بکەم.

عاتیف: لە ئیشی مارکێت دەزانیت؟ هیچ ئەزمونێکت هەیە؟

وتم: بێخەمبە هەموو کاری خۆمە، بەڵام تۆزێك زمانەکەم باش نییە.

وتی: نا_ زمانەکەشت باشە ئێستا بڕۆ دەست بکە بەکار.

وتم: بەشە، ئەو کارەش لە نەرویج دا نادرێت بە هەموو کەسێك دەبێت زۆر شارەزا بیت و بتوانی موشتەری بەڕێ بکەیت.

زۆربەی کوردەکانی ئەو وڵاتە کە خاوەن جنسیەش بوون ئەو کارەیان وەرنەدەگرت، من تەنانەت ئیقامەکەشم لە دەست داوە.

عاتیف هاواری کرد لە کچی سەر دەخیلەکە لیندا، لیندا وەرە ئەو هاوکارە نوێیە بەرە فێری هەندێك شتی بکە.

لیندا: چۆنی باشی، چی دەزانی لە کاری مارکێت؟.

وتم: زۆر شت، بەڵام لەبیرم چۆتەوە هەندێکم فێربکە.

لیندا دەستیکرد بە قسەکردن، خۆی لە بنەڕەت دا دایکی نەمسای بوو باوکیشی نەرویجی بوو وای دەزانی من نەرویجییەکەم زۆر باشە و موهیمە وەك نەرویجی مامەڵەی لەگەڵ کردم.

من هەرهیچ تێنەگەیشتم، بە زمانی نەرویجی هەر دەمووت یا، یا، واتە بەڵێ.

هیچم نەدەزانی کاتی نوێژی نیوەڕۆ بوو، چوومە پشتی مارکێتەکە دەستنوێژم گرت و نوێژم کرد، هاتمەوە بۆ ناو مارکێتەکە هەر هەڵدەخولام هیچم نەدەزانی.

لە دوای کاتژمێر دووی دوای نیوەڕۆ کوردێك خۆی کرد بە مارکێتەکە دا و چووە ژوورەوە، هاوتەمەنی خۆم بوو جلی گۆڕی و دەستی کرد بە کار و لیندا ڕۆیشت، چوومە لای و وتم: کاکە ناوم خەسرەو_ە و من هیچ نازانم ئیقامەشم نییە ئەمڕۆ دەستم کردووە بە ئیش، تکایە هاوکاریم بکە با دەرنەکرێم زۆر پێویستم بە کارە، وام دانابوو کوردە هاوکاریم دەکات!.

وتی: باشە هەرچی چووم بەدەوری دا هیچی پێ نەدەوتم فێری هیچی نەکردم، دوایی چوو بووە لای خاوەن کارەکە بە دزییەوە شکایەتی لێ کردم و وتبووی ئەم کوڕە بۆ لێرە کار دەکات ئیقامەی نییە!.

عاتیف بانگی کردم، وتی: ببورە تۆ بەیانی مەیەرەوە بۆ کار، ژمارەکەت دابنێ کەی پێویستم پێت بوو بانگت دەکەم.

زانیم دەرکرام منیش هیچم نەووت ٤٠٠ کرۆنی دامێ وەرمگرت و هاتمە دەرەوە.

لە پشتی مارکێتەکەوە ڕۆییشتم تەماشام کرد دوو پیاو کوڕێکیان داوە بەسەر سەیارەیەك دا لێی ئەدەن، هەموویان پاکستانی بوون.

شەڕی پاکستانیانیش زۆر ترسناکە لە نەرویج تایفەیان هەیە، بە دەمانچە و سیلاح شەڕ دەکەن.

من لە دوورەوە چاوم لێبوو زۆریان دا لەو کوڕەی تر بەو دوانە.

منیش ڕامکرد بۆ ناوبژی، بۆ ئەوەی نەهێڵم شەڕ بکەن، هەرچی بە نەرویجی وتم برا مەکەن برا وامەکەن!بەخوا یەکێکیان یەك شەقی هەڵ دا لە من خوا ڕەحمی پێکردم لە پیاوەتی نەکەوتم.

زۆر ئازارم پێ گەیشت، ئینجا منیش کەوتمە کوتانی ئەو کەسەی کە شەقەکەی تێهەڵدام، من حەقی شەقی خۆم دەکەمەوە نازانم ئەوە کێ بوو کە لێیانی دەخوارد، ئەویش کە منی بینی باش شەڕدەکەم ئازا بوو.



ئەوەی تریانی گرت و دەستی کرد بەلێدانی، بەڵام من زۆر داخ لە دڵ بووم شەقێکم بە ناحەق خواردبوو، وازم لێ نەدەهێنا، لەوانەیە دەجار پیاما کێشابێت.

تۆزێکی پێ چوو سەیارەیەکی تر هات دوانی تری تێدابوو، نەمدەزانی لاشی ئێمەن یان دوژمنن، بە کوڕەکەم وت: ئەمانە فامیلی تۆن؟

وتی: ئەمانە کیسە گون (جنێوێکی نەرویجیە) بۆ شەڕ هاتوون.

لە دڵی خۆم دا وتم باش خۆم تووش کرد، لە هەوڵی ئەوە دابووم ڕاکەم، لەبەر خۆمەوە وتم جا من حەقی ئەو هەتیوەم چییە با ڕاکەم.

بەخوا یەکێکیان بۆم هات لە ئەمیتا بابا جان دەچوو، زۆر درێژ بوو.

چوومە لای کوڕەکەوە وتم: چەقۆ دار بەرد هیچت پێ نییە؟

وتی: ئەوە سەیارەکەمە تێیدایە، فریانەکەوتم دەستیان وەشاند، منیش هەرچۆن بوو دەستم وەشاندەوە و خۆم گەیاندە لای سەیارەکەی، داشبۆردی سەیارەم کردەوە دەمانچەیەکی تێدابوو.

لە دڵی خۆم دا وتم: ئەی بە قوربانی ئەو خوایە بم، ئیشم دەڕوات، ٧ ملمێکی زۆر باش و تازە بوو، ئەوەندە جوان بوو خەریك بوو ببەم بۆ خۆم هەر شەڕنەکەم، بەڵام ئەو کەسەی کە لە ئەمیتا باباجان دەچوو وازی لێنەهێنام هەر دەهات بۆلام، وای دەزانی من باوکیم کوشتووە، میلی دەمانچەم هێنایەوە و ڕووم تێکرد، سوپاس بۆخوا لاڵ بوو دەمی دەهات




بەیەك دا بە پاکستانی هەر تێنەگەیشتم، منیش بە کوردی جنێوم ئەدا بەخوا ئەوانی تر ڕایان کرد و سەیارەکەیان بەجێ هێشت.

کوڕە پاکستانییەکە هاتە لام، بە هەردووکمان یەك دوو شەقمان لە درێژەکە دا ئەویش ڕایکرد، دەمانچەکەی لە من سەندوو خستییەوە ناو سەیارەکەی، تێلایەکی دەرهێنا لە سەیارەکەی خۆی دا دەستی کرد بە جام شکاندنی سەیارەکەی ئەوان، ئاودییەکی زۆر جوان بوو ئینجا من ئەوم دەگرت.

کراس و شتەکەم هەموو دڕابوو.

ئەو کوڕە بە منی وت سەرکەوە با بڕۆین خۆمان بگۆڕین، سواری سەیارەکەی بووم هەر سوپاسی دەکردم، بە نەرویجی قسەی زۆر دەکرد لێی تێنەگەیشتم، لە بەردەم ڤێلایەک دا وەستا چووینە ژوورەوە، ژنێك و پیاوێکی پیر هاتن بەرەو ڕوومان و لەگەڵ ئەو دا قسەیان دەکرد، منیش هەر لەبەر دەرگاکە ڕاوەستاوم.

دوایی کە تەواو بوون بیریان کەوتە دەمنی لێیە ناردمیانە حەمامەکەی خۆیان، دەموچاوم شۆرد بەس هەر خوێن دەهات بە ڕوومەتمەوە جێگای چڕنوکی ئەوان بوو.

کراس و پانتۆڵی خۆی بۆ هێنام لەبەرم کرد تۆزێك گەورەبوو بەس چار نەبوو، ئەوانەی خۆم بەکەڵك نەدەهات لەبەری بکەمەوە.

دانیشتین دوای نان خواردن، عاتیف خاوەن دوکانەکە خۆی کرد بەژوور دا و تەماشای منی دەکرد و بە پاکستانی لەگەڵ کوڕەکە دا قسەی دەکرد، زانیم ئەو کوڕە ناوی شاهیدە.

عاتیف و شاهید برابوون، شاهید برا گەورەی بوو خاوەنی مارکێتەکە بوون ٤ مارکێتی تری هەبوو، باوکیان ناوی موشتاق بوو.

من نەمدەزانی چی دەڵێن دوای چەند کاتژمێرێك خواحافیزیم کرد و پاشان وتم: ئەوە ژمارەی من لای عاتیف هەیە چیتان پێویست بوو من ئامادەم.

کەوام وت شاهید وتی بەیانی وەرە بۆ کار!.

وتم: کام کار؟ ئیشی مارکێت یان شەڕ؟!

شاهید دەستی کرد بە پیکەنین و وتی: تۆ برای منیت، بەیانی وەرە خۆم لەوێم یەکتر دەبینین.

بەیانی کە چوومەوە مەوقیفم بەهێز بوو وتم: شاهید من زمان نازانم وەرەقەی کارم هەیە، بەڵام ئیقامەم نییە، واتا من ئیشی سپی دەکەم، ژمارەی بانقیشم هەیە هیچ کێشەم نییە.

شاهید: خۆم فێرت دەکەم هەموو ئیشەکان و لیندا_ش فێری زمانت دەکات، تۆ سەرپەرشتی دوکان بکە.

ماوەی یەك ماگ بەردەوام بووم فێری هەموو شتەکانی ناو دوکانەکە بووم خۆم هەموو ئیشەکانم دەکرد.




ئیتر بەیانیان کاتژمێر ٨ بەیانی مارکێتەکەم دەکردەوە و ١١ی شەو دامدەخست.

ئەوەندەم پارە پەیداکرد نەمدەزانی چی لێبکەم، هەمیشە ژێر فەرشی ماڵەکەم پڕ بوو لە هەزار کرۆنی.

پیاوەتیم لێدەکرد و دەمناردەوە، من لەو وڵاتەش دا بۆم نەبوو هیچ موڵکێکم هەبێت بێجگە لە کارکردن، بەردەوام بووم لەگەڵ لیندا_دا بەینمان خۆش بوو زۆر هەوڵم دا دەگەڵی دا ببێتە موسڵمان هیچ نەبوو.

لە یاقوت و مرواری دەچوو ئەوەندە جوان بوو، هەرچی ئافرەتی دنیایە لەبەرچاوم کەوتبوو تەنها لیندا_م دەبینی، قژی ئاڵتوونی باڵای بەرز و باسک و بەفر ئاسا، وەسف ناکرێت بۆم ئەوەنەدە جوان بوو.

من چەندە ئەوم خۆش دەویست دەمزانی ئەویش هەر ئەونەدە منی خۆش دەویست، هەمووجارێك دەیووت تۆ لەچی دەترسی؟

دەموت لە خوا، من ئەمەوێت بتهێنم و شوم پێبکەیت، بەو مەرجەی ببیتە موسڵمان.

ئەو دەیووت باشە، بەس نابمە موسڵمان.

پرسیارم کرد لە زانایان ئایە ئەتوانم کچێکی بێ دین بێنم، هیچ دینێکی نەبوو.

مامۆستا عەبدوڕەحمان بەرزنجی زانایەکی گەورەیە لە نەرویج وتی: ناتوانیت بیهێنیت کاکە خەسرەو، یان دەبێت مەسیحییەکی پابەند بێت، یاخود ببێتە موسڵمان.

ئەمجارە چووم بە لیندا_م وت: بۆ نابیتە مەسیحی؟!

لیندا: بڕوام پێ نییە، هەر درۆی لەگەڵ نەکردم، منیش نەمتوانی درۆ لەگەڵ خوا بکەم، لەبەر خاتری حەزەکەی خۆم بیهێنم و بڵێم مەسیحییە.

زۆر هەوڵم دا لە ڕووی شەرعەوە شتێکم دەست بکەوێت، هیچم دەست نەکەوت، ناچار هەردوولا وازمان لەیەکتر هێنا، ئەوەندەی بزانم ئێستا لیندا لە بانکۆکە لە تایلەند لە کۆمپانیایەکی نەرویجی کار دەکات.

ئەمە ئەو شیعرەیە کە بۆ لیندا_م نووسیوە

بەفرێکی چاو سەوز

وەرزی ئەوینم وشکە

بەڵام..

جوانێکی بەستەڵۆکی باکور

ئاو پرژێنی ڕێبواری سازان دەکات

بە چاوانی ڕێگای ون بووم ڕۆشندەکات

لە دەروازەی خەمی من دا...

گۆرانی و ئاواز دەپچڕێ!




مەملەکەتی عیشق

لە هەواری بن دەواری وەرزی خەندە...

بەفری چاو سەوز دەبارێنێت

دە وەرە دەی دەستم بگرە...

تا لە شەو ڕێی ڕێبواران دا ڕێگا بگرین

تا لە جوانی ڕووی تۆ...

تەماشای سورەیا و یاقوت و گەوهەکەم

دەوەرە جارێکی تر...

با عەتر بارانی گەردەنی مرواریت کەم

تا لەم باکورە...

گوڵ پرژێنی بەفرە پرچ ئاڵەکانت کەم

یان هەناسە ساردی خۆمت کەم

چییە بۆ بێدەنگی لە دانوستانی من؟

چییە بۆ چاوت بڕیوەتە چاوم

وەك ئاوێنە سەیرم دەکەیت

چییە بۆ تاڵی قژی کاڵت

سەری چاوتی گرتووە؟

بە دانیشت لێوت بە خواری دەگەزیت!

بۆ هەناسەی قوڵ هەڵدەکێشیت؟

یان دەتەوێت دڵی پشکۆم بکەیتە ژیلەمۆ

بۆ یاری بە هەستی سوتاوم دەکەیت؟

وەك چەمی خوڕ دەست لە ئاوی دڵم ڕادەگوازیت

دیسان گەمە بە هەستی ناسکی سازان دەکەیت

دەوەرە دەی...

سەرت بنێ بە سینەی بۆن کڕوزی ئەوینی من

لێوت بخەرە سەر سنگی من

سەر و قژت بنێ بە دەمە

با هەڵمی ئەم سەرما و بەفرە...

نە تۆ ببەستێ...

نە منیش سەرما بردەڵە بکات

ئاخ چ بۆن خۆشە بۆنی ئەو قژ و هەناسە گەرمە

سۆزی من

ئاوازی من

دڵی من

چ بۆن خۆشە ئەو قژەی تۆ...

کە نائومید بووین لە یەکتری من هەر لەبیری ئەوە دابووم چۆن لە وڵاتی نەرویج بڕۆم، زۆر ڕقم لە سەرما و کەش و هەوای ئەم وڵاتە بوو، حەزم دەکرد بڕۆم تیای دا.




کوڕێکی خزمم دەمێکە لەم وڵاتەیە، میوانێکی لە سویدەوە هاتبوو ناوی هەرێم بوو.

هەرێم رەبەن بوو واتە زگوردی بوو ئەو خزمەی منیش خاوەن خێزان بوو، حەزی نەدەکرد لە ماڵی خۆیان دا بیخەوێنێت ناردی بۆ لای من، هەڵبەت لە سویدەوە هاتبوو بۆ نەرویج بۆ ئیش دەگەڕا، ئیشم بۆ دۆزیەوە.

ئەهاتەوە لای من ماوەیەك کاری کرد بەس دیار بوو زۆر حەزی بە نەرویج نەبوو گەڕایەوە بۆ سوید، تەلەفۆن لە نێوانمان دا هەبوو...

ڕۆژێك لە سوید لە ڕادیۆ باسی منی کردبوو کە شعر دەنوسم کۆڕێکی شیعری گێرا بۆ چەند شاعیرێك منیشیان بانگکرد، چووم.

لە دوایدا هەرێم دەستخۆشی لێکردم و وتی: دەچینەوە بۆ ماڵی ئێمە بۆ نانخواردن، کە چووم لەماڵی ئەوان کچێکی لێبوو ناوی نەوژین بوو، چاوم چووە سەری، ئەویش دیار بوو ئاگای لە چاوی من بوو، بەڵام من گەڕامەوە بۆ نەرویج و لە دوای چەند ڕۆژێك تەلەفۆن کرا و لە دوای ئەحواڵ پرسی هەواڵی نەوژینم پرسی وتم: هەرێم بزانە شوو ناکات، پەیوەندی نێوانمان ڕێك بخە.

هەرێم: بەسەر چاو خزمی خۆمە و تابڵێی کچی چاکە.

وتم: زۆر باشە، ئاگادارم بکەرەوە بە زووترین کات، چونکە ئەگەر ئەوە ببێت بەنسیب نارۆم بۆ بەڕیتانیا.



دوای دوو هەفتە هەرێم تەلەفۆنی کرد و وتی: قسەم لەگەڵ نەوژین کردووە پێی خۆش بووە، وتویەتی با لەگەڵ خەسرەو قسەبکەم.

لێرە دا عیشق مانای نامێنێت، تەمەن بەرەو سەر دەڕوات و مرۆڤ هەست بە دامەزراندنی خۆی دەکات دەبێت ئیتر ماڵ درووست بکات ژیانی هەبێت و ببێتە خاوەنی منداڵ، وە پرۆسەیەکی کۆمەڵایەتییە دەبێت هەموو کەسێك پێی دا بڕوات.

بەو هۆکارەش دەبوو من بەدوای ژن دا بگەڕامایە، چونکە خەڵکانێکی وەك ئێمە و مانان سوپاس بۆ خوا دوور بووین لە کاری داوێن پیسی و نەدەچووینە دیسکۆکان و ژیانێکی ئاسایی و سادەمان هەبوو، بوارێکی ئاسایی بوو دەگەڕاین بەدوای درووست کردنی خێزان دا.

هەرچەندە ئەمە لای هاوڕێ نا پابەندەکانمان بە ئیسلامەوە جێگای گاڵتە پێکردن بوو.

دەیان وت خۆی تووش کرد بە ژنەوە.

لیرەوە عیشق موراحیقانەیە و باوی نامێنێت و گۆڕانکاری و قۆناغێکی ترە، بەڵکو بە ڕوشدێکی تر مرۆڤ دەڕوات، ئەویش درووست کردنی کەسایەتی و بونیات نانی خۆیەتی.

لە دوای قسەکردن لەگەڵ نەوژین بە تەلەفۆن و گۆڕینەوەی بیروڕا، ڕازی بووین کە بیهێنم.

لە کوردستان کەسوکارم نارد بۆ داوای و لێرەش خۆم داوام کرد لە خوشکێکی گەورەی و برایەکی، هەموولایەك ڕازی بوون.

بڕیاردرا کە من لە نەرویجەوە بچمە ستۆکۆڵم و ژیان درووستبکەم.



# چیرۆكی چواردەیەم
## (جیابوونەوەی من و بەیەك گەیشتنی من و شەوبۆ)

چوومە داوای نەوژین و هەردوولا ڕازی بووین، وا هەستم دەكرد ژیانم خۆش دەبێت.

نەوژین تابلێی كچێكی چاك و خاوەن حورمەت و ئەدەب بوو و جوانیش بوو.

ئەو لەوە دەترسا كە من دڵم پیس بێت.

منیش لەوە دەترسام ڕۆشنبیری من قبوڵنەكات، چەند جار ئەوەم دا بەگوێی دا كە مرۆڤی دڵ پیس نەخۆشی دەروونی هەیە، خۆی پیسە بۆیە دڵیشی پیس بووە.

كاتێك مرۆڤێك پارێزەری حەیا وحورمەت و كەسایەتی خێزانیەتی ئەمە ناكاتە دڵ پیسی، بەڵكو ڕاگرتنی خێزانە، چونكە پیاو هەمیشە پێشەنگە بۆ هاوسەرەكەی، ئەگەر پیاوەكە درۆزن بوو یان داوێن پیس بوو، یاخود دز بوو یان هەركارێكی بەد ڕەوشتی تر، ئەوە هاوژینەكەی یان چاوی لێدەكات، یاخود تۆڵەی لێدەكاتەوە یان خێزانێكی سوك دەبن و هەمیشە ئاژاوە لەماڵیان دایە.

نەوژین ئافرەتێكی تابڵێی ناسك و هەست جوان بوو، بەڵام دنیای ئەو و دنیای من دوو شتی جیاواز بوو.

ئەو حەزی دەکرد لە ناوخەڵکی دا خۆی بنوێنێت و شانازی بە هاوسەرەکەیەوە بکات، ئەمە لە ڕاستی دا بەشێکی باشەی تێدایە زۆر خراپ نییە.

خراپەکە لەوە دابوو کە دەیویست لەسەر برینی خەڵکی تر یاری بکات، دەیویست خۆی بابدات لای هاوڕێکانی ئەوان خاوەن هاوسەر نەبوون خاوەن دەستگیران نەبوون.

چەند جار دەمووت سەما مەکە لەسەر برینی ئەوان کێشە نییە ئەوەی تۆ پێت خۆشە لە مندا دەیکەم، حورمەتت دەگرم چاوم ناچێتە سەر هیچ ئافرەتێکی تر هەرگیز خیانەتت لێناکەم، لەهەمان کات دا منەتیشت بەسەر دا ناکەم بڵێم بۆ تۆی دەکەم، نا_ بەڵکو ئەوە ڕەوشتی خۆمە تۆ خیزانم بیت یان نەبیت من هەروا دەبم!

ئەوەی من دەمویست ببێت داپۆشراوی بوو، کەچی ئەو بە دڵپیسی تێدەگەیشت.

ئەوەی من دەمویست ببێت خواناسی بوو، کەچی ئەو وای دەزانی من کەسێکی داخراو و وشکم!.

ئەوەی من دەمویست ئەوە بوو کە ئافرەت بوونی خۆی بپارێزێت و وەك ئافرەتانی شەرقی ڕەفتار بکات، چونکە ئێمە ئەوروپی نیین.

بە پێچەوانەوە ئەویش دەیویست من کەسێکی خۆی ئاسایی بم، ئەوروپی ڕەفتار بکەم.



جلوبەرگم جلوبەرگێکی نامۆ بێت، تێکەڵاوی هەموو کەس بکەم و وە هەروەها....

لەگەڵ ئەوەش دا زۆر یەکترمان خۆشدەویست، بەڵام نەمدەویست درۆی لەگەڵ بکەم، هەستیشم دەکرد من تەلەفیزیۆنم نەکڕیوە یاخود سەلاجە تا گرنتی لەگەڵ بێت.

بۆیە ڕۆژێك هەردووکمان بەیەکەوە چووینە دەرەوە بۆم باسکرد کە من و تۆ زۆر دوورین لەیەك.

ڕاستە یەکترمان خۆشدەوێت، بەڵام خۆشەویستی و حەز لە یەکترکردن جیاوازە لەگەڵ ڕەحمەتی نێوانمان و گرێدانی خێزان و هاوسەرگیری، ئەگەر بەم شێوەیە بڕوات من لە جەمسەری باکور تۆش جەمسەرێکی تر بگریت، ئەوا خۆشەویستی دەبێتە ڕق و کینە و بوغز، منیش پیاوێکی تووڕەم دەترسم ئازار بخۆیت بە دەستم، پێت چۆنە لەم لوتکەیە دا جیابینەوە، یان ئەوەی من دەمەوێت وابێت؟

دیار بوو ئەویش داواکانی منی پێ قبوڵ نەکرا و زۆر بە هێمن و بەئاسایی جیابووینەوە، تەنانەت ئەو ئێوارە کە لە ماڵی خوشکەکەی نانمان خوارد هەموو شتێك کۆتایی پێ هات.

هەموو لا دەستیان کردە گریان وناڕەحەت بوون بە ڕەوشەکە، بەڵام چار نییە خۆشەویستی خێزانی چەند ڕۆژێك نییە، من گەڕامەوە بۆ نەرویج بۆسەر کارەکەم.

کۆتایی بەو ژیانە هات، ئاگام لێبوو خەڵکی زۆر باسی دەکردم، دەیان وت خەسرەو لەگەڵ کەس ناگونجێت، بەڵام من گوێم بە قسەی کەس نەدا.

ئەو ساڵە ئیقامەی ساڵێکم بۆ نوێکرایەوە و سەفەرم کردەوە بۆ کوردستان.

گەڕامەوە نەرویج بینیم شاهید و عاتیف دوکانیان پێ داخراوە و شاهید ڕایکردووە بۆ بەریتانیا ٥ ملیۆن کرۆنی لە حکومەتی نەرویجی دزیوە.

وازم لەوان هێناو گەڕام بەدوای کار دا، دوو برای فارس بەناوی سەعید و کاوە خاوەنی دووکانی Veleven بوون، لای ئەوان دەستم کرد بەکار، لە دوای ساڵێك یەکەمی هەموو ئۆسلۆم بە دەستهێنا بۆ زۆر فرۆشتن، ڕۆژنامە و گۆڤار و تەلەفیزیۆن باسی دەکردم، ١٠ هەزار کرۆنم بە دیاری وەرگرت لە کۆمپانیاکە لەگەڵ بلیتێکی تەیارە بۆ ئیسپانیا و لۆگۆیەکی ئاڵتونی کۆمپانیاکە کە بای١٥ هەزار کرۆن بوو.

پاسپۆرتەکەم ٢ مانگی تێدا بوو ویستم بچم نویی کەمەوە، کە چوومە لای پۆلیس لێیان وەرگرتمەوە، وتیان: خۆت ئامادە بکە بۆ ناردنەوەت بۆ عێراق، تۆ لەم وڵاتە دا هیچ مافێکت نییە و سەدام ڕووخاوە و وڵاتی ئێوە ئاسایشە.

منیش ئەوەی بڕوام نەدەکرد ئەوە بوو، چوومەوە بۆ کار سەعید خاوەن کارەکە وتی: بۆ بێزاری؟

حاڵ و گوزەرانەکەم بۆ باسکرد.



خێرا تەلەفۆنی کرد بۆ پارێزەرێك باسی کێشەو کێسی منی بۆ کرد، داوای ٦ هەزار کرۆنی کرد بێ ئەوەی من قسە بکەم و پێم بڵێت خستییە سەر ژمارەی بانقی پارێزەرەکە و دوای تەواو بوونی کارەکەشم ١٠ هەزار کرۆنی تری دەوێت.

منیش بە سەعیدم وت: وامەکە من نانێرنەوە، چونکە ڕاستە ئەوە بڕیارە، بەڵام جێبەجێ ناکرێت و دڵنیابە ناتوانن بمنێرنەوە.

ئەوەندەی کە سەعید خەمی بوو من هەر خەمم نەبوو، هەموو سەری مانگێك ڕەفزێکم بۆ دەهات، ئەوەی کە پارێزەرەکەم کردی ئەویش هەر ڕەفزم بۆ هاتەوە مەلەفم لە نەرویج بە تەواوەتی داخرا، هیچ هیوایەك نەما.

هەرچی شتم هەبوو فرۆشتم هیچم نەما، خۆم ئامادە کردبوو بۆئەوەی بڕۆم بۆ بەریتانیا لەوێ داوای پەنابەری بکەم زۆربەی هاوڕێکانم ڕۆیشتن.

کۆمەڵێك خزمی خۆمان هەبوون مەریوانی لە شارێك بە ناوی هاوگەسۆند، پێشتر یەکترمان بینیبوو.

ئەوان پەیوەندیان بە منەوە کرد بوو بە هۆکاری پیاوێکی پێنجوێنی ڕەفیقم منیان دۆزییەوە، وتیان: ئێمە خزمین منیش زۆرم خۆشدەویستن، یەکجار سەفەرم کردبوو بۆ لایان و چووبوومە خزمەتی هەموویان، ئەوان بۆ من ماڵە باوان بوون.

داوای کچێکم لێ کردبوون، کچەکە منی نەدیبوو منیش کچەکەم نەدیبوو، بەڵام لەسەر وەسف و پیاوچاکی باوکی من ڕازی بووم، لەبەر

ئەوەی خانەوادەی کچەکە و خانەوادەی من تێکەڵ بوون پێش لە دایك بوونیشمان باوکی کچەکە و باوکی من هەردووکیان بەیەکەوە پێشمەرگە بوون دنیایەك یادگاری و برایەتی لە نیوانیان دا بووە.

بە کچەکەشیان وتبوو مەلا خەسرەو دێتە داوات، زۆر وەسفی منیان کردبوو وتبوویان زۆر موسڵمانە و سەیری تەلەفیزیۆن ناکات ئەمە ڕیشەیەتی و وەك ئوسامە بن لادن وەسفی منیان کردبوو.

ئەو کچە فەقیرەیان ترساندبوو وای زانیبوو مەلا خەسرەو بە جبە و عەمامەوە دەچێتە داوای، هەر نەیبینی بووم یەکسەر ڕەفزێکی موحتەرەمی دابومێ وەك نەرویج، ئەمەی باسی دەکەم پێش ڕێکەوتن بوو لەگەڵ نەوژین دا.

وتم: ڕەفزی داوە ئاساییە، بەدوای ژنی تردا گەڕام، دوای ئەوەی کە کۆتایی بە هەموو شتێك هات لە نەرویج و بە ئیقامە و بە ژنهێنان و بە فرۆشتنی کەل و پەلی ناو ماڵ، ئامادەبووم بۆ دەرچوون بۆ بەڕیتانیا.

تەلەفۆنم کرد بۆ ئامۆزایەکی ئەو کچە ناوی کاك کاوەیە، بە بنەماڵەی قادرزادە ناسراون.

کاك کاوە: کاکە بەخوا ناهێڵم بڕۆیت، چۆن دەبێت کوڕی عەبدولکەریم لەم وڵاتە بێت و لە ئێمە دوربکەوێتەوە، وتی دەبێت بێیت بۆ ئەم شارەی ئێمە، دوای زۆر لێکردنم وتی ئەگەر ڕازی نەبووی ئەو جا بڕۆ.



چووم بۆ هاوگەسۆند شاری ماڵی خزمان، ناسیا و خزمان هاتن بەدەممەوە شەو دانیشتین کاك عەلی برا گەورەیان وتی: من دەچم جارێکی تر داوای شەوبۆ_ت بۆ دەکەم.

کاك حسێن فارس ئەویش هەر پێشمەرگەی یەکێتییە و هاوڕێی باوکمە وتی: منیش لە گەڵتا دێم، با خەسرەو نەڕوات و لێرە دامەزرێت.

کاك عەلی وتی باوکی ئەو کچە (ناوی کاك جەلال بوو) (خوالێی خۆش بێت) جۆرێکە، پیاوێکی ڕەقە لەگەڵ هەموو کەس نەرم و نیان و خوڵکی نییە، ئەگەر لە بازاڕ تۆی بینی و خوڵکی گەرم نەبوو ئاسایی وەربگرە، هەرچەندە ڕەفیقی باوکتە.

کاك حسێن وتی بەخوا من زۆرم خۆشدەوێت، بەڵام ئەوەندەی هاتومەتە ئەم شارە خوڵکی نەکردووم.

وتم: ئاساییە.

بۆ بەیانی چووینە دەرەوە من و کاك حسێن و فارس و کاك عەلی خەلیفە، دەگەڕاین لەبازاڕ، کاك جەلال بەرەو رومان هات.

کاك عەلی: إن شاالله ئەوە خەزوری موستەقبەلتە!

دوای سڵا و چۆنی و چاکی لە کاك عەلی و لە کاك حسێن، زۆر بە ئاسایی مەرحەبای منی کرد.

کاك حسێن: کاك جەلال ئەم کوڕە دەناسیت؟




کاك جەلال: ئەوەڵڵا کێیە؟

کاك حسێن فارس: ئەوە کوڕە گەورەی عەبدولکەریمی حەمەی سەعی پێنجوێنییە.

کاك جەلال چاوی پڕ بوو لە ئاو باوەشی پیا کردم و وتی: تۆ برازای منیت و ئەچینەوە بۆ ماڵی خۆمان، ئەوەندە گەرم و گوڕ بوو لە گەڵم دا.ئاگام لێ بوو کاك عەلی خەلیفە و کاك حسێن سەریان سوڕما.

کاك جەلال بە منی وت: ڕۆڵە بۆ چوویت بۆ جێگای تر ماڵی ئێمە ماڵی خۆتە و دەبێت بێیتەوە بۆ ماڵی ئێمە.

ڕووی کردە کاك عەلی و وتی: دەچم بۆ بازاڕ هەندێك شت دەکڕم و تۆ کاك خەسرەو بێنەوە بۆ مالی ئێمە.

کاك عەلی خەلیفە طەڵاقی خوارد و وتی: کاکە جەلال_م ( ئامۆزای گەورەیان بوو پێیان دەوت کاکە) تا ئێستا خوڵکی کەسی نەکردووە بەم شێوەیەی تۆ.

کاك حسێنیش وتی: با منیش طەڵاق بخۆم کە کاك جەلال م خوڵکی کەسمانی نەکردووە، بۆ ئەوەی نەڵێیت بوختانیان بۆ ئەم پیاوە کرد و کەچی وانەبوو.

چووم بۆ ماڵی کاك جەلال، من وەك سروشتی خۆم کابۆیەکم لە پێ دا بوو لەگەڵ کراس و چاکەتێك دا.



شەوبۆ منی بینی بوو، لەگەڵ خوشکێکی تری کەوتبوونە قسە، خوشکەکەی پێی وتبوو بۆ شوی پێ ناکەیت وەڵا مەلا نییە دیسکۆیە و دەستوپەنجەشی زۆر جوانە.

دوای ئەوەی لەگەڵ شەوبۆ قسەم کرد، پرسیاری ئەوەم لێ کرد کە چۆن پرسیاری ڕابردووم لێ ناکات، وەڵامی دامەوە وتی: لە ڕابردووت هەرچییەك بوویێت هیچ پەیوەندی بەمنەوە نییە، بەڵکو ئێستا و داهاتووت پەیوەندی بە منەوە هەیە.

ئیتر سوپاس بۆ خوا ڕازی بوو.

دوای چەند ڕۆژێك کاك عەلی خەلیفە و کاك حسێن فارس و کاك کاوە چوونە داوای شەوبۆ خان، کاك جەلال وتبووی من نەمزانییوە لێرەیە دەنا خۆم ژنم بۆ دەهێنا، ئەگەر کچەکەم ڕازی بێت ئەوە من لە ئێستاوە ڕازیم.

کاك عەلی هەڵسابوو دەستی ماچ بکات لە جیاتی من، کاك جەلال وتبووی دەستم بۆ ماچ دەکەیت خەسرەو لە من نزیکترە تا لە خۆت، خۆم دەبێت دەستی تۆ ماچ بکەم.!!

ئیتر ئەو قسەم هەرگیز لەبیر نە چووەوە تا ئەو ڕۆژەشی ئەمری خوای کرد، بهاتایە و بڕۆشتایە لەبەری هەڵدەستام.

زۆرم خۆشدەویست، ببووە باوکم لەم وڵاتی غەریبییە دا، ئەگەر باوکیشم بمایە هەر ئەوەندەی کاك جەلال_ی بۆ دەکردم.

مەملەکەتی عیشق

شعر پەخشانێکم نووسی بۆ شەوبۆ وتم نەکو ئەمجارەش ڕەفزم بداتێ، باش بوو بەم شیعرە پەخشانە هەڵمخەڵەتاند...ئەمەش دەقی قەصیدەی شەونامەیە

شەونامە...

وا شەو درەنگە و کەچی ڕوخسارێك، بە پەنهانی دەمخەوێنێ

سینەی کەسێك وەك دیلانێ، لارولەنجەی ڕۆحم دەگرێ

دڵم شێتانە مەستی لێوی پیاڵەی مەی گێڕێکە، جاومەستێك دەی تروکێنێ

دەم و لێوی نازەنینێك، فەرامۆشی ڕۆح و دڵ و گریانی ناو بێشکەی دایکی عیشق ان دەگرێنێ

پەنجەی ماندووی گوشینە، هەروەك گاڵۆکی ویران قرچەی پیری لێ دێ

کەچی ئەو هێشتان پێکەنینی مردنی خۆی بۆ جوانی من دەلەنگێنێ

لێوی سور بووی بە خوێنی من دەبزوێنێ

من گەڵای تەمەنم گەرچی سەوزە بەڵام کرمەڕێزە هەڵدەوەرێ

ڕووباری خەم، عشقی تازە دەشواتەوە و نامەی خۆشەویستی خۆی دێنێ

گڵی ژێر پێم گرتووە، بۆنی ساردی لێ دێ

کەچی تاسەی ماچ و هەوا سەرمەندی کوێستانی بۆ دێ

کە حێلەی ئەسپی ئەوین وەك باڵدارێك، پەیامی سەرزەنشتی بێ وەفایی لێ دێ



نه وشەی جوان....نه وەفا....نه دڵ...نه تامەزرۆ....نو گوڵ ناپشکوێ

بۆ هەوێنی ئەم شعرەم خومرەی زۆر دەوێت و هەر نامەێ

خۆشم نازانم گەرچی شوێنەکەم گەرمه کەچی شڵقەشڵقی بۆ گەنی لێ دێ

سەردەمێکه ئاوازی خۆم...بەکەمانی گریانی دەنه

به چیلکەی تاری فرمیسك...به دەفی ڕوومەت....به گیتاری قژ

سەمفۆنیای گریانی هەتا هەتایی لێ دەبارێ

وەرزی بەهاری من خەزانه لەو ساته دا له جیاتی گوڵ بپشکوێنێ

چۆن خۆشەویستان پەڕەی گوڵ بۆ تامەزرۆیی بەیەک گشتنی ئەوینەکەیان

هەڵ دەوەرێنێ

چرکەی کاتژمێرەی هەناسەی من لەسەر هەسارەی بلۆتۆیه به دەیان ساڵ

ئاهو حەسرەتی خۆی وەك دووکەڵی سیگاری دەمی جوتیارێك به بای دەکا

و دەیفڕێنێ

ئەی ئەوکەسەی نه بۆ جارێك، نه بۆ ڕۆژێك، نه بۆ مانگێك، نه بۆ ساڵێك

نه بۆ ماچێك، ئاسانی من تریشقەی خۆشەویستی لێ بێنێ

گەرچی شیعرم وەك باڵدارێك دەچێته لای جوانێك هەروەك قیبلەیەك

سوجدەی هەوێنی شیعری لێ دێنێ

من هەوێنی شنەی شیعرم وەك گوڵه شەوبۆ چۆن شەونمێك شەوانه تەڕی

دەکات




مەملەكەتی عیشق

ئاوا سەر لە نوێ بۆنی گوڵەژاڵەی لێ دێ

تا ئارامی هەموو جوانان بە سەر گوڵاڵەی سوری خۆشەویستان دا ببارێنێ

چیرۆکی دەم بە پێکەنینم بۆ شەیدایەك پێ بکەنێ.

کۆتایی هات و شەوبۆ بووە خیزانم، هەر ئەویش نازناوی ماکوان_ی پێ جوان بوو منیش ئەوم ناونا بە باران...

لە مزگەوتی بەدیوع و زەمان لە ئۆسلۆ لای کرمانجەکانی باکور مارەمکرد، مارەییەکەی قورئانێك بوو، هەرچەندە ئەو پاسپۆرتی سیاسی هەبوو، بەڵام هیچ سوودی نەبوو دیسان نامەم بۆ هاتەوە وتیان خۆت ئامادەبکە ئەتنێرینەوە بۆ کوردستان.

پێشتریش بە شەوبۆ_م وتبوو من هیچم نییە، ئەگەر منیان نارد بۆ جەهەنەم دێیت لەگەڵم؟

ئەویش وەعدی دا کە دێ لەگەڵم.

## ئەوەی کە هەرگیز بەتەمای نەبووم:-

خێزانم پێکهێنا سوپاس بۆ خوا ژیانمان زۆرخۆش بوو، ئەگەر بڵێم هەر هیچ کێشەیەکمان نەبووە ئەمە راست نییە، چونکە لە هەموو ماڵێك دا دەنگ بەرزکردنەوە ڕوودەدات، بەڵام سوپاس بۆ خوا لە ڕێز و ئیحتڕام دەرنەچووە.

ئەمەش دوو هۆکارە:- هۆکاری یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ خێزانم، چونکە هەرکات من توڕە بوبێتم ئەو بێ دەنگ بووە و زانیویەتی بێدەنگ دەبێت، بەدڵنیایەوە منیش ڕێزی توڕەبوونی ئەوم گرتووە.

شەوبۆ هەرگیز هەوڵی نەداوە دژی من کار بکات یاخود قسەبکات، هەرگیز لە پاشەملە و لای کەس باسی خراپەی منی نەکردووە، بۆیە منیش لەبەر چاوم نەکەوتووە هەر خۆشم ویستووە، ئەوەی منیش حەزم لێبوبێت ئەو بۆی ئامادەکردووم، بەڕاستی توانیویەتی ژنێکی زۆر باش بێت و دایکێکی باش بێت.

ئەمە هۆکاری ئەوە بووە کە زیاتر حەزمان کردووە ژیانمان بەردەوام بێت.

هۆکارێکی تریش کە من بیرم لێکردۆتەوە ئەوەیە من تەمەنم ٣٩ ساڵە و بەرەو کاملبوونی تەمەن دەڕۆم، تازە تەمەن بەشی ئەوەی تێدا نەماوە بەدوای کاری بێمەعنا و شتی خراپەوە بم، ئایینەکەشم ڕێگەم نادات چونکە مرۆڤ هەر هەڵەیەك بکات لە تەمەنی ٢٠ تا ٢٥ ساڵی کات و

زەمەنێکی لەبەر دەستدایە خۆی هەڵبستێنێتەوە، بەڵام ئەگەر مرۆڤ لە ٣٠ بۆ ٣٥ ساڵی هەڵەی کرد بە درەنگ کەسایەتی خۆی بۆ دروست دەکرێتەوە، خۆ تەمەنی ٣٥ بۆ ٤٠ ساڵی بەڕاستی زۆر ئاستەمە هەستانەوەی کە سایەتی مرۆڤ.

جا ئەم ڕووشدە و پێگەیشتنە لە ڕووی ئەقڵ و کەسایەتییەوە زیاتر هانت ئەدات بۆ ئەوەی پابەندبیت بە خێزانەوە و هەمیشە تەندروست بیربکەیتەوە.

ساڵی یەکەمی ژیانمان هیچ ئیقامەم نەبوو، بەڵام بەردەوام مافی کارکردنم هەبوو.

ساڵی دووەم ئیقامە و وەرەقەی کاریشم لیوەرگیرایەوە، هەموو سەری مانگێك نامەیەکم بۆ دەهات لە دەوڵەتی نەرویجەوە دەیان وت خۆت ئامادە بککە بۆ گەڕانەوە، ئەگەر خۆت بێیتە لامان پارەی بلیتەکەت بۆ ئەدەین و بەلاشە، تەنانەت چەند جار نەخۆش کەوتم چوومە خەستەخانە هیچ ناوێکم نەبوو ناچار هەروا دەهاتمە دەرەوە بێ ئەوەی چارەسەر وەربگرم.

نەمدەتوانی هیچ خانوێك بەکرێ بگرم، چونکە ناوم نەمابوو لە فەرمانگەی تۆماس (ڕجستێر)، یەك چارەم هەبوو دەیانووت دەبێت بگەڕێیتەوە بۆ ئەو شارەی کە یەکەم جار لێی بوویت.

خۆ ئەگەر بشمردمایە نە دەچوومەوە بۆ ئەو شارە، چونکە زۆر ناخۆش بوو.

سوپاس بۆ خوا من هەر ژیانم باش بوو پارەم هەبوو هەرگیز کەموکورتیم بەخۆمەوە نەبینی، ڕۆژێك لە ڕۆژانیش نەچوومەتە سۆسیالی نەرویج و داوای پارەیان لێ بکەم.

یەکەم جار کە ماڵیان دامێ یەکجار وەرم گرت نووسرابوو فەقیرانەیە، ئیتر ئەوەندەم خەفەت خوارد هەر ئەو مانگە وەرمگرت یەکسەر چووم بۆ کارکردن.

کۆتایی ساڵی ٢٠٠٦ بوو خۆم و خێزانم بڕیارمان دا بڕۆین بۆ وڵاتێکی تر، لەو وڵاتانەی هەڵمان بژارد مالیزیا و سعودیە و سودان و کەنەدا و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوو.

بۆ ئەم مەبەستە چووین بۆ ماڵی خەزوورم و قسە و باسی لەسەر بکەین، لەگەڵ خەزوورم قسەم کرد بەڕەحمەت بێ، دیاربوو زۆری پێ ناخۆش بوو، بەڵام وتی: کە ژیانی ئێوەیە و خۆتان باشتر دەزانن بڕیار بدەن بۆ ژیانتان.

خێزانیشم داوای نوێ کردنەوەی پاسپۆرتە سیاسیەکەی کردبوو، کەچی پێیان وتبوو تۆ فەڵەستینیت بۆت نوێ ناکەینەوە، ئەویش توشی کێشە بوو، بەهۆکاری هەڵەی خۆیانەوە تا پەیوەندی کردەوە و مەلەفەکەیان تەماشاکردەوە زۆری پێ چوو.

لەماڵی خەزوورم هاتینەوە، خێزانم دەستوپەنجەی زۆر موهیمە بۆ شفتە، داوام لێکرد شفتە درووست بکات بە تەڕەتیزەوە بیخۆین، تەڕەتیزەم کردبوو لە حەوشەی ماڵی خۆمان دا.




که گەشتینە ماڵەوە خێزانم سندوقی پۆستەکەمانی کردەوە نامەیەکی تیدابوو لە فەرمانگەی هیجرەوە هاتبوو.

وتم: ئەها ڕەفزێکیدیکەم بۆهاتووە، وتمە شەوبۆ جارێ مەیکەرەوە با نانەکەم بۆ بخورێت.

شەوبۆ بەقسەی نەکەردم خەریکی کردنەوەی بوو، منیش بەجێم هێشت و چوومە لای تەڕەتیزەکە خەریك بوو دەمرنی، ئەوەندەم زانی قیژاندی، وامزانی مار پێیوەدا.

وتم: ئەوە چییە؟

شەوبۆ: مژدەم بەرێ بوویتە خاوەنی ڕەگەزنامەی نەرویجی، جنسیەت وەرگرت!

وامزانی پێم ڕادەبوێرێت، ئەگەر وەرەقەی کارکردنی بووتایە ڕێی تێدەچوو، من چاوەڕێی ئەوەم وەڕەقەی ئیشم بدەنەوە بڕوام نەبوو ئیقامەش وەربگرم، ئێستا دەڵێن جنسیە، زۆر دوورە لە راستیەوە.

وتم: ڕادەبوێری؟!

وتی: خۆت بیخوێنەوە.

که خوێندەمەوە نووسرابوو نەرویج پیرۆزبایت لێ دەکات بوویتە خاوەنی رەگەزنامەی نەرویجی، هەموو مەلەف و دۆسیەشت لای ئێمە ئاشکرایە سەرەڕای ئەوەش ڕەزامەندیمان دەربڕی بۆت.



به شەوبۆم وت: ئەرێ زللەیەك چڕنوقێك شتێکم پیا بکێشە بزانم خەو نییە.

کە زانیم ڕاستە سوجدەی شوکرم برد بۆ خوا.

بوومە خاوەنی ڕەگەزنامەی نەرویجی، خەڵکی ٢٥٠٠ کرۆنی ئەدا تا ڕەگەزنامەکەی بدەنێ من ئەوەشم نەداوە، نەرویجییەکان ئاهەنگێکیشیان بۆ کردم، بەڵام نە چووم دەستم کردەوە بە ئیشوکاری خۆم.

لەساڵی ٢٠٠٧ وە بەڕاستی ژیانم زۆر فەرقی کرد، لە ڕووی زانستی و لە ڕووی کەسایەتی و هتد...

بە تەواوەتی دامەزرام لەم وڵاتە دا سوپاس بۆ خوا بوومە خاوەنی ئەوەی کە دەمویست، لە ژن لە منداڵ لە خانوو لە سەیارە لە پارە لە دوکان و بزنس و کارکردن، ئینجا بیرم لە خوێندن کردەوە.

سوپاس بۆ خوا هیچ کێشەیەکم نەمابوو.

بەردەوام بووم لە کار و چالاکی لە مزگەوتەکان و ئاشنابووم بە تۆڕی کۆمەڵایەتی پاڵتۆك و ئەوەی زیاتر منی بردە پێشەوە جەنابی مامۆستا کرێکار بوو.

هەرچەندە لەم دواییانە دا تۆزێك دڵم شکا لە هەندێك کەسی دەوروبەری، بەڵام هەرگیز فەزڵی مامۆستا کریکار_م لە بیر ناچێتەوە.

بەڕاستی داندەنێم بە وەی کە لە لایەن جەنابییەوە شت فێربووم، بەڵام هەرگیز وەك مامۆستام نەبووە و منیش وەك قوتابی، بەڵکو ئەو باوك ئاسا

لەگەڵ مندا هەمیشە مامەڵەی کردووە، هانی داوم بۆ کاری باشە و بۆ چاڵاکیی زیاتر، هەر شتێکم پێویست بووبێت لەسەرچاوە، خێرا بۆی ئامادە کردووم.

ئینجا کەوتمە سەفەر کردن ئەوەی حەزم لێ دەکرد لە وڵاتان چووم گەڕام، هەمووی فەزڵی خوای پەروەردگار بوو بەسەرمەوە.

بە بیرماهات بەرەو ئەڵمانیا بڕۆم بۆ لای هاوڕێ و ئەوانەی دەمناسین.

بلیتم بڕی و چوومەوە بۆ شوێنەکانی کە پێشتر یادگاریم تێدا هەبووە لە ئەڵمانیا.

لە سەفەرەکەم دا لە بایەروتەوە دەڕۆشتم بۆ نۆرمبێرگ بە شەمەندەفەر لە ئەڵمانیا چەند ڕۆژێك لای کوڕێکی خاڵۆزای باپیرم مامەوە، میوانی ئەو بووم دوایی بەرەو هالە و ڤابەتاڵ کەوتمە ڕێ بە فۆغن تکت.

ناو شەمەندەفەرەکە زۆر قەڵەباڵغ بوو، منیش تەلەفۆنم دەکرد لەگەڵ خێزانم و باسی ئەڵمانیام بۆ دەکرد کە حاڵ و وەزعم چۆنە ئەم چەند ڕۆژەی کە لەوێم.

لە پڕ کەسێك هاتە تەنیشتمەوە بێ دەنگ بوو تا تەلەفۆنەکەم تەواو کرد گوێی لە دەنگم بوو.

وتی: تۆ ئەو ماکوانە خینایەت کارە پیاوکوژەکە نیت کە لە پاڵتاك قسە دەکەیت لە ژوورەکان؟

منیش بە سەرسامییەوە وتم: خۆیەتی ئەو ماکوان_ەیە، بەڵام بەخوا تا ئێستا پیاوم نەکوشتووە، بەس بریندارم کردووە خینایەتیشم نەکردووە، ئەی جەنابتان کێن؟

وتی: من لە ژوورەکان گوێت لێ دەگرم ئاگام لێیە کە قسە دەکەیت.

وتم: باشە تۆ چۆن بە من دەڵێیت پیاو کوژ؟ کێم کوشتووە؟ بەڵگەت چییە؟

چاوم چەخماخەی ئەدا و حەزم لە شەڕ بوو لەگەڵیدا دانم بە خۆم دا گرتبوو، چونکە ناو قیتار بوو زۆر ڕقم هەڵسابوو.

وتی: منت کوشتووە!

وتم: دەستم خۆشبێت، ئەی ئەوەنییە هەناسە ئەدەیت.

وتی: ماکوان بە هۆکاری تۆ ماڵ و منداڵم لێ جیابوونەتەوە!من تەمەنم ٥٣ ساڵە ئێستا خیزانم تورەیە جیابۆتەوە ئەویش دەیەوێت بمکات بە ئاخود، ئەوەندە گوێی لە تۆ و جەماعەتەکەت گرتووە.

هەستمکرد بە برینداری قسە دەکات، منیش لەبەر تەمەنەکەی هێمن بوومەوە، بەڵام هەر تورەیی لە دڵ دا بوو.

وتم: کاکە ئێوەی کوردی ڕۆژهەڵات زۆربەتان بێ دینن و خوا هەر ناناسن، ئیسلامەتی لە چاوی کۆماری ئیسلامییەوە تەماشا دەکەن، باشە چۆن منت ناسی؟




وتی: هەمڕاکەت_ بە دەستەوە بوو گوێم لە دەنگت بوو ناسیمیەوە کە ئەویت.

هەڵسا ڕۆیشت و وتی: ئێوەی موسڵمان هەر پیاو کوژ و خیانەت کارن ماڵی منت وێران کرد، ئەگەر کورد نەبویتایە ئێستا شکاتم لێدەکردی ئەمووت ئەمە پیاوی ئوسامە بن لادنە.

ئەوەندەی تر تورە بووم، بەڵام کە هەڵسا ڕۆیشت ئیتر ئیهمالم کرد، بەس پێم وت: بە خوا ژنەکەت باشی ناسیوی کە زانیویەتی پیاونیت بۆیە لات دانەنیشتووە!ئەوەندەی تر بریندارم کرد.

هەناسەیەکی هەڵکێشا و ڕۆیشت.

ئەو دڵەم خەریك بوو ئەتەقی، هەڵسام ڕۆیشتم بۆ تەوالێت.

تەماشام کرد دوو کورسی لە دوای خۆمەوە، مۆرەیەکم لێکردن ئەو هەرحیسابیشی بۆ نەکردم، کەگەڕامەوە تەماشایەکی کردم، کورسیەکەیم بە جێهێشت، بەڵام لای ئەو مەجالی دانیشتن نەبوو، گەڕامەوە بە دوادا بۆ لای وتم: ئەوە بۆ نایەیتە لای من هەندێك قسە بکەین.

وتی: لایبە باوە دەبێت بە شەڕمان.

وتم: تۆ وەرە من شەڕناکەم.

هەڵمساند جووم دوو قاوەم هێنا و دامنا و دەستمان کرد بە خواردنەوەی قاوەکان، وتم: ئادەی بۆم باسکە بۆچی ڕقت لە منە، من چیم کردووە خیزانت بۆ تۆی بە جێهێشتووە؟



# چیرۆکی پانزەیەم
## (من و کاکە عەبە و بەهرۆز_ی کۆمەنیست و مەهنازخان)

لەگەڵ ئەو کەسە ئێرانییە دا کەوتینە قاوە خواردنەوە و گفتوگۆ، بەڵام پێش ئەوەی قسەبکەین لێم پرسی ناوت چییە؟

وتی: ناوم عبدوڵڵایە ناسراوم بە عەبدوڵڵا غەمگینی، خەڵکی شاری سنەم، خەڵکی بە کاکە عەبە بانگم دەکەن.

وتم: دەی کاك عەبدوڵڵا فەرموو باسەکەم بۆ بکە.

وتی: شەوێکیان باسی تەڵاق و ئافرەتان بوو لە ژوورێك لە ژوورەکان، باسی ئەوەت کرد کە پیاو تەڵاقی بەدەستە، باڵام ئافرەتیش شتێکی بەدەستە کە لە تەڵاقی پیاو زۆر بەهێزترە، ناوەکەم لە بیر نەماوە چی بوو!.

وتم: خولع_م وتوە حەتمەن؟!

وتی: ئائا خۆیەتی، ئیتر لەو شەوەوە ژنەکەم گۆڕا.

وتم: بۆ گۆڕا چیی بوو؟ تەنها لەسەر ئەوەی وتم ئافرەتیش خولع_ی بەدەستە، خۆ ئافرەت لە ئەوروپا لە پیاو بە هێزترە هەرچییەك بڵێت گوێ بۆ ئەو دەگرن.

کاکە عەبە وتی: نا - ئەو شەوە وتت ئافرەتی موسڵمان نابێت لای پیاوی کافر و بێدین دابنیشێت ئەگەر ئافرەتەکە دینداربێت.

هەروەها ئاماژەت بەوە دا کە هەرکاتێك پیاوە کە دەچێتە لای وەك زینا وایە، باسی ئەوەت کرد، ئاخر چۆن ژنێکی دیندار و خواناس لای پیاوێکی بێدین دادەنیشێت.

لەسەر تۆ من و خێزانم بوو بە شەڕمان.

ئیتر لەو شەوەوە ئەو ژنەم شەڕی بە من فرۆشت هەتا جیابوینەوە.

کاکە پێشتر وانەبووین، هەموو خەتای تۆ بوو، نازانم ئەو شەوە سیحرت لێکرد یان نوشتە؟

وتم: باشە کاکە عەبدوڵڵە تۆ بڕوات بە خوا و دیندار نەبووی؟

کاکە عەبدوڵڵا: بەڕی وەڵڵا، بەڵام جەماعەتی ئێرانییەکان ئەوەندەیان وت دین وانییە و هیچ نییە و ئیتر منیش وتم لەوانەیە ڕاستبکەن، وتم: دین نییە.

وتم: لای ژن و ماڵ و منداڵەکەت ئەم قسانەت دەکرد؟

وتی: ئەرێوەڵڵا کە نوێژی دەکرد گاڵتەم پێ دەکرد، ئەمووت ئێمە لە ئەوەروپاین ئیتر واز لەم کۆنەپەرستیە بهێنە.

وتم: ئەی باشە ئێوە باسی مافی مرۆڤ و ئافرەت و ئەو شتانە ناکەن ئەی چۆن گاڵتەت پێ دەکرد، ئەی کوا مافی ژنەکەت؟

وتی: ئاخر دەمووت با وازبێنێت، ئەو برادەرانەی خۆم دەهاتن گاڵتەیان پێ دەکردم.



وتم: ئەو برادەرانەی خۆت کێ بوون، هەر لە گروپ و جەماعەتەکەی خۆتان بوون، چەپ بوون؟

وتی: ئەرێ.

وتم: تۆ بڕوات بە دینی ئیسلام نییە وایە؟ خێزانیشت ئافرەتێکی موسڵمانە وایە؟.

وتی: وەڵڵا بێژم چی؟!

وتم: ئەوەی کە خۆت بڕوات پی یەتی ئەوە بڵێ؟

وتی: سەری دنیام لێ شێواوە، ئاخر لەم تەمەنەوە من هی ئەوەم ماڵ و منداڵ بە جێم بێڵن؟

وتم: ئاخر خۆت لە ئاستی ئەوە دانەبووی کە ماڵ و منداڵ لات دابنیشن، بە ناوی ئازادی و قسەی بێمانەی چەپانە خۆتەوە خۆت وانیشان داوە، هەموویانت ئیزعاج کردووە، هەر لە داخی ئەوە ڕۆیشتوون، چونکە ئافرەت ئەگەر پیاوەکەی ئیزعاجی نەکات کەم ئافرەت هەیە حەزی بە جیابوونەوە بێت، ئێ قسەکەی منیش تەواوە بڕۆ بە دوای ئافرەتێکی تر دا بگەڕێ با وەك خۆت کافر و بێ دینی و مولحید بێت، بۆ ئەم ئافرەتە موسڵمانەش بە خۆتەوە ئەبەستیتەوە ئەویش وا لیدەکەیت وەك تۆ بێت، یاخوا دەستی خیزانت خۆش بێت کارێکی زۆر مەردانەی کردووە.

وتی: توخوا ماکوان وازم لێبێنە تۆش مەخسرەم دەکەیت؟





وتم: نا_ بەڵام من هەست دەکەم تۆ بۆخۆت پیاوێکی باشیت و هەر نازانی چەپ و ئەم قسە بێ واتایانە واتای چییە، ئێوە هەندێکتان وەك ئەبولەهەبی مامی پێغەمبەر (دروودی خوای لێبیت)، هەر لە خۆتانەوە دوای قەڵەباڵغی کەتوون، شوێن برازاکەی خۆی نەکەوت، تا خوای گەورە ڕیسوای کردن و ماڵ و منداڵت لێی جیابوویەوە، دوایی تووشی نەخۆشییەکت پێست بوو، بە دارێکەوە بەستیانەوە تا گیانی دەرچوو لە تەنیشت خۆیەوە چاڵێکیان بۆ هەڵکەند تا مرد دوایی بە دارێکی درێژ هەر بە جلەکانی بەریەوە فڕێیان دایە ناو چاڵەکە، ئێ تۆش وەك ئەو وایت، هیچ نازانیت و هەر لە خۆتەوە شوێن قسەی بێ مانای خەڵکی ڕۆژهەڵات کەوتووی هەڵبەت چەپەکانیان و ئەوانەی کە کۆمەنیزم و تودەیەکانن.

ئادەی پێم بڵی چەند کتێبت لەسەر ئەدەبیاتی چەپ خوێندۆتەوە؟ یان چەپ دەزانی مانای چییە؟ چەند کتێبت لەسەر ماددی و جەدەلێتی ماتریالیزمی خوێندۆتەوە؟

کاکە عەبدوڵڵە: وەڵڵا هیچ، هەر جگەرە دەکێشم.

وتم: دەزانم ئاگام لێتە هەموو ژیانت دراوە بەسەر یەک دا بە شتی تەزویر، خۆشت قەناعەتت پێی نییە.

وتی: ئاخر هەندێك کەس لە پاڵتاکە دا قسەدەکەن ئەڵێن دین ڕاست نییە، منیش گوێیان زۆر بۆ دەگرم.

وتم: کێن ئەم قارەمانانە؟



وتی: عوسمانی مەلا و مەریوان هەڵەبجەیی و گەرمیانی و هەندێکی تری وت.

وتم: بەخوای ئەرز و ئاسمان بە هەموویان نیو پیاوی تەواویان تێ دا نابێت، من هەندێکیان دەناسم بە تایبەت ئەوەی کە خەلکی لای ئێوەیە، ئەوە مالوێرانترین کەسە و ئەوەی لای ئێمەش درۆزنترین کەسە هەردووکیان یەك لەیەك بێ ڕەوشترن، هەر دووکیشیان لە نەرویج لەم وڵاتەن کە من لێی دەژیم.

کاك عەبدوڵلا: لایبە باوە باسی کەس ناکەین.

وتم: باشە من لە ئەڵمانیام کێشەکەش لەسەر من درووست بووە، باشە من چیم پێ دەکرێت بۆت بکەم تا یەك هەفتەی تریش لە ئەڵمانیا دەبم، بەڵام بە مەرجێ تۆش بە قسەی من بکەیت؟

وتی: باوە لایوە تۆ تازە هیچت پێ ناکرێت.

وتم: ئێ خوا ماڵت ئاوا کات تۆ لەوساوە یەخەی منت گرتووە دەڵێیت لەسەر قسەی من بووە.یان تۆ شەڕ بە من دەفرۆشی، ئەگەر لەسەر قسەی من بووە ئێ حەتمەن من شتێکم هەر پێ دەکرێت، ئەگەر وایش نییە کاکە بۆ شەڕم پێ دەفرۆشیت؟.

لە پڕ تەلەفۆنەکەی من لێی دا، ئەو ڕەفیقەم بوو کە دەچووم بۆ ماڵیان.

کاك مەلا محەممەد: ئەرێ کاکە لە کوێیت من چاوەڕێی تۆم بۆ نەگەشتی دەبوو ئیستا بگەیشتیایە؟




وتم: وەڵڵا بەڕێوەین.

مەلا محەممەد: کاکە ئەو نیوسەعاتە لە کاتەکەی خۆشی لایداوە؟.

لە کاك عەبدوڵلام پرسی ئەزانی من شارەکەی خۆمم هەڵە کردووە.

کاك عەبدوڵلا تۆزێك سەری هێناو سەری برد تومەس بە دەم قسەوە ئەویش دەمێکە شارەکەی لێ ون بووە، نەیدەزانی لە کوێین، تەلەفۆنم کردەوە بۆ مەلا محەممەد وتم: قوربان ئێوە چاوەڕێی من مەکەن ئێمە ون بووین، تا لە بانۆفێك دەوەستین و بزانم کوێیە و دوایی قسەدەکینەوە.

دابەزین کە پرسیارم کرد، دەبوو من سێ سەعات پێشتر شەمەندەفەرەکەم بگۆڕییایە، بەڵام دیار بوو قسەکانمان لەگەڵ کاك عەبدوڵلا سەری بردبووین و سەرگەرم ببووین بە قسەوباسەوە، کە بۆمان ڕوون بوەوە ئێمە لە نزیك کۆڵنین و لە نزیك شاری سنوری هۆڵەنداین کە بە نیو سەعات دەچووینە ناو شاری ئارنێمی هۆڵەندا.

وتم: ئاخر کاك عەبدوڵلا وا من خەڵکی ئەم جێگایە نیم، ئەی تۆ بۆ نەتزانی.

وتی: باوە واز لە من بهێنە من هەر شارەزا نیم.

من هەندێك هاوڕێ و دۆستی خۆم هەبوو لە ئارنێم ئەوێ نزیك بوو بۆ من، ویستم خوا حافیزی بکەم لە کاك عەبدوڵلە بڵێم من دەڕۆمە ئارنێم تۆ ڕەقەمی خۆتم بدەرێ کە من پەیوەندیت لەگەڵ بکرم.



کاك عەبدوڵڵا: ماکوان بۆ کوێ بە جێم دێڵیت بە خوا پارەم پێ نییە و هیچیش نازانم.

کەوای وت زۆر خەفەتم خوارد وتم کاکە عەبە، ئەی چەند ساڵە لەم وڵاتەی؟

کاك عەبە: هەشت.

دوای ئەوەی چوینە هۆڵەندا لە ئاڕنێم تەلەفۆنم کرد بۆ ئەو هاوڕێیانەم کە لەوێ دەژیان، خێرا هاتن بە دەممانەوە چوینەوە بۆ ماڵی ئەو برایانە، خزمەتێکی باشیان کردین ئیتر ئەو شەوە زیاد لە ١٧ کەس هاتن و هەموو بەیەکەوە چوین بۆ مزگەوتی مەغریبییەکان، پێش ئەوەی بچین وتم: کاکە عەبە خۆ دەزانی غوسڵ دەرکەیت؟

وتی: ئەرێ...

وتم: بڕۆ ئاوێك بەخۆتداکە تا دێیتە دەرەوە بەو برایانە دەڵێم قاتێکت بۆ ئامادەبکەن.

کاکە عەبە بێ پێچوپەنا و موجادەلە کردن ڕازی بوو خۆی شۆرد و کراس و پانتۆڵێك و لیباسێکی مەغریبیان بۆ هێنا زۆر جوانبوو، پێش خۆمان خست بۆ مزگەوت.

نوێژی مەغریبمان کرد و گەڕاینەوە بۆ چێشتخانەیەك لەودەوروبەرە بێ ئێوە ناخۆش من ساوەری تورکی زۆر حەز لێ دەکەم ئەوانیش دەستیان کرد بە پیتزا خواردن، ٧٠ یۆورۆم پێ بوو بە دزییەوە کردمە گیرفانی کاکە



عەبە و وتم: پارەی دیکەم پێیە بەڵام لەسەر کارتە دوایی پارەی ترت بۆ دەردێنم، هیچی نەوت و هەڵیگرت.

تێروپڕ نانمان خوارد ئەو برایانە لە هۆڵەندا کە فەرموودەیەکیان باس دەکرد یان ئایەتێکیان باسدەکرد یان قسەیەکیان دەکرد ڕوویان دەکردە کاکە عەبدوڵڵای غەمگینی وایان دەزانی مەلای دوانزە عیلمە.

کاکە عەبدوڵڵا کەوتە قسەکردن ئەو شەوە ئیتر شەرەفی دەخوارد و قسەی بازاڕی، وەڵڵا جەماعەت تەماشایەکی منیان کرد و وتیان: ئەرێ کاکە ئەو پیاوە شرك دەکات؟

وتم: چۆن؟!

وتیان: ئەوە کە قسەمان بۆ دەکات هەر دەڵێت بەسەری ئێوە، بە چاوی ئێوە.

منیش بەسەرهاتەکەم بۆ چەند برایەك گێڕایەوە، یەکێکیان زۆر ڕەق بوو ئەی وت کاکە ئەو کابرایە سەگە، جائیز نییە لەگەڵمان دابێت، تا من توڕەبووم لەو برایە و وتم: چۆن شتی وادەڵێیت ئەوە لەگەڵ منە ئەگەر ئەبوجەهلیش بێت، چۆن حورمەتی من دەگرن دەبێت حورمەتی ئەو پیاوەش بگرن، خوا دەزانێت، بەڵکو ژیانی لەگەڵمان دا بگۆڕێت.

بۆ نوێژی عیشا چوینەوە بۆ مزگەوت، دوای نوێژ ئەو برایانە وتیان: کاك ماکوان شتێکمان بۆ باسبکە.

منیش دەستم پێ کرد بە بەسمەلە و ستاییشی پێغەمبەر و ڕوومکردە کاکە عەبە و وتم: هەرکەس بە دڵسۆزی دینەکەی خۆی بپارێزێت، ئەوە دوونیای لا بچووکە کاتێك هاوەڵان فێری ئازایەتی و ئیخلاس بوون قەدری خوای گەورەیان دەگرت و دەیانزانی خوا لە ئاسمانەو و لە هەموو شت گەورە ترە، ئێمە کە خۆمان بە موسڵمان دەزانین، ڕۆژانە چەند جار (الله اکبر) بە گوێمان دا دەدرێت، بەڵام تێناگەین کە خوای گەورە لە هەموو شتێك لەم گەردوونە دا گەورە ترە.

هاوەڵان دوو شت فێربوون بۆیە ئازا بوون بۆیە زوو ئیخلاسیان بۆ درووست بوو، کەوتنە کارکردن بۆ ئەم ئیسلامە، بۆیە خاکی پیرۆزی مککە و مەدینەیان بە جێهێشت بۆ ئەم ئاینە لە پەنا شاخ و شار و کەناری ڕووبارەکان دا شەهید بوون بۆ گەیاندنی ئایینی ئیسلام و بڵاوبوونەوەی.

ئەمە نەهێنیەکە دەبێت هەموو کەس بیزانێت، نەهێنییەکەش بریتییە لە دوو زانست.

یەکەم: خوێندنەوەی کتێبی خوا کە قورئانەکەیەتی و خوای باڵادەست خۆی پێ ناساندوین.

دووەم: خوێندنەوەی درووست کراوەکانییەتی کە گەردوون و مرۆڤ و دروستکراوەکانی دەوروپشتمانە، واتا زانستی (کتاب الله المقروء، کتاب الله المنظور).

ئیتر خوایان ناسی و ئەوانەشی شوێن کەوتووی ئەو هاوەڵانە بوون وەك ئەوان پەروەردە بوون، بێجگە لە پەروەردگار لەکەس نەترسان هەر لەویش




داوایان دەکرد، هەموو کاروبارێکی خۆیان دەگەڕاندەوە بۆ لای پەروەردگاریان.

من چۆن دەتوانم ئەم وتەیەی خۆمتان بۆ بسەلمێنم؟!

وەرن تەماشای ژیانی ئەم هاوەڵانەکەن تەنها نمونەیەك دەهێنمەوە کە ژیانی پڕیەتی لە سەروەری و ئازیەتی و دڵسۆزی و خۆساغکردنەوە بۆ ئەم ئایینە ئەویش عەبدوڵڵای کوڕی حوزافەیە (ڕەزامەندی خوای پەروەردگاری لێبێت).

لە ساڵی ١٩ کۆچی عەبدوڵڵا بە دیل دەکەوێتە بەردەستی ڕۆم و (هەرقل) پاشای ڕۆم خۆی لێکۆڵینەوەی لەگەڵ ئەم هاوەڵە بەڕێزەمان دا کرد، (ڕەزامەندی خوای پەروەردگاری لێبێت).

هەرقل دەبیستێی کە هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خوای لێبیت) هەموو پیاوی ئازا و چاونەترس و خۆڕاگرن، دەیویست تاقیکردنەوە بکات لەسەر چەند دەیلێك کە بەردەستی کەوتووە لەوانە عەبدوڵڵای کوڕی حوزافەیە.

بانگی دەکات و دەست دەکات بە لێکۆڵینەوە لەگەڵی دا، سەرەتا پرسیار لە عەبدوڵڵا دەکات و دەڵێت: من داوایەکت لێ دەکەم ئەگەر کردت ئەوا ئازادت دەکەم.

عەبدوڵڵا کوڕی حوزافە دەڵێت: چییە؟



هەرقل دەڵێت: ببە بە نەصرانی و واز لە ئیسلامەکەت بهێنە، ئەگەر واتکرد، ئەوا من ئازادت دەکەم و وازت لێ دەهێنم و ڕێزیشت دەگرم.

عەبدوڵلا کوڕی حوزافە زۆر بە ئارامی و بە هێمنی دەڵێت: پێم خۆشە هەزارجار بمرم لەوەی کە تۆ بانگی منی بۆ دەکەیت.

هەرقل تووشی یەئس نەبوو، بەڵکو بەردەوامە چونکەن دەیەوێت بڕوای پێ بهێنێت، پێی وت: دەتبینم پیاوێکی خاوەن شەهامەت و کەرامەتیت، ئەوەی کە داوام لێکردیت بیکەیت (واتە بوون بە نەصرانی و مەسیحی) ئەوە نیوەی موڵکی خۆمت لەگەڵ دەکەم بە دوو بەشەوە لە پۆستەکەشم دا دەتکەمە شەریك واتا دەبیتە پاشا!.

واتا ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی چی تێدابێت دەیکات بە دوو بەشەوە لەگەڵ هاوەڵێکی ڕەش و ڕوتی پێغەمبەر (دروودی خوای لێبیت) پاشان لە دیلەوە دەبێت بە پاشای ڕۆما..!

لێرە دا دەبێت عەبدوڵلای کوڕی حوزافە چی بکات؟ چونکە دونیای لا بچووک بوو خوای پەروەردگاری لا گەورە بوو هەموو سەروەت و سامانی هەرقلی لەبەرچاو وەك پوشێك وابوو لە چاوی ئیسلامەکەی دا، هەمووی ناگاتە باڵە مێشولەیەکیش.

بێگومان گاڵتەکردن بە هەرقلی ڕۆم هەروا گاڵتە نییە و قسەی هەرقلیش هەروا ئاسان و سانا نییە لەبەردەم هەموو سیناتۆر و ئەندام پەڕلەمانەکانی دا ئەم قسەیەی کردووە.

عەبدوڵڵای کوڕی حوزافە بە زەردەخەنە و پێکەنین و گاڵتەپێکردنەوە دەڵێت: سوێند بەخوا هەموو ئەوەی کە تۆ خاوەنداری دەکەیت، ئەوەی عەرەب خاوەنییەتی و ئەوەشی لەسەر زەوی دایە بمدەیتێ من واز بهێنم لە دینی محەممەد (دروودی خوای لێبیت) یاخود بۆ چاو تروکانێك من پەشیمان نابمەوە لەم ئایینە، یاخود بڵێ پەشیمان بەرەوە بگەڕێوە بۆ ئیسلام بە چاوە تروکانێك ئەم کارە بکە، بەخوای پەروەردگار ئەویشت بۆ ناکەم، سوێند بە خوا ئەمجارەش هەرچی هەیە لەسەر ئەم گۆی زەوییە بمدەیتێ ئینجا واز لەم ئیسلامە ناهێنم.

هەرقل: ئاخر دەتکوژم!

ئیتر کەوتە ئیرهاب و تۆقاندنی.

عوبدوڵڵای کوڕی حوزافە: چیت لە دەستدێت بیکە.

هەرقل فەرمانی دا کە بەتیر ڕمی بکەن، لە قاچ و دەستییەوە دەست پی بکەن بۆ ئەوەی ئازاری زۆری پێ بگات، فەرمانی دا بەوانەی کە شارەزا بوون واتە قەنصەکانی ڕۆمان، وتیشی مردنم ناوێت دەبێت بە زیندووی بمێنێتەوە.

تەنها بۆ ئەوەی ئیخلاس کەم بکاتەوە و پەشیمانی بکاتەوە لە ئیسلام و بیکاتە نصرانی، بە ڕاست و چەپیدا تیریان دەهاوێشت و هەندێکی بە نەرمی بە قاچ و دەستی دەکەوتن، هەموو جارێکیش هەرقل پێی دەوت پەشیمان نەبیتەوە دەتکوژم، ئەویش بەردەوام دەیفەرموو: چی دەکەیت بیکە، من واز لە دینی خۆم ناهێنم.



هەرقل بەرەو شتێکی خراپتر ڕۆشت کە تۆقان و ئیرهابێکی زۆر گەورە بوو فەرمانی دا کە لە مەنجەڵی گەورە دا تا دەتوانن زەیت و ڕۆن گەرم بکەن تا بەتەواوی دەقرچێت، ئینجا موسڵمانێکی دیلی تریان هێنا خستیانە ناوی، کە دەریان هێنایەوە تەنها ئێسقانەکانی مابوو، هەموو گۆشتەکەی توابووەوە و سووتا بوو، ئەم کارە تۆقاندن و ئیرهابییەش لەبەر چاوی عەبدوڵڵای کوڕی حوزافە (ڕەزامەندی خوای پەروەردگاری لێبێت) کردیان.

دیسانەوە سەر لەنوێ هەرقل داوای کردەوە لە عەبدوڵڵا کە ببێتە نەصرانی، ئینجا لە جاران زیاتر ڕەفزی دەکرد و ڕەتی کردەوە، ئیتر هەرقل ئارامی لێبڕا و فەرمانی دا بیخەنە ناو ڕۆن و زەیتەکەوە، لەو کاتەدا عەبدوڵڵای کوڕی حوزافە ڕەزامەندی خوای پەروەردگاری لێبێت، چاوەکانی پڕ بوو لە گریان، هەرقل لەخۆشیان دا گەڕایەوە وتی: داخۆ چی بێت وا دەستی کردووە بە گریان.

هەرقڵ: کاریگەریمان هەبوو لەسەری پەشیمان دەبێتەوە لە دیینەکەی، وای پەی برد کە گوایە لە مردن دەترسێت، بۆیە گریاوە.

وتی: بۆم بهێنن بزانم بۆچی گریاوە، دیسانەوە وتی ببە بە نەصرانی، ئەویش بەو پەڕی ئازایەتییەوە لە جاران زیاتر ڕەتیکردەوە، ئەوەندەی تر هەرقل تورەبوو بە تووڕەییەوە وتی: ئەی بۆچی دەگری چی تۆی گریاند؟!.

عەبدوڵڵای کوڕی حوزافە (ڕەزامەندی خوای پەروەردگاری لێبێت) وتی: ئاواتە خوازم بەوەی کە چەند ڕۆحێکم هەبوایە لە پێناوی خوا بمبەخشیایە بۆ ئەوە دەگریم، بەڵام کە داخ دەخۆم بۆ ئەوەیە کە یەکجار دەمرم، حەزم




دەکرد لە ڕێگەی خوای گەورە و ئەم دیینە چەند جار گیانی خۆم پیشکەش بە ئایینی موحەممەد بکردایە.

هەرقل: داوات لێ دەکەم بەس وەرە ناو چاوم ماچ بکە ئەوا ئازادت دەکەم.

ئینجا عەبدوڵلا وتی: من مەرجم هەیە ماچی دەکەم، بەڵام دەبێت هەرچی دیلی موسڵمانە ئازادی بکەیت، پەیمانم دەدەیتێ؟.

هەرقل: پەیمان بێت کە ناوچاوم ماچ بکەیت خۆت و هەموو دیلە موسڵمانەکان ئازاد بکەم.

پاشان عەبدوڵلا دەڵێت: لە دڵی خۆم دا وتم ئەگەر من ناوچاوی ئەم دوژمنەی خوای گەورە ماچ بکەم، هیچ زەرەرێکم لێناکەوێت بەم هۆیەشەوە کۆمەڵێك موسڵمان لە مردن ڕزگار دەکەم، هیچ کێشەیەکم بۆ درووست نابێت لە لایەن بیروباوڕکەمەوە.

دەڵیت: ناوچاوی هەرقلم ماچکرد ئەویش هەموو دیلە موسڵمانەکانی ئازاد کرد.

کە ئەم باسەیان بۆ عومەری کوڕی خەتاب گێرایەوە، زۆر خۆشحاڵی خۆی بۆ عەبدوڵلا دەربڕی و داوای لە موسڵمانان کرد کە هەموو هەستن دەرحەق ئەو کارەی کە عەبدوڵلا، ناوچاوی عەبدوڵلا ماچ بکەن، خۆی یەکەم کەس بوو کە ماچی کرد.

کۆتاییم بە باسەکەم هێنا، چاوی خۆم گریانی پیوەبوو وتم: یرزقنا الإخلاص في القول والعمل، وأن یعظم قدره في قلوبنا، حتی لا نری أحدا سواه، إنه ولي ذلك والقادر علیه.

دووعای هیدایەتم کرد بۆ کاك عەبدوڵڵا لە مەجلیسەکە هەڵسا و چووە دەرەوە جگەرەیەکی داگیرساند، ئاگام لێبوو پیاسەی دەکرد.

چووم بۆلای وتم: بەیانی کەی بڕۆین؟

وتی: ماکوان ئەو ژن و مناڵانەم بۆ ئاشت بکەرەوە.

وتم: با بڕۆین بۆ ماڵی مەلا محەممەد ئەو ئیشەکەمان بۆ دەکات إن شاءالله.

لە ئارنێمی هۆڵەندا وە گەڕاینەوە بۆ ئەڵمانیا و ڕووە و هالە کەوتینە ڕێ پرسیارم کرد لە کاك عەبدوڵڵا ماڵتان لە کام شارە؟ ناوی شارەکەی وت، پاشان بردم لەگەڵ خۆم بۆ ماڵی مەلا محەممەد لە ڕێگا قسەمان زۆر کرد لە بارەی دینەوە، ئەوەی کە منی زۆر بێزار کردبوو لەم پیاوە، قسەی زۆر سادە و سانا بوو، پاشان هیچ کاریگەرییەکی ئایینیم نە ئەدی لە سەری جگەرە لەسەر جگەرەش دایدەگیرساند بۆنی تەپڵەکە جگەرەی لێ دەهات، هەرچۆن بوو تەحەموڵم کرد، لە دڵی خۆم دا وتم مادام هۆکاری منە کێشەی بۆ دروست بووە لەگەڵیشم هەڵدەستێت بۆ نوێژکردن، من پەیوەندیم بە دڵ و دەرونییەوە نییە کار لەسەر ڕووکەش دەکەم، دەمووت ئەم کەسە یان زۆر سادەیە هیچ نازانێت، یان وەك ناوچەی پێنجوێنی ئێمە هەرکەس فێڵباز بێت دەڵێت زۆر زۆڵە، یاخود دەمووت ئەمە زۆر زۆڵە.

چوینە ماڵی مەلا محەممەد خزمەتی باشیان کردین.

لەگەڵ مەلا محەممەد دا باسی کێشەکەمان کرد مەلا محەممەد فەرموی کاك عەبدوڵڵا ئێستا خێزان و ماڵ و مناڵت لە کوێن؟

کاکە عەبە: وەڵڵا نازانم!

وتمان: ئەی چۆن بیاندۆزینەوە؟!

کاکە عەبە: ئاشنایەکم لێرەیە ئەو لەوانەیە بزانێت خزمی خۆمانە و هەردوولامان دەناسێت.

داوای جێگا و مەکان و تەلەفۆنی ئەو پیاوەمان کرد لە کاکە عەبدوڵڵا وەرمان گرت، داوامانکرد کە بچینە لای و قسە و باسی لەگەڵ بکەین بەڵکو هاوکارمان بێت.

کاك مەلا محەممەد: کاك عەبدوڵڵا ئەو پیاوەی کە ئێمە دەچین بۆ لای ئەویش کۆمەنیستە؟

کاکە عەبە: بەخوا کاکە ئەو پیاوە دینی هەر نییە.

مەلا محەممەد بە منی وت کاك ماکوان تۆ مەیە.

وتم: بۆ؟!

وتی: کاکە تۆ عەصەبیت ئەترسم توڕەبیت، ئێمە دەچین بۆ ئەوێ کێشە چارەسەر بکەین ئەو ئەگەر قسەبکات لە ماڵی خۆیدایە دەبێت ئێمە بێدەنگ بین.



وتم: بڕواناکەم ئەو کەسە بزانێت ئێمە هەردووکمان خاوەنی ئەم ئیسلامەین و دیندارین ئەوەندە بێحورمەت بێت لە ماڵی خۆی دا قسەبکات جا ئەگەر وای کرد هەڵدەستین و دێینە دەرەوە.

مەلا محەممەد پێی وا بوو کە من نەچم باشترە، کاکە عەبەش زوو زوو دەیوت ماکوان گیان تۆ مەیە قەیناکە خۆمان دەچین تۆ بۆخۆت لەگەڵ کوڕەکانی مەلا محەممەد بڕۆ بۆ پیاسە.

هاتمە سەرئەوەی بە قسەیان بکەم من نەڕۆم، بەڵام لە کۆتاییدا وتم: هەر دێم، وا لێکم دایەوە کە من بۆخۆم طەرەفم لەم کێشەیە دا دەبێت وجودم هەبێت.

کەتینە ڕێ بەرەو هانۆڤەر چوینە ماڵی ئەو پیاوە کە ناوی کاك بەهرۆز بوو لە هانۆڤەر و پێشتر ئاگادارمان کردبووەوە کە دێینە ماڵەکەت، لەوێ ڕیزێکی زۆرمان لێ گیرا.

من بەناوی خۆمەوە خۆم ناساند کە ناوم خەسرەوە و خەڵکی پێنجوێنم وە هەروەها دوای ئەوەی کاك مەلا محەممەد دەستی کرد بە قسە و وتی: دەمانەوێت بچینە لای مەهناز خاتوون، بەڵکو ئاوێك بکرێت بەم ئاگرە دا.

پاش چا خواردن کاك بەهرۆز دەستی کرد بە قسە ڕووی کردە من و کاك مەلا محەممەد.

وتی: یاخوا ئێوە بەخێربێن من ڕێزی هەموو موسڵمانێك دەگرم، جا زۆر خۆش دەوێت کاك خوسرەو بە فارسی، دەستی کرد بە جنێودان بە ماکوان کەریم، بەڵام نەك بە ئیسلام.

وتی کاك خوسرەو کەسێکی تیرۆرستی ئیرهابی پیاوکوژ هەیە لە ناو پاڵتۆک دا کاکە ئەمە ماڵی ئەم کاکە عەبەیەی وێرانکردوە.

ئەم ماکوانە لە جەماعەتی مەلا کرێکارە کاکە خەڵکی بەردەست بکەوێت سەری دەبڕێ، جا ئەم ماکوانە جاشە ئەمە کوڕی شێخە لەگەڵ قاعیدە و ئەو ئیرهابیانەی تردا دەستی تێکەڵە، کە قسەش دەکات لە پاڵتاك و ئەو شوێنانە دا مەلا کرێکار قسەکانی پێ دەڵێت و بۆی دەنوسێتەوە ئەگینا خۆی هیچ نازانێت.

مەلا محەمەد تەماشای منی دەکرد ئەگام لێبوو کاك عەبدوڵڵا غەمگینی هەر دەیویست مەوزوعەکە بگۆڕێت، بەڵام دەسەڵاتیان نەبوو.

هەتا توانی منی پڕ جنێو کرد، منیش بۆخۆم هەردەمووت ڕاست دەکەیت، ئەو ماکوانە هەر زۆر هیچ و پوچە، تۆ بزانە چی کردووە، هەڵسا ڕۆییشت لەلای ئێمە، تکام کرد لە کاك عەبدوڵڵای کاك مەلا محەممەد، وتم هیچ مەڵێن با من ئاشکرا نەبم هەر با وابڕوات ئەم پیاوە خۆی پیاوێکی باش دیارە من ناناسێت تا خۆمی پێ دەناسێنم، کاك عەبدوڵڵا دەستی منی ماچکرد وتی توخوا چی وتوە بۆ من کاك ماکوان خەجاڵەتم، منیش دەستم ماچ کردەوە و وتم کێشەنییە.

جارێکی تر هاتەوە کاك بەهرۆز، داخی زۆر لە دڵدابوو ئەوەندەی تر منی دایەوە بەر جنێو، خەریك بوو ماکوان وا لێبکات، ئیتر وابزانم ١١ سێپتێمبەر و ناردنی زەرقاوی بۆ عێراق هەمووی لە دەستی من دابووە.

منیش زوو زوو دەمووت وەڵڵا ئەم ماکوان_ە عەجیبە، ئەی باشە ئەمە لەکوێیە ئەم کوڕە، ئەی چۆن ئەوڕوپا نایگرێت؟



کاك بەهرۆز: کاکە ئەمانە بەس لەپاڵتاك قسە دەکەن کەس نایناسێت.

وتم: ئەی چۆن ئەو هەمووە شتەی پێ دەکرێت کە کەس نایناسێت؟

وتی: کاکە ئەمانە گروپن دێن و دەچن لە عێراق و ئەوروپا.

شتی وای دەوت لە قتوی هیچ عەتارێک دا دەست نەدەکەوت.

منیش زوو زوو بۆ ئەوەی ئەو ڕقی هەڵسێت، دەمووت براڕۆ ئەو ماکوان_ە چ ئیرهابێکە، حەقە بیکوژن.

وتم: کاکە کەسێك نییە بیکوژێت نەجاتمان بێت لەدەستی؟

وتی: کاکە ئەمریکا دەرەقەتی ماکوان نایەت، کە وای وت زۆر پێکەنیم قاقام لێدا سەیربوو بەلایەوە.

وتم: کوڕە کاك بەهرۆز خۆتۆ دونیات دیوە، ئەمریکا فیلی ساحەیە ئەو قسەیە مەکە ماکوان_ێك چییە، ئیتر وام لێکرد کە تەحلیلەکە و شیکارییەکەی جێگای پێکەنینە.

مەلا محەممەد قسەکانی بە هەردووکمان بڕی، کەوتینە ڕێ بۆ ماڵی مەهنازخان خیزانی کاك عەبدوڵلا غەمگینی و لە ناو سەیارەکەی کاك مەلا محەممەد زۆر پیکەنیم، جەماعەت وایان دەزانی لە ئاخیر دا من حەقی لێدەکەمەوە لێی ئەدەم، یان دەیکەم بە شەڕ.

چوینە ماڵی مەهناز خان حورمەتێکی زۆری لێگرتین و پێشتر کاك بەهرۆز مەهنازخانی ئاگادار کردبووەوە بۆ ئەو کارە دەچینە ماڵیان دوای




دانیشتنێکی کەم، ڕوومکردە مەهنازخان و کاك بەهرۆز لەتەنیشتم دانیشتبوو.

وتم: مەهنازخان من ناناسیت کێم؟!

مەهنازخان: نەخێر بە خزمەت جەنابتان نەگەیشتووم.

وتم: چۆن، من کوڕی جەنابتم و کاك عەبدوڵڵا هاتووە بۆلام بەس لەبەر خاتری تۆ زۆر گۆڕاوە ئەوەی کە تۆ ئەتەوێت ئەو ئێستا ئەوەیە.

مەهنازخان: دەنگت ئاشنایە لام بەس نازانم کێیت.

وتم: زۆر بیری لێمەکەوە، من ماکوان_م ئەوەی لە پاڵتاك قسە دەکات، لە دوای ئەوەی کە خۆم ئاشکرا کرد لەلای مەهناز خان، لەبەر ئەوەی کاك بەهرۆز لە تەنیشتمەوە بوو ئاگام لێی نەبوو دەموچاوی چی بەسەر هات، من خۆم تێك نەدا و بەردەوام بووم لەگەڵ مەهناز خان دا.

بەڕاستی ئافرەتێکی زۆر مەهناز و بەڕێز و خاوەن حوورمەت بوو، دوای نان خواردنێکی خۆش و بەلەزەتی سنەیی بەناوی فسنجان کە بۆ یەکەم جار بوو بیخۆم لە هەموو ژیانم دا.

پاشان کاك عەبدوڵڵا_م هەڵساند بچێت لە مەتبەخەکە لەگەڵ مەهناز خان هاوکاری بکات.

کاتی نوێژ هات کاکە عەبە پێش ئێمە هەڵسا و وتی: با نوێژەکەمان بکەین.



منیش بۆ خۆشی وتم: کاکە عەبدوڵڵا لەبەر خوایە یان لەبەر خاتری مەهناز خانە.

مپڕەیەکی لێکردم و پێکەنی، ئینجا بیرم کەوتەوە پیاوێك لە تەنیشتمەوەیە بێ دەنگ چرکە ناکات.

وتم: کاك بەهرۆز با تا دەرەوە بڕۆین هەندێك قسە و باس بکەین، پیاسەیەك بکەین بەیەکەوە، ئاگام لێبوو سڵی کردەوە لە من، کاك مەلا محەممەد وتی جارێ نا دوایی هەمووومان بەیەکەوە دەڕۆین پیاسە دەکەین دەچینە سەنتەری هانۆڤەر.

وتم: نا کاکە وازمان لێبێنن من حەز دەکەم لەگەڵ ئەو پیاوە دوو قسەی تایبەتی بکەین لە دەرەوە، ئەو هەڵسا و کاك عەبدوڵڵا و کاك مەلا محەممەد_یش بە دواماندا هاتن لە دوامانەوە دەرۆیشتن.

وتم: کاك بەهرۆز من ئەو ماکوان_ە ئیرهابیەم کە تۆ قسەت پی وت لە ماڵەکەی خۆت دا، من نە ئیرهابیم و نە پیاو کوژ و نەخەڵك سەردەبڕم، تۆ دەبوو منت بناسیبا، ئینجا قسەت لەسەر بکردبامایە، کوڕی باش تۆ من ناناسیت، بە خزمەتی مامۆستا کرێکار نەگەیشتویت ئەم هەمووو قسە سوکەت بە ئێمە وت، ئاخر وەرە بزانم لە کوێ منت دیوە پیاو بکوژم؟ لەکوێ منت دیوە کارێکی خراپم کردبێت؟ من ناڵێم فریشتەی ئاسمانم، بەڵام لە چاو قسەکانی تۆ کە کردت بەرامبەرم وەڵڵا من فریشتەم.

دەی سوێند بەخوا ئەتوانم ئێستا لێرە دا بتدەمە بەر چەقۆ لە دەستم دێت و ئەشتوانم، بەڵام بە قەوڵی خۆتان کاکە خۆ من چەقۆکێش نیم من خاوەنی پەیامێکم، لە پاڵتاك لە کۆڕ و لە سمینارەکان دا هەوڵ دەدەم و

هەرچی بۆم بکرێت ئەم دینە ئەیگەیەنم، ئێوە بۆ نایەن جارێك لەسەر پەیامەکە قسەبکەن، بۆ شتم بۆ دروست دەکەیت کە نامناسیت.

ویستی قسەبکات نەمهێشت، بەردەوام بووم لە قسەکانم.

وتم: ئاخر تۆ و ئەوانەی وەك تۆ وان بۆیە ئێران توانی بە شیعەگەری خۆی سەرکەوێت بەسەرتان دا خۆشتان نەتان دەزانی داوای چی دەکەن، ئەگەر وەك شیعەکان ئێوەش مەزهەبی شافیعەیەکەتان زیندووبکردایەتەوە، یاخود ئەهلی سەلەفەکە ئێستا حاڵتان بەم حاڵە نەدەگەیشت.

ئاخر تۆ کە چەپی دەبوو راستگۆ بویتایە لەگەڵ خۆت و پەیامەکەشت، کاکی خۆم هەرچی دەکەیت بەس ڕاستگۆ بە، مرۆڤ لەسەر بنەمای درۆ هیچی بۆ ناکرێت، ئێوە درۆزنن و درۆشتان لەگەڵ میللەتی خۆتان کرد قسەی زلتان بۆ کردن دوایی هەموشتان ساحەتان چۆڵکرد بۆ کۆماری ئیسلامی ئێران.

دەمەوێت پێت بڵێم ئەوە منێکی ئیسلامی، کە کێشە لەسەر من درووست بوو ئامادە بووم هەموو خزمەتێك بە هاوشاریەکەی تۆ بکەم، بەڵام ئێوە توانای ئەوەتان نەبوو هاوکاری ڕەفیقەکەی خۆشتان بکەن، ئینجا بە خوای ئەرز و ئاسمان کە ئەو قسانەت کرد قبوڵم کرد، زۆر گەورە نەبوو لەسەر دڵم، چونکە قسەت بە خۆم وت و ڕێزی ئیسلامەکەت گرت، هەرچەند قسەکانت سەراپا درۆ بوو، بەڵام من هاتمە ماڵەکەت نانم خوارد چام تێدا خوارد من خۆم بە موسڵمان دەزانم پاشان عەشاییەرم بۆیە هیچ لە دڵم دا نییە، کەسێکی بەڕیزی لام فەرموو تۆش قسەی خۆت بکە.

کاك بەهرۆز وتی: کاك ماکوان من موقەصیرم و خەجاڵەتم، بەڕاستی نازانم بڵێم چی.

وتم: هیچ مەڵێ و کۆتایی بەم کێشەیە هات.

بەردەوام بوویەو لە قسەکانی و وتی: کاکی خۆم من هەڵەم کرد بەرامبەرت، تۆ لە گەورەیی خۆت قسەت نەکردووە، پاشان منیش ڕەخنەیەکم هەیە دەبوو خۆت بە ماکوان بناساندایە تا منیش مەوقعی تۆم دەزانی، بەهەر حاڵ ئەمە مانای وانییە کە من ئیسلامم خۆش بووێت یان موسڵمانان، منیش خاوەنی پەیامێکم دەمەوێت بگەینم بە مرۆڤ دۆست و خۆشنودی و ئازادی یە بۆ مرۆڤەکان.

وتم: کاك بەهرۆز کە نەموتوە ماکوان_م خۆم لە ڕاستی دا ناوم خەسرەو_ە و نازناوی نووسین و ئەدەبیم ماکوانە، درۆم لەگەڵ نەکردویت.

گریمان خۆشم نەناساند تۆ هەربەم شێوەیە مامەڵە دەکەیت؟ ئەوە کارێکی باش نییە ئێمە قسەمان لەسەر ئەوەیە لەخۆتەوە قسە مەکە تا کەسێك نەناسیت، خۆ من ناحەقی تۆ ناگرم بە تەنیا ئەوە تەبع و سروشتی هەموو کورد وایە، ڕۆژ نییە لەم ئیسلامیانەی لای منیش نەچن و بچپێنن بەگوێی یەکتریدا، بە جاسوس لە قەلەممان ئەدەن بێ ئەوەی بەڵگەیەکیان لەبەر دەست دا بێت هەروەك تۆ یان لە بەخیلیە یان قسە فڕێدانە یاخود لەگەڵ حیزبەکانیان نییم، جا نازانم ئەو خوایە کە سوێندی پێ دەخوات هەر وا ئاسانە، تۆش هەر لەو تەنعانەی ئەوان جاروبار لە خوا دەترسن تۆ ئەوەیشت نییە کاکی خۆم، ئینجا فەرموو وەرە من و جەنابت لەسەر دین




و ئەم ئایینی ئیسلامە و خوایە با موناقەشیەك بکەین لە کوێ پێتخۆشە؟، من ئامادەم.

بەهرۆز وتی: باشە.

وتم: بەو مەرجەی تەوەرە دیاری دەکرێت، کە من تەواو بووم ئینجا تۆ قسەبکەیت، پاشان دەبێت خەڵکێکی حەکەم لە نیوانمان دا هەبێت دوور لە بیروباوڕی هەردووکمان، ئەوە مەرجی منە، تۆش چی دادەنێیت لە تەوەر و باس فەرموو من ئامادەم.

## دیبەیتەکە و مردنی کاکە عەبە:-

داوامکرد تەوەرەکان لەسەر چی بێت بۆئەوەی دیبەیتەکە لەگەڵ بەهرۆز دەست پێ بکەین.

بەهرۆز تەوەرەکان با ئەمانە بن:-

لەسەر ئەوەی من بڕوام بەخوا نییە و خوا هەر نییە.
زانست و قورئان.
دەسەڵاتی ئیسلامیی و سەنگباران و کوشتنی خەڵکی و فەتحی وڵاتان.
ئافرەت و مافی مرۆڤ بە گشتی.

لە گەڕانەوەمان دا داوام کرد لە کاك عەبدوڵڵا کە کێ دەناسێت لەم دەوروبەرە لە دکتۆر لە خەڵکی ڕۆشنبیر دەعوەتی بکات.

ئەو شەوە کەسمان دەست نەکەوت داوام کرد لە کاك مەلا محەممەد و کە هیچ تەداخول نەکات بە چاك و خراپ.

دانیشتین و دەستمان کرد بە قسە...

وتم: کاك بەهرۆز تۆ چۆن بڕوات بە خوا نییە، ئاخر لەم بوونەی ئێمە دا خەڵکێکی زۆر شاز بڕوای بە خوا نییە چۆن شتی وا دەبێت؟

کاك بەهرۆز دەستی کرد بە قسە و وتی: ئەم ژیانە هەموو لەسەر ماددە بونیات نراوە، ماددەش بۆخۆی کۆنە و عونصورێکی قەدیمە، ئەم هەموو سیستەمەی کە ئێستا هەیە لەم گەردوونە دا ناشێت دەستی

خوایەکی بەسەرەوە بێت، کە ئەوەندە گەورەیە خاوەنی هێزە، لە دوو تەوەر بەدەر نییە یان گەردون و ماددە خوایە و بێ گیانە یان خوا وجودی نییە.

هەموو خوایەك کە درووستی دەکەین دەستکردی خۆمانە چۆن خوایەك وەك مارکس دەڵێت: بزوانە واتە (محریکە) پاشان نەزاوتیشە!یان مومکینە یان غەیر مومکینە، ئەمە فەلسەفەی سروشتە واتا مرۆیی ئەمەی ئیسپات کردووە کە نەخشاندنی گەردون بە ماددە ڕێکخراوە و نەخشێندراوە، پاشان هەمووی سروشت بە ڕێکەوت ڕێکی خستووە.

کەس دەتوانێت خوای موسڵمانان نیشان بدات، کەس دەتوانێت ئەو هەموو هێزە کیمیاییە و تەفاعولە فیزیاییەنە نیشان بدات کە چۆن خودا دەستی لەسەری هەیە لە بچوکترین بەشی ئەم گەردونە دا بە چرکە گۆڕانکاری دەبێت.

ئاخر ئەم خوایە چۆن ئاگای لەم هەموو وردەکاریانە هەیە، پاشان لەسەر ئەم ژینە دا بێ پایان کرم و زیندەوەر و نەبات هەمووی کار دەکات، هەمووی ئەمانە بەگوێرەی سیستەمی سروشتن.

تۆ بڵێیت یەك خودا سەرپەرشتی بکات؟!ئاخر لە ناو ئیسلام دا چی هەیە کە من والێبکات بڕوام بۆ دروست ببێت وەك مارکس باسی ماددەیەت و تەفسیری ماددە و مێژووی ماددە دەکات، هەمووی بە زانست و پاشان لە ڕووی پێگەیشتنەوە و داروین و لە ڕووی کۆمەڵایەتی دۆرکایم و پاشان فرۆید و هەموو ئەمانە دەتوانن وەڵامی پرسیاری ڕێکی

و جوانی ئەم سیستەمە بدەنەوە بە زانست، نەك بە تەنها وشەیەك كە ئێوە خۆتانی لێ دەدۆزنەوە و ناوتان ناوە خوا.

پاشان من وەڵامی ئەم گەردوونەم دەوێت لای ئەو خوایەی تۆ؟

من دەمەوێت بزانم ئەو خوایە و موسڵمان و ئیسلام چی بە من ئەدات، ئەم قورئانەی ئێوە نابێت شتێك بدات بە من كە سوودی لیوەربگرم، ئاخر مەنصوری حیكمەت قسەیەكی زۆر جوانی هەیە دەڵێت: ( من كە تۆم دەوێت تۆش دەبێت پێم ببەخشیت بۆ ئەوەی تێربم)، ماركسیزم و ئەدەبیاتی چەپ وڵامی هەموو ئەم پرسیارانەی منی داوەتەوە، ئینجا مەرجی سەرەكی پێكهێنانی بەرهەمهێنان كۆمەڵگایە نەك ئایین، ژێرخان و سەخان ژیان و شارستانی درووست دەكات، چیینە كۆمەڵایەتییەكان و خەباتی چینایەتی ململانێ دروست دەكەن نەك ئایین.

پاشان شۆڕشی سۆسیالیستی هاندانی مرۆڤە بۆ دەستەبەركردنی ئازادییەكان، بەدرێژایی مێژوو ئیسلام هەر خەریكی كوشتن و بڕین بووە لیرە دا من وەستاندم.

وتم: بڕیارمان وابوو تەوەرێك تەواو بكەین ئینجا بچینە سەر تەوەرێكی تر، وایە؟.

بەهرۆز: وایە.

وتم: مادام وایە قسەكانی خۆت تەواو بكە لەسەر خوا و ئەم گەردونە، فەلسەفە مومكین و نامومكین و ڕێكی سیستەم جوانی سیستەم و خراپییەكانی تەفسیری مادده بكە و مێژووی مادده باس بكە.

کاك بەهرۆز: من پرسیاری خۆم خستە ڕوو فەرموو وڵام بدەرەوە.

وتم: من وڵامی ئەم شەش پرسیارەت ئەدەمەوە کە لە قسەکانتا کردت.

یەکەم: ئەم جیهانە چۆن سەری هەڵداوە/

دووەم: چۆن بە گوێرەی ئەم سیستەمە سەرسوڕهێنەرە هەڵدەسوڕێت؟

سێیەم: ئایا سەرەتای هەیە؟ مێژووی مارکسیزم.

چوارەم: ئایا کۆتایی هەیە؟ جەدەلی مارکسیزم.

پێنجەم: ئایا بە ڕێکەوت هاتۆتە گۆڕێ؟

شەشەم: ئایا دروستکارێك دروستی کردووە و هیناویەتییە دی؟

بێ گومان بۆ وڵام دانەوەی ئەم پرسیارانە، ئایدیای مرۆڤ و تێگەیشتنی لەم بونەوەرە کە ژیان پێکدێنێت، بە شێوەیەکی کاریگەرانە هاوبشی دەکات لە چارەنووسی مرۆڤ و جۆری و شارستانییەتی و ژیانی کۆمەڵایەتی و کەسایەتی تاك، ئارامگرتنی دەرونی ئەو کەسایەتییە، ئەگەر ئەم وڵامانەی دەست نەکەوت ئەوکات مرۆڤەکە توشی دڵەڕاوکێ و سەرگەردانی دەبێت، تووشی بێ چارەی و کەسێکی وێرانی لێ دەردەچێت.

بۆ ئەم مەبەستە زانایان و فەیلەسوفەکان و خاوەن بیرەکان هەوڵیان داوە هەریەکەیان لە ڕێگەی ئەقڵ و هۆشەوە لە ڕەوتی تاقیکردنەوە زاستییەکان، وڵامی ئەم پرسیارانە بدەنەوە.

من دەمەوێت لەم باس و لێکۆڵینەوەیە دا هەندێك لەم وڵامانە بخەمە ڕوو، مەرج نییە من بتوانم ئەم بابەتە بەو شێوەیەی کە بیرمەندەکان توانیویانە باشتر ڕوونی بکەمەوە، بەڵام هەوڵێکە تا بتوانم بیری خۆم بخەمە ڕوو.

1 - ئەم جیهانە چۆن سەری هەڵداوە؟

کەواتە خاڵی سەرەتا لێرەوەیە، سۆنگەی بیرکرنەوە ئەوەیە کە چۆن سەرهەڵدانی ئەم جیهانە و سەرەتای ڕەوتی ئەم جیهانە بە ماکەکەی هەیئەتەکەی و یاساکانی لێکی بدەینەوە ئەوە ڕوون بکەینەوە کە چۆن سەری هەڵداوە؟

بۆ باسکردنی ئەم بابەتە چەندین بەڵگەی ئەقڵی و ویژدانی هەن لەو بەڵگانەی کە مرۆڤ ژیانی ئاسایی خۆیانی پێ دەست پێکردوون، سەرباری لێکۆڵینەوەکانی فەیلەسوف و زاناکان، ئەو لێکۆڵینەوەنەی کە دروستکردنی ئەم جیهانەمان لەلایەن داهێنەر و بەدیهێنەرێکەوە یان خوڵقێنەرێکی کارسازەوە داناوە کە بۆی دەسەلمێنیت هەروەك زانستیش بە تەواوی بەشەکانییەوە لە فیزیك و گەردوونناسی و پزیشکی و ڕووەکناسی زیندەوەرناسی و...هتد، توانیویەتی لایەنێکی گرینگمان بۆ دەربخات لایەنێك کە شاراوە بووە لە ئێمە لە تەفسیر و لێکدانەوەی ئەم جیهانە دا، هەروەك توانیویەتی تیۆر و کۆمەڵێک بیردۆز کە خوا نەناسەکان دایانناوە هەڵی بوەشێنێتەوە و بەڵگەکانیان بە درۆ بخاتەوە کە بە درۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەم بەڵگانە قەڵا و کۆشکی بیرکرنەوەی بێ باوەڕەکان یان ماتریالیزمەکان داڕوخاوە.

ئایدیای خوا پەرستی بە بەڵگە و تاقیکردنەوەی هەڵپەسێندراوەکانی زانست قایم و پتەو تر بووە، پاش ئەوەی بێباوەڕی تیۆری خۆی لەسەر دوو بنەمای فەلسەفی بنیاد نابوو، ئەو دوو بنەمایەش بریتین لە:

یەکەم: تیۆری مادده دێرینەکان یان دێرینەی مادده ئەم بیردۆزە لافی ئەوە لێدەدات کە مادده کۆنە و هەر بووە، نە سەرەتای هەیە و نە کۆتایی ئەمەش مانای ئەوە دەگەیەنێت کە مادده خوڵقێنەرێکی نییە وە هیچ کارزاسێك یان بەدی هێنەرێك نەیهێناوەتە گۆڕێ وە جیهانێکی تریش بەدوایدا نایەت.

دووەم: پشت بەستن لەسەر تیۆری ڕێکەوت و ڕەفزکردنی بنەما هۆکارییەکان ئەم بیردۆزە وا دەبینێت کە جیهان لە ڕێگەی ڕێکەوتەوە سەری هەڵداوە و دروست بووە، داهێنەر و بەدیهێنەرێك نەیهێناوەتە کایەوە بێ نەخشە و پلان دروست بووە.

بەڵام بەداڕوخانی ئەم دوو تیۆرە بیردۆزییە بە دەستی زانستی تاقیگەری فەلسەفەی بێ باوڕەکان هەرەسی هێنا هەرەس هێنانێك بە بەڵگە سەلمێنراو، وێرای هەرەسهێنان و داڕمانی ئەقڵ و فەلسەفی ڕوتە ماتریالیزمەکە ئیتر ئەم دوو تیۆرە لە دیدەی زانستەوە بوونە ئەفسانە و گریمانێکی خەیاڵی، جا بۆ ئەوەی ئەم دوو تیۆرە نمونەکانیان لە بیروباوڕەکانی دیکە بخەینە سەرباس و لێکۆڵینەوە، بەڵام باس و لێکۆڵینەوەکە لەسەر بناغەی تیۆری بەڵگەی زانستی و فەلسەفییەکان بنیاد بنێین، واتا با بیردۆزی بێ باوڕی بخەینە ژێر باس و لێکۆڵینەوە لەسەر بنچینەیی وەك ئاماژەمان پێ کرد بەڵگەی تاقیکەری یان بەڵگەی ڕەوتی

ئەقڵی بەم جۆرەی خوارەوە کە دەتوانین لەسەر سێ بنەمای زانستی و فەلسەفی ڕوونی بکەینەوە.

یەکەم: بەڵگەی نەخشاندنی ڕێکی و جوانی سیستەم.

دووەم: بەڵگەی جوڵە و بزواوتن و نەجوڵاندن لە خۆوە نەبزواوتن.

سێیەم: بەڵگەی پێچون و لەوانەیی (ئیمکان).

بەڵگەی نەخشاندنی ڕێکی و جوانی سیستەم:-

بێگومان نیگایەکی زانستی کە مرۆڤ دەینەخشێنێت بە جیهانی سروشت و مرۆڤ و ڕووەك و ئاژەڵ و...هتد، هەروەها بەوەی کە تێیدایە لە وردی و کارسازی دەردەکەوێت کە ئەم جیهانە پیویستی بە نەخشەکێشان و سازکردن و وێسگەیەکی پێشتر هەیە خۆی بەڵگەیە لەسەر بوونی پەروەردگار کە خوایەکی دانا و زانا و بە توانا زۆر بەجوانی و بە وردی و بە ڕوونی، بە لەناو بردنی بیری ڕێکەوت و پوچ کردنەوەی، یاخود ئەزەلیەتی ماددیەتت بۆ دەردەکەوێت ئەوەی کە تیۆری بێ باوەڕی و فەلسەفەکەی بوو، بیرکردنەوەی پێچەوانە و دژ بە ئایدیا خواپەرستیەکەی لەسەر بنیاد نراوە.

لێکۆڵینەوە و باسە زانستییەکان مەحاڵ بوونی پێکهاتنی جیهانیان بە ڕێکەوت لە ڕووی کات و زەمەن و پێکهاتنی واقیعییەوە سەلماندووە کە ئێمە لەم باسە دا لایەنێك لە باس و لێکۆڵینەوە و بەڵگە زانستیانە ڕوون دەکەینەوە کە زانایانی سروشت و زیندەوەرناسی سەلماندویانە، تیۆری ڕێکەوتیان لە دوو بواری سروشت و ژیان دا بە درۆ خستۆتەوە بۆ هەر

ئەقڵێکی خاوەن هزری زانستی بوونی دانایی و هودە زانستی ویست و نەخشەکێشانی پێشتر بۆ ئەم جیهانە دەردەخات، جا لە بواری سروشت دا زانایان دەڵێن: لە سەرەتاوە ئەستێرەیەکی گەڕۆکی بچووکمان هەبووە کە ئەویش زەوییە، ئەم ئەستێرەیە چەشنی نیشتمانێك بووە بۆ درووست کراوەکانی مرۆڤایەتی، کە پاش زنجیرەیەك گۆڕانکاریی لە ماوەی دوو بلیۆن ساڵ یاخود زیاتر دا بۆتە جێگایەکی لەبار بۆ ژیانی زیندەوەری و ڕووەکیی کە ئەمانە یارمەتی گەشەکردنی و هۆیەك بوون بۆ سەرهەڵدانی مرۆڤ، خرۆکەی زەوی لە هەر بیست و چوار کاتژمێرێك دا جارێك یاخود بە تێکڕای نزیکەی (١٠٠٠) میل لە کاتژمێرێک دا بە دەوری تەوەری خۆی دا دەسوڕێتەوە.

گریمان کە زەوی بە تێکڕایی (١٠٠) میل لە کاتژمێرێك دا دەسوڕێتەوە، بۆ وانەبێت؟

ئەگەر وابێت ئەوا ئەوکات شەو و ڕۆژمان بە ئەندازەی دە ئەونەدەی تر درێژ تر دەبێتەوە.

کەواتە لەم بارو دۆخە دا خۆری هاوین هەموو ڕۆژێك ڕووەك و گژوگیاکانمان دەسووتێنێت و بە شەویش تەواوی ڕووەکی سەرزەوی وشك دەبن.

لە کاتێک دا ئەو خۆرەی کە سەرچاوەی تەواوی ژیانە پلەی گەرمییەکەی دەگاتە (١٢) هەزار پلەی فەرەنهایت و خرۆکەی زەوی تێمە بە ئەندازەیەك لێی دوورە بەسە بۆ ئەوەی کە ئەم ئاگرە زۆرە گەرمای پیوستمان پێ ببخەشێت و لەویش زیاتر پێویستمان نییە، ئەم دوورییەش

به شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر ڕێژەیەکی نەگۆڕە، کە لە ماوەی ملیۆنەها ساڵ دا گۆڕانکاری کەمی بەسەر دا دێت، بە جۆرێك کە بەردەوام بوونی ژیان بەو جۆرەی کە پێی ڕاهاتووین مومکینە، کە ئەگەر بهاتایە و پلەی گەرمای سەر زەوی لە ساڵێك دا بە تێکڕای پەنجا پلە زیادی بکردایە ئەوا تەواویی زیندەوەرانی سەر زەوی هەمووی دەسووتان و لە ناو دەچوون.

خرۆکەی زەوی بە تێکڕایی (١٨) میل لە خولەکێك دا دەسوڕێتەوە، ئەگەر بهاتایە و تێکڕایی سوڕانەوەکەی بۆ نموونە (٦) میل یاخود (٢٠) میل بوایە لە خولەکێک دا ئەو کات دووری یاخود نزیکی ئێمە لە خۆرەوە بە شێوەیەك دەبوو کە ژیانمان لەگەڵی دا دەیبەست، لە هەمان کات دا ئەستێرەکان بەو شێوەیە جیاوازیان دەبێت لە جۆری تیشکدانەوەیان دا، بەشی زۆری تیشکەکانیان هەموو جۆرە خانەیەك لە ژیان دا دەمرێنێت.

هەروەها چڕی و بارستایی ئەم تیشکدانەوەیەش کەوا لە نێوان کەمتر لە تیشکدانەوەی خۆرەکەمان و زیاتر لەوەی دە هەزار جارە، ئەو کات دووری و نزیکی ئێمە لە خۆرەوە بە شێوەیەك دەبێت کە جۆری ژیانمان لەگەڵ ئەو چەشنە ڕابهاتایە یان ئەگەر ئەم خۆرەی ئێمە تەنها نیوەی تیشکدانەوەی ئێستای بدایەتەوە ئێمە دەبووین بە سەهۆڵ، ئەگەر بە ئەندازەی نیوەی ئێستا زیاد بووایە ئەوە زۆر لە دێرینەوە ئێمە ببوینە خۆڵەمێش.

لە هەمووی گرینگ تر ئەوەیە ئەگەر بمانتوانیایە (پڕۆتۆ پلازمێك) (شانە) یەکمان بۆ ژیان درووست و بەدیبهێنایە ئەوا تێدەگەیشتین کە تەنها هەر ئەم خۆرەی ئێمە لە بارە بۆ ژیان لە نێوان ملیۆنەها خۆری نا پوختە لە گەردوون دا.




پاشان هەر ئەم خڕۆكەی زەوییە لارە بە گۆشەیەك كە ئەندازەكەی (٢٣) پلەیە.

ئەمە لەبەر چەند هۆیەكە كە خڕۆكەی زەوی دەخوازێت، بۆ نمونە ئەگەر ئەم زەوییە مەیلەو لار نەبوایە هەردوو جەمسەری زەوی هەمیشە لە شەو دا دەبوو.

لەم دۆخە دا هەموو هەڵم لە ئۆقیانوسەكانەوە هەڵدەستا بە ڕاست و چەپدا یان بەرەو باكور یان باشور دەڕۆیشت و لە كاردانەوەی خۆی دا چەندین كیشوەری بە سەهۆڵ دادەپۆشی، ڕەنگە بیابانێكی لە نێوان هێڵی یەكسان سەهۆڵ بەندانێكی دروست بكردایە، ئەگەر ئەمە ڕوویبدایە ئەوا لەم دۆخە دا چەندین ڕوبار لە سەهۆڵ بەندانەوە هەڵدەسان و لە ڕێگایی شیوو دۆڵەكانەوە دەڕژانەوە ناو ئۆقیانوسێكی بە خوێ داپۆشراو لەم حاڵەتە دا هەموو زەوی دەبوو بە كانێكی خوێ حەوزێكی پڕ لە خوێ لەسەر زەوی دروست دەبوو.

دووری مانگ لە ئێمەوە (٢٤٠) هەزار میلە گریمان (٥٠) هەزار میل لە ئێمەوە دوور بوایە لەم حاڵەتە دا هەموو زەوی دەكەوتە ژێر ئاو لە ڕۆژێكا دوو جار نغرۆ دەبووین، بەڵام ئاوێكی بە كوژم كە كێو و چیاكانی ڕادەماڵی هەرواها سەر زەوی دەبووە گێژەلوكە و ڕەشەبا لەم ئارامییەی ئێستا نەدەماو زەوی دەبوو بە ترسناكترین خڕۆكە.

با نمونەیەكی زانستی تر بهێنینەوە بۆ بەدرۆخستنەوەی ڕێكەوت سەلماندنی پێویستی ئەم بوونە بە نەخشە كێشێك و كارسازێك كە ئەندازەگیری ڕێكی سیستەم داڕشتووە.



بۆ نموونه له لێکۆڵینەوه زانستییه‌كان دا هاتووه که:-

با ئۆکسجین بکه‌ینه نمونه‌یه‌ك و بیگرین به ده‌ستمانه‌وه بۆ ئه‌وه‌ی کارسازی و ڕێکوپێکی سیسته‌می ئه‌م جیهانه‌مان بۆ ده‌ربکه‌وێت که خوایه‌کی به‌هێز و ده‌سه‌ڵاتدار دایمه‌زراندووه، ئه‌و هه‌وایه‌ی که له ژووروی زه‌وییه‌وه‌یه بریتییه له (ئۆکسجین، نایترۆجین، ئارۆجین، نییۆن، کۆنسیۆن و کاریبتۆن).

هه‌ر ئه‌م هه‌وایه هه‌ڵمی ئاوی گرتۆته خۆی، هه‌روه‌ها دووه‌م ئۆکسیدی کاربۆنی به‌ڕیژه‌ی (٠.٣) له (١٪) یان سێ به‌شی (١٠٠٠٠) تێدایه، گازه‌کانی تر خۆیان ده‌نوێنن له شێوه‌ی ڕه‌نگی سوور و شین و سه‌وز دا، به‌ڵام ئارۆجین ئه‌و گازه‌یه که به‌ڕێژه‌ی (٠.٦) له (١٪)له هه‌وا دا هه‌یه ڕووناکییه‌کی گه‌شاوه‌مان پێ ده‌به‌خشێت که ژیاری به‌ره‌و پێش ده‌ڕوات له هه‌ر شوێنێك دا به کاربهێندرێت ئه‌وا نایترۆجین به ڕێژه‌ی نزیکه‌ی (٧٨٪) له هه‌وا دا هه‌یه، له کاتێك دا ڕێژه‌ی ئۆکسجین له هه‌وا دا به (٢١٪) دیاری ده‌کرێت.

هه‌وا به تێکڕای خۆی گوشار ده‌خاته سه‌ر زه‌وی نزیك به ئه‌ندازه‌ی (١٥) ڕه‌تڵ له سه‌ر هه‌ر قلانچکێکی چوارگۆشه له ڕووبه‌ری زه‌ویی به ئاست ده‌ریا، که هه‌ر ڕه‌تڵێکیش بریتییه له (٢٥٦٤) گرام، له ڕاستی دا ئۆکسجین له هه‌وا دا خۆی به‌شێکه له‌م گوشار و پاڵه‌په‌ستۆیه، که ئه‌ندازه‌ی ده‌گاته (٣) ڕه‌تڵ له سه‌ر قولانچکێکی چوارگۆشه.

بۆ ماوه‌ی ئۆکسجینه‌که‌ی تری گه‌مارۆیه له شێوه‌ی چه‌ند ئاوێته‌یه‌ك له توێژاڵی زه‌وی دا، ئه‌م به‌شه (٠.٨)ی سه‌جه‌م ئاوی جیهان پێکدێنێت لای




هەمووان ئاشکرایە کە ئۆکسجین شەماڵی ژیانە بۆ هەموو زیندەوەرانی سەر زەوی بۆ ناسینی ئۆکسجین جگە لە هەوا لە هیچ سەرچاوەیەکی تر چنگ ناکەوێت.

ئێستا لە هاوکێشەکان بپرسین چۆن ئەم توخمە پڕ لە چالاکییە لە ڕووی کیمیاییەوە دەرباز بوو لەو یەکگرتنەی کە هەیەتی لەگەڵ ئەو توخمانەی تردا و لە هەوا دا نزیك بەهەمان ڕێژەی پیویستی داینراوە بۆ تەواوی بوونەوەرە زیندووەکان.

گریمان ئۆکسجین لە بڕی ئەو ڕێژەیەی کە ئاماژەمان پێکرد ڕێژەکە لە (٥٠٪) یان زیات بوایە ئەو کاتە هەموو ماددەکان قابیلی سوتان دەبوون لە جیهان دا بەئەندازەی خێراییەك گڕیان تێبەردەبوو کە زەوی دەبووە جەنگەڵی گڕکان یان بە پێچەوانەوە ئەگەر ڕێژەی ئۆکسجین لە (١٠٪) یاخود کەمتر بێت، بەڵام لەم حاڵەتە دا ئەم توخمانەی کە ئێستا هەن بەکار نەدەهاتن بۆ نمونە ئاگر، ئەگەر ئۆکسجینی ئازاد ئەو تەنها بە شەشی لە نێوان چەندین ملیۆنەها بەشی ماددەی زەوی دا هەڵبمژیبایە ئەو کاتە هەموو ژیانی زیندەوەر لە خێراترین کات دەوەستا.

گریمانێکی تر بۆ بە درۆخستنەوەی ڕێکەوت و سەلماندنی داهێنەر واتە (خودا).

ئەگەر زەوی بە دەوری خۆی دا خێراتر بسوڕایەتەوە لەوەی کە ئێستا هەیەتی هەرچی خانو و بینا و شاخ و دار هەیە پرژوو بڵاو دەبووەوە بە جۆرێك کە زەوی خۆی لەت و پەت دەبوو، ئەمە لە ئەنجامی سوڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆی دا بە شێوەیەکی خێرا وەك چۆن دەزووی کۆلارە



بەدەست کەسێکەوە دەپسێت ئەگەر بە خێراییەکی زۆر بسوڕێتەوە دەبێتە هۆی تەئسیری هێزی ڕاوەنە لە چەقەلانییەوە یان ئەگەر بە پێچەوانەوە بە هێواشی بسوڕایەتەوە بە دەوری خۆت دا بۆنموونە لە ماوەی (١٠٠) کاتژمێر دا بسوڕایەتەوە لە بری (٢٤) کاتژمێر دا ئەوکات هەرچی سەر زەوی بوو هەمووی دەمردن و لە ناو دەچوون بە هەموو زیندەوەرەکانییەوە بەهۆی گەمارۆی وێرانکاری خۆرەوە.

هەموو ئەمانە شایەتن لەسەر بەدیهێنەرێکی کارساز و باڵادەست حیکمەتی ئەوەمان بۆ ڕۆشن دەکەنەوە لەگەڵ گونجاندنی ژیانی مرۆڤ و زیندەوەرانی تری سەر زەوی کە بێگومان لە توانای (ئانارشیستی دا) نییە کە بتوانێت ئەم بوونەوەرە پان و پۆڕ و فراوان و گەردوونە ڕێکوپێکە بهێنێتە بەرهەم، خوای گەرە دەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تَحۡمِلُ كُلُّ أُنثَىٰ وَمَا تَغِيضُ ٱلۡأَرۡحَامُ وَمَا تَزۡدَادُۚ وَكُلُّ شَيۡءٍ عِندَهُۥ بِمِقۡدَارٍ﴾ [الرعد: ٨].

واتە: هەر شتێك لای خوای گەورە بە ئەندازەیە، هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَٱلۡأَرۡضَ مَدَدۡنَٰهَا وَأَلۡقَيۡنَا فِيهَا رَوَٰسِيَ وَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا مِن كُلِّ شَيۡءٍ مَّوۡزُونٖ ١٩﴾ [الحجر: ١٩]

واتە:- ئێمە لە نێو زەوی دا کێوە بەرزەکانمان چەقاندووە کە چەشنی مێخ بۆ ڕاگرتنی زەوی لە هەرشتێك بە کێشان و گونجاندن لەگەڵ حیکمەت و دانایی دا گژوگیا و ڕووەکمان تیادا ڕواندووە.

ئەگەر بارستایی زەوی بە ئەندازەی چەند پێیەکی تر ئەستوور تڕ بوایە لەوەی کە ئێستا هەیە، هەرچی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن و ئۆکسجین هەیە هەمووی هەڵدەمژی، ئەوکاتە ژیان بە حاڵ و ئاستەم دەبوو.

خۆ ئەگەر زەوی لە قەبارەی خۆر دا بوایە لەگەڵ ئەو چڕیەی کە هەیەتی ئەوکات هێزی موگناتیسی زەوی بۆ ڕاکێشانی ئەو تەنانەی کە لە سەریەتی چەندان و دوو چەندان دەبوو، هەروەها بەرزی ئەتمۆسفۆڕی زەوی چوار میل دەهاتە خوارێ ئەو کات بە هەڵم بوونی ئاو بەحاڵ دەبوو، هەروەك پاڵەپەستۆ و گوشاری هەوا بەرز دەبووەوە بۆ زیاتر لە (١٥٠) کیلۆ گرام لەسەر سانتیمێکی چوارگۆشە، کێشی ئەو زیندەوەرانەی کە ئێستا ڕەتڵێکە دەگەیشتە (١٥٠) ڕەتڵ و قەبارەی مرۆڤ کەمی دەکرد تا دەگەیشتە قەبارەی مشکێك یان سمۆرەیەك، ئەو کاتە ژیانی بە کۆمەڵی ئەم مەخلوق و درووست کراوانە ئاستەم دەبوو.

خۆ ئەگەر ئەم بەڵگانە و نیشانانەی کە پێکهاتنی جیهانی ماددین بە هەموو ئەو کەرستانەی کە تێیدایە لە یاسا و سیستەم و فراماسیون و پەیوەندی نێوان کەرستەکان لە ڕێگەی ڕێکەوتەوە ڕەت دەکاتەوە، ئەو ڕێك و پێکی ژیان و ماددەی زیندو و هەروەها دروست بوونی لە ڕێگەی ڕێکەوتەوە زۆر دوور ترە لەم گریمانەی کە بە مەعریفە و زانست ڕوونکراوەتەوە.

لەم بارەیەوە یەکێك لە زانایان و پسپۆڕەکان بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم ڕاستییە نووسیویەتی و دەڵێت: پرۆتینەکان لە کەرستە ئاوێتە سەرەکییەکانن لە تەواوی شانەی زیندەوەران دا، کە لە پێنج توخم پێکدێت و بریتیین لە: کاربۆن و هایترۆجین و نایترۆجین و ئۆکسجین و گۆگرد.



ژمارەی گەردیلەکان لە یەك بەشی بچوکی پڕۆتین دا دەگاتە (٤٠) هەزار گەردیلە.

بۆ ئەم مەبەستە زانای ماتماتیکی سویسری (چارلیوچین جای) هەڵسا بە ژماردنی ئەو فاکتۆرانە، بۆی دەرکەوت کە دەرفەت لە ڕێگەی ڕێکەوتەوە ناڕەخسێت بۆ درووست بوونی تەنها بەشێکی بچووکی پڕۆتین لەوانەیە بە ڕێژەی (١) تا (١٠١٤٠)نەبێت واتە بە ڕێژەی (١تا١٠) کە (١٤٠) لە خۆی درابێتەوە ئەو ژمارەیە کە بە وشە نە قسەی لەسەر دەکرێت و نە لە هاوکێشەش دا بەکار دەهێندرێت وە دەرنابڕێت ئەوجا چەندایەتی ئەو ماددەیە کە پێوسیتە بۆ ڕوودان و پەیدابوونی ئەم هاوکێشەیە لە ڕێگەی ڕێکەوتەوە تەنها یەك گەردیلەی بچووك بەهەم بهێنێت، دەبێت زیاتر بێت لەوەی کە هەموو ئەم بوونەوەرە گرتویەتیە خۆی بە ملیۆنەها، هەروەها درووست بوونی گەردیلەیەك بەو شێوەیە لەسەر ڕووی زەوی لە ڕێگەی ڕێکەوتەوە بە تەنها بلیۆنەها ساڵی پێویستە کە زانای سویسری ئەندازەی ئەوەی بەساڵ داناوە لێکدانی ژمارە (١٠) لەگەڵ (٢٤٣) جار لە خۆی واتا (١٠٢٤٣) ساڵ.

ئێمە دەزانین کە مرۆڤ دارای چ ئاڵۆزی و وردەکارییەکە لە چالاکی ئەقڵی و دەزگای دەماری دا، کە ئەم ئاڵۆزی و وردەکارییە مرۆڤی شایستەی ڕێکخستنی هەست و بیرکردنەوە و دەرك و هەڵسوکەوتەکان کردووە و دەتوانێت ئەم شایستەیە ڕێکبخات.

هەروەك بوونی دەزگای دەماری و پلەی دەرەکی ئاژەڵ دەزانین، بەڵام مرۆڤ نەیدەزانی کە ڕووەکیش دارای دەزگای مەرکەزی ئەوتۆیە کە چالاکییەکانی ڕێکدەخات بەو جۆرەی کە دەزگای دەماری چالاکییەکانی

لەشی مرۆڤ و ئاژەڵ ڕێكی دەخات ئەمەش لەلایەن زانایەكەوە دۆزراوەتەوە.

زانای سۆڤیەتی (جوبار) پاش ئەوەی كە بیست ساڵی بردە سەر لە لێكۆڵینەوەی یەكلا كردنی ڕووەك دا ئاشكاری كرد و دڵنیابوو كە بوونی دەزگایەكی مەركەزی وەها كە تەواوی ئەركە سەرەكییەكانی ڕووەك ڕێكدەخات كە ئەویش لە مرۆڤ و ئاژەڵ دا جیاوازی نییە، ئەو دەزگایە لە ڕێگەی چەندین تەوژمی كارەباییەوە كاردەكەن وە بەڕێوەی دەبەن هەست و بەڵگە زانیارییەكان لە بەشێكەوە بۆ بەشێكی تری ڕووەكەكە دەگوازرێنەوە، خێرایی ئەم تەوژمانە دەگاتە (١٩)م لە كاتژمێرێك دا بەم جۆرە ئەم بەڵگە زانستیانە وا دەردەخەن و دۆزیانەتەوە لە تاقیگەوە بە ئێمەیان ڕاگەیاندووە و باوڕیان هێناوە بە بوونی حیكمەت و نەخشەدانەرێك و ڕێكخستن و ڕەتكردنەوەی هەڕەمەكی (ئانارشیستی) ڕێكەوت لە هەر گەردیلە و شانەیەك، لە گەردیلە و شانەكانی ئەم جیهانە سەیر و سەرسوڕهێنەرە دا ڕێكی سیستەم و كارسازی ڕێكخراوەیەتی ئەم جیهانە دەكەینە بەڵگە لەسەر بوونی خالق و دروستكارێكی ڕێكخەری هوودەزان و دانا (الله).

من بەردەوام بووم لە قسەكانم لەگەڵ كاك بەهرۆز_دا لە ماڵی كاك عەبدوڵڵا هەموو گوێیان گرتبوو، زوو زوو كاك عەبە ئەیووت چاك منتان خەلەتاند.

بەردەوام بووم لەباسەكەم و عەرزی مەجلیسەكەم دەكرد.

بەڵگەی دووەم لەسەر بوونی خالق و دروستكەرێكی مەزن:-



سازێنەری نەخشەکێشی ئەم بوونەوەرە مەحاڵە شتێکی ماددیی بێت.

ئیسحاق نیوتن ئەوەی دەرك پێ کربوو کە سیستەمی بوونەوەر بەرەو ڕۆچون دەڕوات، سەرنجام لە قۆناغێك نزیك دەبێتەوە کە پلەی گەرمای هەموو پێکهێنەرەکانی تێدا یەکسان دەبێت لەمەوە گەیشتە ئەوەی کە ئەم بوونەوەرە دەبێت سەرەتایەکی هەبێت، هەروەك پێویستە بەگوێرەی نەخشەیەکی دیاری کراو سیستەمێکی وێنەکێشراوی داڕێژراو هەبێت، کە لێکۆڵەرەوانی ئاو و هەوا بە تەواوی ئەوەیان سەلماندووە.

سییەم: بەڵگەی پێچون و لەوانەیی (ئیمکان).

بەڵگەی ئیمکان ئەو بەڵگە ئەقڵییەیە کە زانایانی ئایدیای ئیسلامی پەیڕەویان کردووە بۆ بەڵگە هێنانەوە لەسەر پێویستی جیهان بە خالق و دروستکەرێك کە ناکەوێتە ژێر یاساکانی مومکینەوە.

لەم بوارە دا زانایانی ئیسلامی بوونەوەریان بەو جۆرەی کە عەقل دەرکی دەکات کردووە بە سێ بەشەوە:-

یەکەم: بوونی مەحاڵ (نەبوو، نەکراو).

دووەم: بوونی مومکین (جیهان).

سێیەم: بوونی واجب (الله).

ئەم دابەشکردنە لەسەر ئەو بناغەیە دادەمەزرێت کە هەموو ئەو شتانەی ڕەنگە ئێمە بیری لێ نەکەینەوە یان بە بۆچوون بۆی بچین خۆیان بە گوێرەی بەدیهاتنی بوونیان بەم شێوەیەی خوارەوە:




یەکەم (بوونی مەحاڵ): بوونی مەحاڵ بریتییە لە هەرشتێك کە بۆی دەچین و دێت بە خەیاڵمان دا مەحاڵە بوونی دەرەکی هەبێت، چەشنی کۆبوونەوەی دووشتی دژ بەیەك: وەك بوونی شتێك و نەبوونی لەیەك کاتدا، چونکە وەها شتێك مەحاڵە، هەروەها وەك بوونی شتێك بەبێ فەراهەم هاتنی هۆکاری بوونی، چەشنی بوونی دەنگ بەبێ خاوەن دەنگ، جووڵە بەبێ جوڵینە...هتد.

_دووم (بوون مومکین): بریتییە لە هەرشتێك کە ڕێژەی بوون و نەبوونی یەکسان بێت، جا نە ئەوەی لە بوون نزیك تربێت تا لە نەبوون، نە ئەوەیە لە نەبوون نزیك تربێت تا لە بوون، جا هەروەك قابیلی بەدیهاتن و بوونە، بەو شێوەیە قابیل بە نەبوونە، هەروەها ڕەنگە گیر بێت و ڕەنگە گیر نەبێت، بەڵکو بوون و نەبوونەکەی پێویستی بە هۆکارێك هەیە کەلایەنی بوون و نەبوونی شتەکە تا یەکلایی بکات، تەواوی ئەوەش کە هاتۆتە دی و ئەوەشی کە دێتەدی لە جیهاندا دەکەوێتە بازنە و جوغزی ئیمکانەوە.

سەبارەت بە تێکڕای جیهان حاڵەتێکە هەر بەو جۆرەیە، چونکە جیهان بریتییە لە کۆمەڵێك ڕوودا و هۆکار و ئەنجام کە بەدوای یەك دا یەکیان لە یەکێکی ترەوە هاتوونەتە دی، کەوابوو هەرشتێك لەم بوونەوەر و گەردوونە دا هۆکاری شتێکی ترە، ئەنجامی هۆکارەکان لەیەك کات دا، هەموو جیهان هەر بەم جۆرە لە وزە و بەشەکانی ئەتۆم و گەردیلە و تا ئەستێرەکان.

تەواوی بوونی ئەم جیهانە بە قۆناغی ئیمکان بوون و نەبوون دا تێپەڕیوە، وەك چۆن کتێب و کورسی و وێنەکە بە نمونەکەی ئیمە دا بەم قۆناغە دا تێپەڕین.



هەڵبەت سەرجەمی تاکەکانی جیهانیش بەم قۆناغە دا تێپەڕیون و پاشان وردە وردە شت لە دوای شت هاتوونەتە دی، هەندێکیان لە هەندێکیانەوە پەیدابوون و هاتونەتە گۆڕێ تا ئەم شێوە تەواو کاملەی لێ پەیدا بووە، کە خۆی بریتییە لە کۆمەڵێك شتی مومکین و دەشێ و ناشێ، جا هەروەك ئاماژەمان بۆکرد مومکین لە قۆناغی ئیمکان دەرناچێت بۆ قۆناغی هاتنە دی، مەگەر لە پاش پەیدا بوون و فەراهەم هاتنی هۆکارەکە نەبێت، دەنا هەروا لە قۆناغی ئیمکاندا دەمێنێتەوە و هەرگیز بوونی نایەتە دی.

کەواتە مومکین و فەلسەفەکەی چەندین تایبەتمەندی و سیفەتی خۆی هەیە کە بریتییە لە:

1 - یەکسانی ڕێژەی بوون و نەبوون: ئەگەر هۆکارەکەی پەیدابوو ئەوا ئەویش پەیدادەبێت، ئەگەر هۆکارەکەی پەیدا نەبوو ئەوا ئەویش لە ڕووی بوون و نەبوونەوە بەستراوە بە شتێکی ترەوە.

2 - دە چوون لە ئیمکان بۆ بوون: پیویستی بە سەبەب و هۆکارێك هەیە، ئەو هۆکارەش لە نێو چوارچێوەی سروشتی دایە، خۆی بریتییە لە کۆمەڵێك هۆکاری سروشتی وەك ئەوەی لە تەواوی بوونەوەر دا هەیە لە مرۆڤ و ئاژەڵ و ڕووەک و ڕوودانی کردەوەکانی مرۆڤایەتی و...هتد، چونکە جیهان لە ناوەوەی بنیاد و بیناسازی خۆی دا کۆمەڵێك لەو هۆکار و ئەنجامە مومکینانە پێویستیان بە سەبەب و هۆکارێکی زۆری سروشتی هەیە.

لەو حاڵەتە دا واپیویست دەکات کە ئەم زنجیرەیە تا بێ بڕانەوە بەردەوامی هەبێت کە ئەمەش مەحاڵە، لەبەر ئەوەی کە عەقل بەڕونی درك بە بێهودەیی زنجیرەیی دەکات، کەوا بوو هەردەبێت هۆکارێکی

یەکەم لە ئارادا بێت، کە خۆی هۆکارە لە پەیداکردن و هێنانە کایەی تەواوی مومکینەکان دا، خۆی نامومکینە، واتە بوونەکەی زاتییە و نەبەستراوە بەشتێکی ترەوە، ئەوەش واجب بوونی واجبە پێویست دەکات.

- سێیەم (بوونی واجب): کە کۆتایی وڵامەکانە، چونکە وڵام دانەوەی پرسیاری ئەو کەسەیە کە دەپرسێت لە هۆی تەڕبوونی جلوبەرگی کەسێکی تر و پێی دەڵێت: ئەم تەڕاییە وا بە جلەکانتەوە لە کوێوە هاتووە؟ ئەویش لە وڵام دا پێی دەڵێت: لەسەر فەرشێکی تەڕ دانیشتبووم تا تەڕاییەکەی گەیشت بە جلەکانم، دیسان پرسیارێکی تر لە پرسیارەکان دا درووست دەبێت دەڵێت: ئەی فەرشەکە لە کوێوە تەڕایی پێ گەیشتبوو؟ پرسیار لێکراویش لە وڵام دا پێی دەڵێت: پەرداخێك ئاو ڕژایە سەر فەرشەکە لەبەر ئەوە تەڕبوو، ئیتر پرسیار کەرەکە لە پرسیارکردن ڕادەوەستێت و هیچی تر ناڵێت چونکە ناپرسێت: ئەی تەڕاییەکە لەکویوە گەیشتبووە ئاوەکە؟

- چونکە ئاو سەرچاوەی تەڕییە، کۆتایی وڵامەکەشە (واجب الوجود) واتا (بوونی پێویست کە خوای پاك و بێگەردە) هەر بەم جۆرەیە کە کۆتایی وڵامەکە وەردەگرێت هۆکارەکان هەر لەلای ئەوەوە کۆتاییان پێ دێت.

﴿هُوَ ٱلْأَوَّلُ وَٱلْآخِرُ وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلْبَاطِنُ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ [الحديد: ٣]

واتە: هەر ئەوە سەرەتایە و کۆتاییە و دیارە و نادیارە و هەر ئەوە کە ئاگاداری هەموو شتێکە و ئاگایی و زانایی بەسەر هەموو شتێك دا هەیە.

بەم جۆرە دەگەینە دۆزینەوەی دەرککردن کۆتایی فەلسەفە لێرە دا دێت یاخود ئا لێرەدا فەلسەفە سەردەبڕدرێت هەموو هاوکێشەی فەلسەفەی لێرەوە دەبێت خۆی بخاتە ناو تابوتی مەرگ، چونکە کە دەرککردنی مرۆڤ بە دەرککردنی بوونی واجب وەك هۆکارێك بۆ تەفسیر

کردن و لێکدانەوەی کەرەسە مومکینەکان، هەروەك زانیمان بەشی ئەقل و هۆشی دەرك کەرەکانیش دان بە بوونی ئەم پیویستیەدا دەنێن.

من ئالێرە دا فەلسەفە ئەتك ئەکەم و کۆتایی بە گەڕان بە دوای بوون دا دەهێنم و ڕوو دەکەمە تاکە خوایەك کە درووست کەری هەموو ئەرز و ئاسمانەکانە.

ئەم هۆکارەش بە نیسبەت تەفسیر کردنی جیهانەوە ئەو کەرەسەیەیە کە ئێمە زاراوەی (بوونی پێویست)ی لێدەنێین، ئەو بوونی پیویستە خوای پاك و بێگەردە.

کەوابوو دەرکی سێیەم هەموو قۆناغەکان دەبڕێت و دەچێتە قۆناغی بوونی پێویست کە بوونی پەروەردگاری پەروەردگارە کەواتە لە ڕووی فەلسەفییەوە دوو بەشمان لە هاوکێشەکە وەرگرت:

یەکەم: بوونی مەحاڵ.

دووەم: بوونی مومکین.

لێرەدا وەك لەسەرەوە ئاماژەم پێ کرد فەلسەفە ئەژنۆی دەشکێت لە سێیەم دا بوونی واجب خۆی فەرز دەکا و بە خەڵکی ڕادەگەیەنێت کە زۆر خەڵکێکی کەم هەن کە نەگەشتوونەتە بوونی واجب ئەوانیش کەسانێکی ناوازە و دەرون نەخۆشن.

بەم جۆرە دێمە کۆتایی ئەنجامێکی ڕاگیرانەی ئەقلی، بریتییە لەوەی کە جیهان پەیدابوێکی بوون مومکینە، پیویستی بە خالق و دروست کارێك هەیە ئەویش خوای بوونە کە پێویستە بەم پێیە بەڵگە زانستی و ئەقڵییەکان بریتی بوون لە بەڵگەی ڕێکی سیستەم، بەڵگەی بزواوتن لە خۆ نەبزواوتن، بەڵگەی ئیمکان، ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێت کە ئەم جیهانە پێویستی بە خاڵقێك و داهێنەرێك هەیە لە هەموو گرنگتر ئەوەیە کە ئەو پەروەردگارە دوورە لە سیفاتی ئەم جیهانەوە بەم سیفەتانە ناناسرێت

ئەویش خوای پاك و بێگەردە ئەم بوونە لەوەوە دەرچووە هیچ شتێك لەو دەرناچێت، ئەو تاك و تەنهایە بێ نیازە دەوڵەمەندە لە کەس نابێت و لە کەسیش نەبووە، ئەو زیندووکەرەوە و مرێنەریشە وە ئاگادارە بەسەر هەمووانەوە.

پاش ئەوەی هەموو سەرچاوەکانم پێ وت، مەجلیس هەموو بێدەنگ بوون.

شەو بەسەر داهات من و کاك مەلا محەممەد وتمان دەگەڕێینەوە بۆ هاڵە، بەڵام وتم باسەکەمان تەواو نەکردووە یان تۆ وەرە بۆ لامان یان من دێم بۆلات.

بەهرۆز: باشە بەپەلە ڕۆشت...

ئێمەش گەڕاینەوە بۆ هاڵە و کاك عەبدوڵلا_مان لای مەهنازخان بەجێهێشت.

بەرەو هالە کەوتینە ڕێ.

بەڕێگاوە بوون لەپڕ تەلەفۆن کرا...

کاك بەهرۆز: فریاکەون، کاك عەبدوڵلا کۆچی دوایی کرد!

## چیرۆکی شانزەیەم
## من و ئەفسانە

زۆرم بەلاوە سەیر بوو ترسام شەڕ ڕوویدابێت لە نێوانیاندا، تەلەفۆنم کردەوە بۆ کاك بەهرۆز گوێم لە دەنگی گریان و قسە و باسی ئەڵمانی بوو.

وتم: چیە و چی ڕوویداوە؟

بەهرۆز: پۆلیسی لێیە لەگەڵ ئەمبولانس وەرە دوایی قسەدەکەین.

کە وتی پۆلیسی لێیە من پێم خۆش بوو، چونکە باشترە پۆلیس پێش ڕۆشتنی ئێمە بگاتە ئەوێ، بە هۆکاری ئەوەی ئێمە ئاگامان لە ڕووداوەکە نییە و نابینە شاهید تێیدا.

گەشتینەوە ماڵی مەهناز خان هەموو ئەم باس و خواستە و مردنی کاك عەبدوڵلا چەند سەعاتێکی کەمی پێچوو کە لە دوو سەعات و چەند دەقیقەیەك تێپەڕی نەدەکرد، چوینە لای مەهنازخان کچێکم بینی جلێکی زۆر عەجیبی لەبەردا بوو چاوی ڕەش قژی ڕەش لێوی ڕەش لە شەیتان و شتی وا دەچوو فرمێسك بە چاوی دا هاتبووە خوارەوەلەسەر دەم و چاوی جۆگەی ڕەشی دروست کردبوو، قاچی ڕووت شتێکی لە پێ دابوو لە سفرە دەچوو هەموو ڕانی بەدەرەوە بوو، هەموو گیانی ڕەش بوو، ئیتر هەستم کرد ئەمە لە شەیتان پەرستەکانە، لە ئەوروپا پێیان دەڵێن (ساتانیست) من وامزانی ئەڵمانییە، چونکە هیچی نەووت.

مەلا موحەممەد: دەڕۆم بزانم کفن پەیدا ناکەم چوو بۆ مزگەوتی تورکەکان لە هانۆڤەر و کفنی هێنا و منیش لەوێ ئەو کاتەی کە پۆلیس

لەگەڵ ئەو خەڵکەی کە بە ئەمبولانس هاتبوون، هەر بێدەنگ بووم تەنها چوومە لای مەهناز خان وتم: چی بووە؟

لەبەر گریان وڵامی نەدامەوە، کاك بەهرۆز_یش بە ئەڵمانی قسەی لەگەڵ پۆلیس و خەڵکی تردا دەکرد، دیاربوو بڕیاریان دابوو کە دەبێت کاك عەبدوڵلا بەرنە خەستەخانە و فەحسی بۆ بکەن و هۆکاری مردنەکەی بزانن دوای ئەوە دەتوانین کفن و دفنی بکەین و بە خاکی بسپێرین، من ئەو مەسافەیە زیاتر خەریکی قورئان خوێندن بووم بەسەریەوە، تەنها چوار ڕۆژ بوو کاك عەبدوڵلام دەناسی بەڕاستی خۆشەویستی چووە ناو دڵم هەستم کرد پیاوێکی زۆر سادە و بەڕێزە ئەو کاتەی کە دەستیاندایە و خستیانە ناو ئەمبولانسەکە ئیتر دەستم کرد بە گریان، زیاتر بۆخۆم دەگریام نەك بۆ ئەو، ڕاستە خۆشەویستی لە دڵم دا هەبوو، بەڵام بەڕاستی مردن سامێکی زۆر گەورەی هەیە، بەڵام ئێمە زۆر سەرکەشین زۆر بە دەگمەن بیری مردن دەکەین.

وتمان دەچین لەگەڵ تەرمەکە دا دوای فەحس دەیهێنینەوە، کەچی کاك بەهرۆز وتی: کاك ماکوان ئەوە بەلای کەمەوە دوو ڕۆژی پێدەچیت و تەرمەکەی لە سەلاجە دا دادەنێن (منیش بێدەنگ بووم)، چونکە من خاوەنی ئەو باس و خواستە نابم لەبەر وەی من بۆخۆم میوانم شارەزاش نیم و پاشان ئەوانە هەموو خزم و کەسوکاری یەکترن.

وتمان مادام وایە ئێمە دەچینەوە بۆ هالە و دوایی دێینەوە، بەڵام وتم من پێناچێت بگەڕێمەوە، چونکە منیش دوو بەیانی تەیارەکەم دەگەڕێتەوە بۆ نەرویج، من خواحافیزیتان لێ دەکەم و بۆخۆتان خۆشبن کاك بەهرۆز ئاگات لە مەهنازخان بێت ئافرەتێکی بەڕێزە، تکا دەکەم بڕۆ پێی بڵێ من داوای ئیزنی لێدەکەم.

کاك بەهرۆز زۆر بەئەدەبەوە خۆشحاڵی دەربڕی کە بمێنمەوە.

وتم: بەخوا ئیلتیزامم هەیە و ئیش و کارم بەجێ هێشتووە.

مەهناز خان هات بۆلام و بەدەم گریانەوە سەری خستە سەرشانم و بە کوڵ گریا و وتی: ماکوان گیان مەڕۆ توخوا تۆ و کاک مەلا محەممەد کفن و دفنی بکەن.

وتم: من لە خزمەت دام بەس ماڵ و منداڵم تەنهان.

مەهنازخان وتی: خۆم تەلەفۆنیان بۆ دەکەم.

منیش زۆر لەسەری نەڕۆیشتم تەلەفۆنم کرد بۆ خێزانم کە بلیتی تەیارەکەم بۆ بگۆڕێت، بە مەهناز خاتوونم وت: من لە خزمەت دام، لە خوارەوەی شوقەکەیان لەگەڵ مەلا محەممەد هاتینە خوارەوە هەندێك کەسی لێبوون من نەمدەناسین بێجگە لە خێزانی کاك بەهرۆز و منداڵەکانی و دوو سێ کەسی تر.

لە پڕ شەڕ دەستی پێکرد لە دەرگای شوقەکە دا گوێم لە دەنگی مەهناز خان بوو، قژی ئەو ئافرەتەی گرتبوو کە هەموو جل وبەرگ و قژ و گیانی خۆی ڕەش کردبوو ڕایدەکێشا و دەیکردە دەرەوەی شوقەکە.

ئەیوت: ئاخر کچم بەخێو کرد سەڵیتە دەرچێت، من نەمزای سەڵیتە چییە تا ئەوکاتە واتا (سۆزانی).

بە پەلە ڕامکرد کاك بەهرۆز دەستی ئەو کچەی گرتبوو ئەگریا چۆن گریانێك.

کاك بەهرۆز ئەیووت بەو کچە (ئەفسانە) بەقسەی بکە و بڕۆ.

ئەویش بە کوردی قسەی دەکرد، ئەیووت بۆ کوێ بچم ئاخر جێگام نییە.

منیش ڕامکرد بۆ لای مەهناز خان.

وتم: چییە؟

مەهناز خان: ئەوە نابێت لە ماڵەکەم دا بێت.



وتم: ئەوە کێیە؟

وتی: ئەوە کچم بوو، بەڵام لە ئێستاوە کچم نییە.

کاك بەهرۆز دەیووت بڕۆ!ئەویش بەگریانێکی زۆر سەیر دەگریا دەیووت جێگام نییە بۆ کوێ بچم؟!.

وتم: کە مادام جێگای نییە بۆ کوێ بڕوات ئەو ئافرەتە.

وا هەستم کرد لە ئاهەنگێك شتێك بووە گەڕاوەتەوە..لەسەر جل و بەرگەکەی لێی تووڕەن.

بە مەهناز خانم وت: ئاخر خوا عەفوت بکات بۆ کوێ بڕوات ئەو بەستەزمانە، هەر هیچ نەبێت با خۆی بگۆڕێت هەموو گیانی ڕوتە بەم شەوە باوکی مردووە ئەوەندەی تر با لەسەری سەخت نەبێت، بیبەخشە بەمن.

مەهناز خان: لەبەر خاتری تۆ با بێتە سەرەوە.

چووم بۆ لای وتم: خوشکی من بڕۆ دایکت دەڵێ بابێتە سەرەوە.

وامزانی داڵیت باشە ماڵت ئاوابێت، وەڵلا وتی: (قانکەشوت).

منیش وتم خوا موبارەکی کات، کاك بەهرۆز_م بانگکرد و وتم: کاکە ئەوە چییە ئەو ئافرەتە؟

وتی: ئەمە کچی مەهناز خانە ناوی ئەفسانە_یە، هەمیشە لەگەڵ کاك عەبدوڵلا شەڕیان بووە ئەمشەو هاتۆتەوە دیسانەوە شەڕیان بووە، هۆکاری ئەو شەڕە بوو کاك عەبدوڵلا توڕە بووە و دەڵێن جەڵدەی لێداوە، بەڵام ئەم کچە کچی پیاوێکی ترە کچی کاك عەبدوڵلا نییە.

وتم: کاك بەهرۆز ئەم سەر و وەزعەی بۆ وایە؟

کاك بەهرۆز وتی: کاك ماکوان ئەم کچە لە داخی کاك عەبدوڵلا وای کردووە، ئەوە بۆ ماوەی چەندە هەر وا بوون، باسەکەیان دوور و درێژە.



کاك بەهرۆز کەوتە باسکردنی ئەفسانە بۆم، باسی ئەوەی کرد کە گوایە هەمیشە جەنگ و هەرایان بووە لەگەڵ کاك عەبدوڵڵا_دا پرسیاری ئەوەم کرد کە هۆکارەکەی چی بووە؟

وتی: زیاتر کێشەی خانەوادەگی بووە، منیش زۆر لەسەری نەڕۆشتم پرسیارم لێنەکرد، گەڕاینەوە دوای ئەوەی تەرمەکەی کاك عەبدوڵڵایان بەرەو خەستەخانە برد، ئێمەش کەمێكماینەوە دوای ئەوە هەڵساین و ئیتر بەرەو هاڵە ڕۆشتینەوە.

بۆ بەیانی تەلەفۆنمان کردەوە بۆ کاك بەهرۆز و مەهنازخان وتمان تەرمەکەیان داونەتەوە؟ وتیان نا پێدەچێت سبەینێ وەریبگرینەوە.

چاوەڕێمان کرد تەلەفۆن کرا بۆ کاك مەلا محەممەد وتی: با بڕۆین تا دەگەینەوە ئەوێ تەرمەکە وەردەگرنەوە.

گەیشتین و تەرمەکەمان وەرگرتەوە من و کاك مەلا محەممەد شۆردمان و کفنمان کرد و کردمانە سندوق تەسلیمی کۆمپانیای تورکەکانمان کرد کە لە مزگەوت بمێنێتەوە تا گۆڕی بۆ هەڵدەکەنین.

خزمانی ئەوان هاتبوون زۆر خەڵکی لێبوو، هەر کەسێکم ئەبینی لەو مزگەوتە من نەمدەناسی کۆمەڵێك ڕەفیقی من و مەلا محەممەد نەبێت هاتبوون هەموومان نەدەگەیشتینە دە کەس، بەڵام ئەوان زیاد لە چەند خانەوادەیەك بوون، خەڵکی کوردستانی ڕۆژهەڵات زۆر هاتبوون، ئاگام لێبوو ئەوەی کە منی دەناسی مۆڕەی دەکرد و چپەیان بوو لە نیوان خۆیان دا، تەنها یەکێکیان نەبێت ناوی کاك سەڵاح بوو خەڵکی مەهابات بوو یەکێك بوو لە بەرپرسەکانی دیموکراتی ئێران، هات بۆ لام وتی: خۆشحاڵم کە ئەدبینم لێرە و زۆر دەمێك بوو حەزم دەکرد بە خزمەتان بگەم.

ئەو کاك سەڵاح_ە پیاوێکی زۆر بەڕێز بوو منیش زۆر مەمنونی بووم خۆشحاڵی زۆرم دەربڕی، لە تەعزێکە لە مزگەوتی تورکەکان ئاگام لێبوو

کرابووه پێکەنین و حلکە و قسەی بێمانا، لە هەموو ناخۆشتر ئەوە بوو یەك دوو برا هاتن فاتیحەیان داخست ئاگام لێبوو پیدەکەنین.

منیش خۆم پی نەگیرا و وتم: ئەمە تەعزێیە کێ ئەیەوێت قسەبکات با بڕواتە دەرەوە ئەوەشی دەیەوێت فاتیحە دابخات بۆ کاك عەبدوڵلا با حورمەتی فاتیحەکە بگرێت،

ئەگەر بڕوای بە مزگەوت و فاتیحە نییە ڕێزیشی ناگرێت، با بڕوات لە دیسکۆیەك یان نادی و باڕێك تەعزیەکەی خۆی دابنێ.

دەنگ نەما کەس قسەی نەدەکرد بەس ئاگام لە هەندێکیان بوو وەك قومبەلە دەیان ویست بەسەر من دا بتەقنەوە، کاك مەلا محەممەد: کاکە تۆ هەرخۆت توڕە کردووە تازە قسەیەکیشمان بۆ بکە.

بیرم لەوە کردەوە کە باسێکی ئیمانی بکەم منیش دەستم کرد بە باسی مردن و وتم: نەتان پرسیوە دوای ئەم ژیانە بۆ کوێ دەچین؟..

ئاخر بەشەر بۆ بیر ناکەیتەوە هەروا بە عەبەسی و بێهودەیی دروستکراوی ناگەڕییتەوە بۆ جێگایەك کە دروست کەرێکت هەبێت.

ئینجا باسی مردنم کرد، کە مردن جۆری هەیە، هەیە دەمرێت بۆ ماوەیەك و پاشان زیندوو دەبێتەوە وەك گژوگیا و هەندێك لە درەخت و دار واتا ژیان و مردنیان دەورییە.

مرۆڤیش بەهەمان شێوە دەگەڕێتەوە و سەرلە نوێ زیندوو دەبێتەوە.

باسی ئەوەم کرد کە مرۆڤ دەمرێت و بە دوو جۆر مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت:

یەکەم: دوای مردنی ئەگەر کەسێکی بێدین و خراپەکار بوو، چۆن ڕەفتاری لەگەڵ دەکرێت، پێغەمبەر (دروودی خوای لێبیت) دەفەرموێت: لەوکاتەی کە گیانی دەکێشن ناڕەحەترین کاتییەتی و ئەوەندە بە ئازارەوە گیانی دەکێشرێت، کوردەواری دەڵێن زوخاو هەڵدەهێنێتەوە.

پاشان دوو فریشتەی ناشرین لەبەر چاوی ئەو کفنێکی ترسناکی بۆگەناوی پڕ لە پشکۆی ئاگری بۆ دەهێنن بۆگەنی ئەو کفنە لە هەرچی کەلاکی تۆپیوی سەر ئەم زەمینە هەیە ناخۆشترە، بەرزی دەکەنەوە بۆ بارەگای مەلەکوتی خوای گەورە بە چ ناوێك پێی ناخۆش بێت بەو ناوەوە بانگی دەکەن، فریشتەکان تەریقی دەکەنەوە باسی خراپە و گەندەڵییەکانی دەکەن.

خوای گەورە دەرگای مەلەکوتی خۆی بۆ ناکاتەوە ئەو فریشتانە لە ئاسمانەوە بەری ئەدەنەوە خوارەوە، لە فەرموودەکە دا هاتووە کە تەنها زریکە و هاواری ئەو مردووە ئاژەڵەکان دەیبیستن ئەوەندە بەسۆی و ئەوەندە قورسە، لەو کاتەدایە خوای گەورە پێی دەڵێت ئەو کەسە لە دۆزەخییەکانە، ئەو حاڵەتەی کە بەسەر ئەو مردووە دادێت ئەوکاتە لەسەر بەردەشۆرە یان ئەو کاتەی کە دەیشۆن، دەموچاوی گرژ دەبێت خەڵکی وادەزانن ئازاری پێگەیشتووە، بەڵام ئەوە بۆ ئەوەی کە پییان وتوە تۆ دۆزەخیت، پەنا دەگرم بە خوا لەو ئاگرە کە مرۆڤ بچێتە ناوی ڕۆژێك نییە و مانگێك نییە و هەزاران ساڵ نییە، بەڵکو هاتنەدەرەوەی نییە.

مردوو تا ئەوکاتەی کە تەواو دەبێت لە شۆردن و کفنی تێوە دەئاڵێنن حەز ناکات ببەنە ناو گۆڕەکەی، چونکە نازانێت دوایی حاڵ و گوزەرانی چۆنە لەناو گۆڕ بۆیە حەز ناکا بە زوویی ببەن هاوار دەکات بۆ خەڵکی ئەو دەیانبینێت، بەڵام خەڵک ئەو نابینن.

تا ئەوکاتەی ئەیخەنە ناو گۆڕەکەی خۆی و ئیتر دایدەپۆشن جارێکی تر ڕۆحی دەچێتەوە لاشەی هەڵدەستێت ڕابکات سەری دەکێشێت بە بەردی ئەلحەدا واتا ئەو بەردەی کە دانراوە یاخود ئەو گڵەیە کە بە سەریەوەیەتی یاخود سندوقەکەی، بەڵام ڕێگە نییە و ئیتر کاتی گەڕانەوەیەتی بۆ لای خودا.

دوو فریشتەی دەموچاو ترسناك دێنەوە لای پێی دەڵێن خوای تۆ کێیە؟ ناتوانێت وڵام بداتەوە، چونکە خوای نەبوو یان هەوەس پەرست بووە یان شەخس پەرست بووە یان حیزب پەرست بووە..

هەروەها دەڵین ئەو کەسەی کە بۆمان ناردی ناوی محەممەد بوو شوێنی کەوتی؟

ئەویش دەڵێت نازانم باسی کێ دەکەن، ئیتر دەرگایەکی بۆ دەکرێتەوە لە ناو گۆڕەکەی دەڵین ئەوە جێگای تۆیە لەم جێگایە دا تا ڕۆژی حەشر یاخود قیامەت، ئەویش شێوەیکە لە شێوەکانی جەهەنەم، کە بە وەیل ناسراوە.

شێوەی دووەم: مرۆڤێکی دیندار و خواناسە کە دەمرێت چی لێدێت پێچەوانەی پیاوە خراپەکەیە، کاتێك کە گیانی دەکێشن وەك ئەوە وایە بۆنی سێوێك بکات.

ئەوەندە بە ئاسانی ڕۆحی دەردەچێت، لەو کاتەدا دوو فریشتە دێنە لای و کفنێکی بۆن خۆشی بۆ دێنن لە بەهەشتەوە، بۆنەکەی لە بۆنی هەرچی بۆنی عەتری سەر زەوی هەیە خۆشترە ناوی (حەنوطە) کە لە بەهەشتەوە بۆنی پێداکراوە، پاشان کفنەکەی تێوە دەئاڵێنن بەرزی دەکەنەوە بۆ بارەگای مەلەکوتی خوای گەورە.

لە ئاسمانەکان دا فریشتەکان بە چ ناوێك پێی خۆش بێت بەو ناوە بانگی دەکەن و باسی بۆن خۆشی دەکەن، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت ناوی ئەوکەسەم بۆ بخەنە لای پیاو چاکان و شەهیدان و ڕاستگۆکان.

باسی چاکەو باشەکانی دەکەن، ئەوکاتەی کە مژدەی بەهەشتی ئەدەنێ لە ئاسمانەوە، کە دێتەوە ئەوکاتەیە کە لەسەر بەردە شۆڕەکەیە و لە خۆشیان دا زەردەخەنە دەگرێت و خەڵکی دەوروپشتی کە دەیشۆن وا

هەست دەکەن ماوە و خوتوکەی دراوە، بەڵام لە ڕاستی دا ئەوە خۆشی موژدەی بەهەشتە بەلاشەکەشیەوە خەڵکی دەیبینێت.

ئینجا ئارەزوو خێرا و زوو بیبەن بۆ قەبر و گۆڕەکەی، کە دەیخەنە ناو گۆڕەکەی ئینجا هەست دەکات مردووە.

دوو فریشتە دێنە لای و بە جوانی و چاکی وەڵامی پرسیارەکان ئەداتەوە دەرگایەکی بۆ دەکرێتەوە لە گۆڕەکەی دا کە باخێکە لە باخێکە لە باخەکانی بەهەشت تا قیامەت لەو جێگایەدا دەمێنێتەوە.

قسەکانم تەواو کرد پرسیاری زۆر کراو منیش ئەوەندەی لە توانامدا بوو وەڵامم دانەوە.

گەڕاینەوە بۆ ماڵی مەهنازخان، زۆرێك لە خەڵکەکە ڕۆژیشتنەوە ئاگام لە کاك بەهرۆز بوو ڕقێکی چوو بووە دڵ کە بەو شێوە قسەم کرد هەستم دەکرد ئەیوست بم بوغزێنێت، بەڵام ڕێگەم نەدا.

ئەوکاتەی کە قسەی دەکرد من یان سەرم دادەخست و ئیهمالم دەکرد یان یەکسەر مەوزوعەکەم پێ دەگۆڕی ئیتر هەستی کرد ئەوەی ئەو دەیکات نەشیاوە منیش زوو ڕەدی ئەدەمەوە، بۆیە زۆر بەردەوام نەبوو لەسەر کار و ڕەفتارەکەی.

ئێوارە نزیك کاتژمێر شەش بوو ماڵەکەیان چۆڵ بوو من و مەلا محەممەد و کاك بەهرۆز و خۆیان بووین لەگەڵ هەندێك لە کەس و کارەکەیان.

چوومە دەرەوە بۆ گەڕانێکی کەم، من سروشتم وایە زۆر لە جێگایەک دا ناتوانم دانیشم حەزم زۆر بە جوڵەیە، چپاندم بە گوێی مەلا محەممەد دا وتم: کاکە با بڕۆین تەواو تاقەتم نەما.

مەلا محەممەد: کاکە هیچ نەبێت با تا سەعات نۆ لێرە بین نانێکمان لەم ماڵە خواردووە.




وتم: ئاخر بۆیە لەگەڵ مەلا نەبیت باشە، چونکە هەمیشە خەیاڵی لای نانە.

کردم بە فشقیات و وتم: مەلا محەممەد ناشێت چاوت بڕیبێتە مەهنازخان ئێتسا بێوەژنە.

مەلا محەممەد: لە خوا بترسە!

وتم: باشە (اللهم اجعلنا من المتقين) من هەڵسام و هاتمە دەرەوە زۆرم نەمابوو لەسەر پلیکانەکانی شوقەکە بێمە خوارەوە، گوێم لە دەنگێك بوو.

وتی: کاك مەڵا ماکوان.؟

لە دڵی خۆم دا وتم مەلام بیستووە بەس مەڵام نەبیستووە، کە ئاوڕم دایەوە تەماشام کرد ئەفسانە_یە کچی مەهنازخان ئەوەی کە لە جەماعەتی شەیتان پەرستەکان بوو هات و وتی: کاك مەڵا چیدەکەیت؟

وتم: وەڵا ئەچم پیاسەیەك ئەکەم.

ئەفسانە: بێم لەگەڵت؟!

وتم: نەوەڵا!!!

ئەفسانە: بۆ!؟

وتم: ئاخر من تەریق دەبمەوە بەو جلانەوە بێمە دەرەوە لەگەڵتا، تۆ خۆت نافەرمویت مەڵا ماکوان، ئاخر مەڵات دیوە بەو شێوە لەگەڵ خەڵك بێتە دەرەوە.

ئەفسانە: چیبکەم؟

وتم: دادە گیان بڕۆ دەرپێیەک بکەرە پێت یان تەنورەیەك، ئینجا کراسێك و ئەو دەموچاوەشت بشۆ و پاشان ئەو تەل و فسفۆرە بکەرەوە لە دەموچاوت لە پاسکیلی جارانی من دەچیت، تۆ بەم هەموو جوانییەوە بۆ وات لە خۆت کردووە؟ تۆ دەزانی زۆر جوانی بەو هەموو ناسکییەتەوە بۆ خۆتت کردووە بە شەیتان.



ئەفسانە: باشە، بێسە...بێسە ئیسا خۆم دەگۆڕم و دێمەوە، هاتمە دەروەی شوقەکە و چاوەڕوانی ئەفسانە_م کرد.

هاتەوە بینیم وابزانم پێنج دەقیقەی پێچوو، تەماشای جلوبەرگەکەیم کرد قەمسەڵەیەکی زلی کەردبووە بەری و ملپێچێکی لە سەریدا شۆڕکردبووەوە لە داهۆڵ دەچوو، تەل و شتەکانی لەخۆی نەکردبووەوە، ئەمجارە زیاتر لە هێستری قاچاخچی دەچوو ئەوەندە گوڵنەی پێوەبوو.

وتم: ئەوە بۆ وا خۆت کردووە بە پەن.

ئەفسانە ئەی تۆ نەتوت خۆت داپۆشە؟

وتم: با وام وت، پێشتر لە تەیری ئاوەڕوت کراو دەچوویت ئێستا لە شێت دەچیت.

ئەگەر نازانیت خۆت بگۆڕی بە دایکت بڵێ بتگۆڕێ، بەڵام بە پێکەنینەوە پێم وت بگەڕێوە خۆت بە جوانی بگۆڕە وەك ئافرەتێکی خاوەن شەخسییەت، چاوەڕێت دەکەم، بەخوا ڕووم نایەت ئاواش بێمە دەرەوە لە مرۆڤێکی ئاسایی ناچیت ئەفسانە، بڕۆ خۆت بگۆڕە تکایە زۆر ئاسایی بە.

ئەفسانە: باشە بەس تۆزێکم پێدەچێت.

وتم: تا نیو سەعاتیتریش بۆ تۆ، منیش دەبێت تەلەفۆن بۆ خێزانم بکەم دەمەوێت بە ئیسراحەت قسەبکەم.

ئەفسانە: باشە.

من قسەم کرد لەگەڵ خێزانم و ئەویش تۆزێکی بۆڵاند بەسەرم دا وتی: ئەوە بۆ نایەیتەوە ژنت هێناوە لە ئەڵمانیا؟ وتی کیلۆنی دەرگای ماڵ دەگۆڕم تا دوو ڕۆژی تر نەیتەوە ئیتر دەستمان کرد بە قسە وابزانم زۆرمان پێچوو، لەپڕ یەکێك لە تەنیشتمەوە وەك جنۆکە پەیدا بوو بەدەنگی بەرز وتی مەڵا ماکوان من تەواو بووم؟

خێزانم: ئەوە دەنگی کێیە؟!

وتم: ئەوە کچێکی شێتە توخوا بانگم دەکات بڕۆم نانەکەم بخۆم، چونکە نەدەکرا بۆی باس بکەم کێیەو چییە ئافرەتیش بە سروشتی خۆی غیرەی هەیە لە دەنگی ئافرەتی تر.

کە تەماشام کرد نەمناسییەوە هەرچی قایش و قورش و تەل و مەل بوو لە خۆی کردبووەوە سەرپۆشێکی سپی جوانی دابوو بەسەریدا.

وتم: ئەوە ئەو هەموو جوانییەت لە کوێوە هێناوە کچێ؟ مەبەستم لەو قسەیە ئەوە بوو بڵێ خوای گەورە پێی بەخشیوم.

ئەفسانە: وەڵا بڵێم چی، خۆم هەر جوانم.

وتم: دەی وەڵلا ناشرینی لە ئومەتی محەممەد ناچیت، ئەوە مجامله بوو بە ئینگلیزی پێم وت بۆئەوەی تێبگات وتم (کۆمپلمێنت بوو) بەس بەخوا لە شەیتانی مێ دەچیت.

لەمەشدا هەر مەبەستم بوو باسی ئایینی لەگەڵ بکەمەوە.

ئەفسانە: ڕاستە من شەیتانم!شەیتان ئەو هێزەیە کە توانای بەمن بەخشیوە.

ئیتر ئەو قسەیە خوا دای بۆ من وتم: ناشێ ئەفسانە تۆ شەیتان پەرست نەبیت ساتانیستەکانی؟

ئەفسانە وتی: ئەرێ!

وتم: ئەرێت باقی نەبێت، توخوای تۆی بەچکە موسڵمان لە خوا ناترسیت بووی بە شەیتان پەرست، ئەی دەزانیت خوا نەفرینی لە شەیتان کردووە ئەی ئەفسانەی شەیتان، بەڵام بە پێکەنینەوە بە ئوسلوبی حیوارەوە.



ئەفسانە: ئاخر شەیتان خراپەکارە با ئێمە چاکەی لەگەڵ بکەین بۆ ئەوەی لە شەڕی بە دووربین!شەیتان پەرستی مەبەست ئەوەیە کە ئێمە خەڵکی دوور بکەین لە شەڕ و شەیتان.

هەستم کرد ئەو من بانگەواز دەکات بۆ فکرەکەی خۆی.

وتم: ئێ ئەفسانە وەڵڵا قسەکانت مەعقولە ئەم فەلسەفەی ساتانیستەکانە چیترت پێیە بۆم باسبکە.

ئەفسانە: مەلا ماکوان بەڕاستیتە یان شۆخی دەکەیت؟

وتم: ئەفسانە نەك شۆخی، بەڵکو قەشمەریشم پێت دێت، بە خوای ئەم ئەرز و ئاسمانە خوشکی من بویتایە دەمکوشتی و لە قەبرسانی موسڵمانانیش نەمدەهێشت بتنێژن، ئەزانیت تۆ چەندە جینایەتکاری؟ تۆ وا دەزانیت من وەك خۆت جاهیلم؟ تۆ دەزانیت دوای چی کەوتویت؟

ئەفسانە: ئەرێ دەزانم بۆچی نازانم.

وتم: وەڵا فرت پیوەی نییە، باشە پرسیارێك تۆ (کراولی) دەناسیت؟..

کەوام وت ڕەنگی زەرد بوو.

ئەفسانە: ئاشناس.

وتم: جا عەیب ناکەیت باسی مرۆڤ دۆستی و شتی وا دەکەیت، تۆ دەزانیت شوێن چی کەوتویت؟

وتی: مەلا ماکوان چۆن ئەوە دەزانی؟

وتم: توخوا مەلایەك ئەگەر مەلا بێت نابێت ئەوانە بزانێت.

وتی: یەعنی هەرچی مەلایە ئەمانە دەناسێت؟

خۆ من دەمزانی هەموو مەلا شتی وا نازانێت، زۆربەی مەلا لە هەندێك کتێب زیاتر هیچی تری لا نییە ناچار وتی: ئەرێ؟

وتم: بەڵی ئەوەش دەزانێت کراول چەندە فاسد بوو خەڵکی بەریتانیا بوو ئەو ئەم فیکرەیە و فەلسەفەی سایانیستەی تەنزیم کردووە ئەو کردوێتە ئایدۆلۆژیا، لەگەڵ ولیام پالتث_ی شاعیر.

ئەفسانە: بۆ مەلا ماکوان تۆ ولیام پالتث_یش دەناسی؟

وتم: بۆ پێت وایە من وەك تۆ بێ ئەقڵم، ئەشزانم کراولی سەرۆکەکەی تۆ کە پیاوێکی زل بوو شوی کرد بە پیاوێکی تر بە ناوی (ئالم پێنکس) کە بەیەکەوە هەرچی کاری خراپە هەبوو دەیان کرد لە ئیتاڵیا لەبەر چاوی خەڵکی لە دوورگەی (سیسلیا) کاری نەشیاو و شازیان دەکرد بە ئاشکرا تا دەرکران و دوای چوو ملی شکاند بۆ سەحرای جەزائیر، لەوێ وتی لەگەڵ شەیتان قسەدەکەم و بیرێکی نوێیان دامەزراند.

هەرسێکیان بەیەکەوە واتا (کراولی و ولیەم و ئالم) بە ناوی خاچی خونچە گوڵ، هەرسێکیان وتیان خوا مانای نییە دەبێت ئێمە شەیتان بپەرستین ئەوەی لاشەمان پێی خۆشە بیکەین، چونکە ئەیان وت خراپەکار و شەرخوازی ئیتر دەست پێ دەکات ئێمە تۆ دەپەرستین شەیتان بۆ ئەوەی بە خلودی بمێنێتەوە، ئەمە بنەما فەلسەفییەکەیان بوو.

ئینجا کراولی لە ناو شوشەی عارەق ئەو کەسانەی ماددەی هۆشبەریان دەخوارد مرد لەسەر شەقامەکانی فەرەنسا لە دوای خۆی نووسیبووی تا دەتوانن مەشروب بخۆن، تا دەتوانن هیرۆین بەکاربهێنن بۆ ئەوەی لە شەیتان نزیك بن.

وتم؛ ها مەلا ئەفسانە تۆ بۆ قسە ناکیت؟

ئەفسانە: جا چی بێژم.

وتم: بۆ ئەوی بزانی من مێژووی هەموویان دەزانم و دەشزانم لە دوای ئەوان کەسێکی تر لە ساتانیستەکان و لە جەماعەتی ئێوە بە ناوی ئەنطوان لیڤی کە جولەکەیە خەڵکی ئیسرائیلە، بەڵام ئیسرائیل دەری کرد، لە



ئەمریکا دەژیا لە ساڵی ١٩٩٩ بە ڕسمی کەنیسەی شەیتانی بۆ کرایەوە، پاشان چەند کتێبێکی نووسیوە لە وانەی کە کراون بە عەرەبی و زمانی فارسی و بە شێکیش کوردی.

یەکەم: کش شەیتان.

دووەم: توقوصاتی شەیتان.

سێیەم: حەشری شەیتان.

چوارەم: یاداشتەکانی شەیتان.

زۆری تر کە بەداخەوە ئێستا لە هەولێر و سلێمانی و کەلار ئەمانە وجودیان هەیە، بەڵام وەك تۆ بێ چاو و ڕوو نین خۆیان ئاشکرا نەکردووە.

ئەزانم کە لە کەناری دەریا و بە کۆمەڵ پیا و ژنتان بەیەکەوە ڕادەبوێرن، منداڵ کە لە دایك دەبێت سەری دەبڕن و بە ئاشکرا دەیخۆن و خوێنی یەکتر دەخۆن و هەرچی شتی خراپە دەیکەن.

بەکارهێنانی مەشروب و جگەرە و مادده هۆشبەرەکان لای ئێوە عیبادەتی گەورەیە کە شەیتان لە خۆتان ڕازی دەکەن، دەزانم کە لە ناو ئەنتەرنێت دا زیاد لە ٧٤٧٥ ماڵپەرتان هەیە و لە لایەن دەزگای مۆسادی ئیسرائیل_یەوە پارە وەردەگرن و خۆم چوومەتە ناو ماڵپەڕەکانتان، کە بەناوی بەندەکانی شەیتان و کەنیسەی شەیتان و...هتد، ئەفسانە بۆ قسە ناکەیت؟ حەز دەکەم گوێم لێت بێت.

ئەفسانە: کا ماکوان؟

وتم: ڕۆڵە ئەوە تۆ زمانت پاك نەبۆتەوە بە مەلا دەڵییت مەڵا و ئێستا لە جیاتی کاك دەڵێیت کا، ئەرێ ڕۆڵە تۆ بۆ نایەیت کۆرسێکی زمان بخوێنیت.

دەستی کرد بە گریانێکی زۆر، چی لە وێوە دەڕۆشت تەماشای منی دەکرد وایان دەزانی لێم داوە.



وتم: ئەرێ دادە ئەوە بۆ دەگری؟ کچێ حەیای منت برد، ئێستا من دوور دەکەومەوە کە تەواو بوویت چڵمەکە و بسڕە و وەرەوە بۆ لام.

من دورکەتمەوە لە ترسنا ئەوم بەجێ هێشت، ئەوەندە گریانەکەی قوڵ بوو.

لە دوورەوە تەماشام کرد وخۆم لێ ون نەکرد، وەڵڵا وردە وردە هاتەوە بۆ لام پێدەکەنی.

لە دوورەوە وتم: ئاقڵ بوویت بووی بە خوا پەرست یان هەر لە جەماعەتی شەیتانی.

ئەفسانە گەڕایەوە بۆ لام کە لێم نزیك بوویەوە، لە دڵی خۆم دا وتم سوپاس بۆ خوا کاریگەریم هەبووە لەسەری، بۆیە دەگریا.

وتم: ئەفسانە چی وای لێکردی بگریت؟

ئەفسانە: ماکوان حەزم لە هێرۆینە نە پارەم پێیەو نە دەستیشم دەکەوێت بۆ ئەوە دەگریم.

من بینیم گیانی دەلەرزێت وامزانی لە ترسی خوایە، کەچی ئەمە موعتادە و وەك خۆیان دەڵێن گەردی بوو.

ئەفسانە وتی: ماکوان توخوا چیت دەوێت ئەتدەمێ، ئەگەڕ ئەتوانی پارەم بدەرێ با هیرۆین بکڕم.

زۆر گوناح بوو دەستی کردەوە بە گریان ئەو کچە جوانە زەلیل ببوو، لەبەردەستما ئامادە بوو بۆ دەرمان لاشەی خۆی بە من بفرۆشێت، چونکە فێر بووە ئەو کارە ئەنجام بدات بۆ بەدەست هێنانی دەرمانەکەی.

وتم: ئاخر ئەفسانە من پارەم پێیە بەس نازانم لە کوێ هەیە، ئەوە پارە جا چۆن دەستت دەکەوێت بەم ئێوارەیە؟!

ئەفسانە: تۆ پارەکەم بدەرێ خۆم دەیکڕم ئێستا.

وتم: باشە چەندت دەوێت؟



وتی: ٦٠ ئێورۆ..

وتم: فەرموو کە پارەکەم دایە یەکسەر بە جێی هێشتم و ڕۆیی، منیش وەك ئەهلی ئەم ئیسلامە و عەشایەر وتم باشە خۆ ئەم ئافرەتە لەگەڵ من دا بووە هیچ نەبێت تا دەیبەمەوە ماڵەوە ئاگام لێی بێت، لە دوورەوە وتم: ئەفسانە مەڕۆ با منیش بێم.

هەر وڵامیشی نەدامەوە، بەڵام من شوێنی کەوتم، زیاد لە نیو سەعات ڕۆشت، دوایی سواری پاس بوو منیش سەرکەوتم چوومە لایەوە.

ئەفسانە: مەڵا ئەوە بۆ هاتی؟

وتم: ئاخر مەڵا پیاوە ئافرەتێك بە تەنها جێناهێڵێت، ١٠ ئێورۆم دایە وتم برۆ بلیت ببڕە با نەگیرێین، بە خوا ١٠ ئێورۆکەشی خستە گیرفانی.

ئەفسانە: نایەوێت لە ئەڵمانیا کەس پارەی پاس نادت.

خۆم چوومە لای شۆفێرەکە وتم: بلیتێکم بدەرێ.

وتی: بۆ کوێ دەچیت؟

وتم: نازانم، بەخوا جنێوێکی پێدام وای زانی پێی ڕادەبوێرم.

دابەزین من لەگەڵ ئەفسانە دا ڕۆیشتم خۆمان کرد بە دیسکۆیەك دا یان بارِ بوو، کۆمەڵێك خەڵک دانیشتبوون چووە لایان پارەکەی دایە و یەکێکیان هەڵسا و چوو بۆی هێنا و بردیانە ژوورێك سبحان الله، منیش لە دوورەوە تەماشای ئەو وەزعەم دەکرد هەستم کرد مرۆڤ لای ئەو ئەرووپیانە چەندە هەرزانە، چەندە دڕندەشن بەرامبەر بە مرۆڤ، ناخۆشترین کات و ساتی ژیانم بوو هیچم بۆ نەدەکرا، ئەو ئەڵمانیانە تێیان دابوو بەقەدەر نیو لۆری دەبوو مۆڕەیان لێ دەکردم و منیش هەر لە مۆڕە زیاتر دەسەڵاتم نەبوو، چونکە تازە ناچارییە ئێمە ناچاری دەرگای ئەم خەڵکەین.

کوڕێکی گەنج هاتە تەنیشتمەوە، وتی: تۆ چی ئەفسانەی؟




وتم: تۆ کوردی؟

وتی: بەڵی، من لەم بارە کار دەکەم.

وتم: ئەوە بردیانە کوێ ئەو کچە بۆ خاتری خوا.

وتی: ئێستا دەیهێننەوە تا دەتوێتەوە.

وتم: برای باش چی دەتوێتەوە؟

وتی: دەرمانەکە لە لاشەی دا.

ئیتر خەریك بوو ئەم دڵەم شەقی دەبرد، خۆم پێ ڕانەگیرا ناچار خۆم کرد بە ژوورەکە دا تەماشام کرد ئەفسانە لەو عەرزە دا ۆاڵ کەوتووە، هەر ئەوەندەم زانی منیش قاچم لە زەوی بڕا سەیری خۆم کرد بەدەست زلێکی ئەڵمانییەوەم هەموو گیانی نەخشونیگار بوو، ئەو هەتیوە لە کەوەنتەرەکەی ماڵی نەنکم دەچوو باپیرم لە لایەکەوە خۆی بۆیاخی کردبوو.

بۆیاخەکەی هەڵی دابوو وابزانم ٤٠ ڕەنگ بوو.

ئەویش شین و سور و مۆر لەسەر دەموچاو و گیانی بوو، وەڵا من لە تاو ئەوەی کە نەمخنکێنێت بە دەستیەوە بووم وەك تەزبیح، هەتا توانیم یەك کەلەم لێدا، باش بوو داینامەوە سەر زەوی، ئەوەندەم زانی لەو دەموچاوانەی ئەو سیان چوارێکم بۆ هەڵسا، منیش ڕامکردە لای ئەو کوڕە کوردە.

وتم: کاکە چەقۆیەکم بدەرێ خێرا با خۆم دەرباز کەم لەم سەگانە.

خوا هەڵناگرێت هاتە دەست لەگەڵم بە ئەڵمانی داییەیەك دا من هیچ تێنەگەیشتم، بە خوا ئیشارەتی کرد بۆ چەقۆیەك لە پشتی خۆیەوە بوو دەستم پێ گەیشت ئەو زلانە وەك بەفر توانەوە، هاوارم کرد بە ئینگلیزی پێم وتن سەرتان دەبڕم، لە فلیمی ئەمریکی فێر ببووم ئەم خێرەی هەبوو فیلمەکە بۆم.



خوا خواشم بوو خۆم دەرچم و ئەو کچە دەرکەم لەم تاریکستانە.

بەم کوڕە کوردەم وت: ئەی ئەو کچە چۆن بهێنمە دەرەوە، ئاگام لێبوو وردە وردە چوونەوە بۆلای کابرا قەڵەوەکەی کەمن کەلەم لێدابوو لوتو دەموچاوی خوێنی پێوە بوو بۆ ئەویان پاك دەکردەوە.

وتم: کاکە هەرچیت کردووە ئەفسان_م بۆ بهێنە دەرەوە، زۆر مەمنونت دەبم.

وتی: کاکە خۆ ئەفسانە ئەمە جێگایەتی، یەکەم جاری نییە دێتە ئێرە.

وتم: ئەزانم بەس بۆ نەگبەتی ئەمڕۆ لەگەڵ من هاتۆتە دەرەوە منیش میوانم دەبێت بیبەمەوە.

وتی: ئاخر بێ هۆشە.

وتم: من دەچمە دەرەوە، تۆ وەك برایەکی باش ئەم کارەم بۆ بکە.

وتی: بێخەم بە.

هاتمە دەرەوە، ئەم بارە ڕێك لە قەبر دەچوو، ترسام دیسانەوە ئەم ئەڵمانیانە هێرشم بۆ بهێنن، ئەگەر چەقۆیەکم پێبوایە ترسم نەبوو، هیچم پێ نەبوو ئەوانیش زیاتر لە ٩٠ بۆ ١١٠ کیلۆ دەبوون، منیش ٦٨ کیلۆ بووم ئەترسام بە تەنها هیچم پێ نییە و ئەوانیش چوار پێنجێکن بەڕاستی لەوە دەترسام کەڕامەتم بشکێنن، بۆیە ناچار هاتمە دەرەوە لە دوورەوە وەستام، خۆم کرد بە جێگایەك دا ناوی لیدڵ بوو، دوو چەقۆی گەورەی مەطبەخم کڕی و وەك ساسۆکی خستمە پشتم و یەکێکی تریشم خستە بەر سکم.

زۆر داخم لە دڵدا بوو وتم: دەگەڕێمەوە بۆ بارەکە، خۆم کرد بە بارەکە دا بەم توڕەییەوە تەماشای ئەو جەماعەتەم کرد هیچیان نەووت، ئەوانیش سەیریان دەکردم و دەنگیان نەبوو و نەجوڵان، کوڕە کوردەکە هات بۆ لام ناوی حەمید بوو خەڵکی کەرکوك بوو.

حەمید: بۆ گەڕایتەوە؟



وتم: وەڵڵای دەمەوێت شەڕ لەگەڵ ئەمانە بکەم.

وتی: ئەو کوژن کوڕە.

وتم: هاتومەتەوە بۆ ئەوەی بکوژرێم زۆر داخم لە دڵدایە، جا بەڕاستی زۆر بێتاقەت بووم، ئەو جەماعەتە ئەڵمانیە ترسان هیچیان نەوت وایان زانی خەڵکم لە دەرەوە داناوە، چونکە حەمید وتبووی ئەم کوڕە کوردە ئێستا دەچێت ڕەفیقەکانی دەهێنێت و دێتەوە بۆ لاتان جا خۆشتان توشی پۆلیس مەکەن.

وتم: حەمید گیان یەك دوو جنێوی ئەڵمانی باشم فێرکە با داخی دڵی خۆمیان پێ برێژم، دوو شتی پێ وتم ڕێك چوومە نزیکیان پێم وتم سەیری هەر چواریانم کرد سەر و تفم تێکردن دەستم لەسەر چەقۆکە بوو ئەترسام فریا نەکەوم بیوەشێنم.

وەڵڵا ئەوان چرکەیان لێوە نەهات، حەمید داینام لەسەر کورسییەك و ساردییەکی بۆ هێنام خواردمەوە، هەر ئەو دوو جنێوەی فێری کردبووم هەر ئەوم دەوتە وە، ئەوانیش هەر حسێبیان بۆ نەکردم.

ئەفسانە هاتە دەرەوە سەر و گوێلاك خوڵاوی سەرپۆش لە مل، زەلیل گێژ.

دەکەوت بەملاولادا چاوی فرمێسکی پێوە بوو زەردەخەنەش لەسەر لێوی بوو، من کە بینیم ئەوەندەی تر شێت بووم، ئەوەی بە دەممدا هات وتم.

سوپاسی حەمیدم کرد و هەردوو چەقۆکەشم دایە بۆ خۆی، ئەفسانەم بردە دەرەوە، پارەشم پێنەما بوو هەمووی لەسەر کارتەکەم بوو، ئەفسانە_ش ئاگای لە خۆی نەبوو پاش کەمێك وتم تەکسی بگرە ناونیشان و ئەدرەسی ماڵی خۆتان بڵێ ماڵت کاول بێت، کە تەماشای سەعاتم کرد ١١ شەوە.



گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە بردمە سەرەوە بۆ لای مەهنازخان.

کاك مەلا محەممەد: خۆ قەرار بوو من و تۆ زوو بڕۆین؟

وتم: توشی ڕوداوێك بووم ئێستا بۆت باس دەکەم.

ئەفسانە_م بردە ژوورێك.

مەهنازخان: چیبووە؟ ماکوان گیان.

وتم: کوڕە مەهنازخان تۆ بەڵات هەیە، کەی ئەوە کچە خەریك بوو توشی شتێکی زۆر گەورەم بکات.

مەهنازخان: ماکوان گیان ئەوە حاڵ و گوزەرانی منە، کە باسەکەم بۆ گێڕایەوە مەلا محەممەد توڕە بوو، دەیوت ئێستا دەچین ئەژدادیان دەسوتێنین.

وتم: برا وازبێنە خوا خوام بوو نەجاتم بێت.

مەلا محەممەد: با بڕۆینەوە بۆ هالا.

وتم: باشە بابڕۆین، من هەڵسام خواحافیزی بکەم کۆتایی بە میواندارییەکە بهێنم بەڕاستی ماندوو بووم لە ئەڵمانیا.

هەڵسام وتم مەهنازخان من دەڕۆم.

مەهناز خان: ماکوان گیان دەبێت تا شەش سەعاتیتر لێرە بیت ئەوە قانونە.

وتم: بۆ؟

مەهناز خان: ئاخر پۆلیسمان ئاگادار کردووە کە تۆ و ئەفسانە چوونەتە دەرەوە، چونکە ئەفسانە لای پۆلیس دۆسیەی هەیە دەبێت بمێنێتەوە تا بەئاگا دێتەوە، چونکە تۆ لەگەڵی دا چویتە دەرەوە ئاگاداری بوویت بۆ ئەوەی هەرچی ڕوودات تۆ شاهیدی لەو حاڵەتە دا، ئەم قسەیەشت بۆیە پێدەڵێم بۆ ئەوەی نەبادا دوایی خوانەخواستە شتێك ڕوودات ئێمە ڕوو زەردی لای تۆ بین.

ئەوەندەی تر بێتاقەت بووم وتم: مەلا محەممەد تۆ بڕۆ بەیانی یەك دەبینینەوە، شەو مامەوە زۆر ئاسایی من لەسەر قەنەفەکەیان خەوتم و بەیانی هەڵسام مەهنازخان نان و چایی بەیانی ئامادە کردبوو، منیش تێر و پڕم خوارد، ئەفسانە_م هەر نەبینی نەشم دەویست ببینم.

خواحافیزیم کرد لە مەهنازخان وتم: من بەیانی دەگەڕێمەوە بۆ نەرویج خواتان لەگەڵ.

هاتمەوە بۆ ماڵی مەلا محەممەد، دوای ئەوە تا شەو پێکەوە بووین پاشان مەلا محەممەد منی گەیاندە فڕۆکەخانەی فڕانکفۆرت و گەڕامەوە بۆ ئۆسلۆ، نەرویج.

لە دوای ١٣ ڕۆژ گەڕامەوە بۆ نەرویج، ژیانی ئاسایی خۆم دەست پێکردەوە.

دوای چەند ڕۆژێك لەگەڵ مەلا محەممەد قسەمان کرد بە تەلەفۆن و باسی ئەو وەزعەمان کردەوە وتم: تەلەفۆنت نەکردووە بۆ مەهنازخان؟

وتی: نەخێر.

وتم: باشە ئەگەر ژمارەکەت لایە بمدەرێ بامن پەیوەندییان پێوە بکەم، ژمارەکەم وەرگرت، دوای ٨ مانگ بۆ ٩ مانگ ڕۆژێك تەماشای ژمارەی ناو مۆبایلەکەی خۆمم دەکرد، ناوەکەی مەهنازخان هاتە بە چاوم، دەستم پێدانا و ڕاستەوخۆ تەلەفۆنم بۆ کرد.

مەهنازخان وڵامی دایەوە وتم ماکوانم هەر حەزم کردووە هەواڵت بزانم.

زۆر قسەمان کرد و هەواڵی خێزانمی پرسی و پاشان منیش هەواڵی ئەفسانەم لێپرسی.

مەهنازخان: ئەوە بۆ سێ مانگ دەچێت ئەفسانە مردووە.

وتم: چۆن بووە مردنەکەی؟



وتی: خۆی کوشت!

وتم: چۆن بوو خۆکوشتنەکەی؟

وتی: پۆلیس پێی وتوین، دەستی کرد بە گریانێکی بە کوڵ و بەردەوام بوو وتی ماکوان گیان بێکەس خۆم لەم وڵاتە، زۆر دەردە دڵی کرد، منیشی خستە گریان زۆر ئازار گەیشتە گیانم وتم ئێستا چی دەکەیت؟

مەهناز خان: توشی فەقەرات بووم لە جێگام، ناتوانم کار بکەم ئێستا لەماڵی خۆمدا نیم لە ساڵماندام.

وتم: واتا ئێستا لە خەستەخانەی؟

وتی: خەستەخانە نییە، بەڵکو شوێنی پەککەوتوانە.

ماکوان گیان بۆ نایەت بۆ لام، وەرە تۆزێك قورئانم بەسرە دا بخوێنە.

وتم: بەخوا بۆم ناکرێت بەڵام پەیمان بێت هەر دەرفەتێکم بۆ دروست بوو سەردانت بکەم.

شەو چوومە پاڵتاك لە ژووری دەنگی ئیسلام دەرسی مامۆستا باوەڕ بوو دوای تەواو بوون بە جوتە خۆمان کرد بە ژووری مەڵبەندی پێشمەرگە دێرینەکان و تۆزێك سەر و دڵی ئەوانمان گرت و هاتینە دەرەوە.

ئەو مەوزەعەم بۆ باسکرد وتی: ماکوان ئەوە بۆ نایەت بۆ لامان بۆ ئەڵمانیا حەز دەکەم لە نزیکەوە بتبینم.

وتم: وەڵڵا دەمێکەیە نەهاتووم، بەڵام هەوڵ ئەدەم بێم.

کاتەکانم ڕێکخستەوە دوای یەك دوو مانگ ڕۆشتمەوە بۆ ئەڵمانیا، دیسان لە فڕانکفۆرت دابەزیم ئەوەندە تامەزرۆ بووم پورزاکەم و ئامۆزاکەم هاتن بە شوێنم دا لە خۆشیان دا جەنتاکەم لە بیر چوو لە ناو پاسەکە کاك فەهمی: ماکوان کوا جانتات پێ نییە؟

وتم: بەرێ وەڵڵا، بەس لە ناو پاسەکە دا جێمان هێشتووە، لەو پاسەی کە لە فڕۆکەخانەوە دێتە ناو فڕانکفۆرت بەجێ ماوە، بە دەستی بەتاڵ بێ

هیچ، بەیەکەوە بەڕێکەوتین بۆ نۆرمبێرگ، دوو شەو زۆر بە خۆشی لای کاك زانا و کاك فەهمی بووم لە نۆرمێرگ.

بلیتم بڕی چوومە هانۆڤەر تا چاوم بکەوێت بەو ئافرەتە بەڕێزە تەلەفۆنم کرد کەسێك بە ئەڵمانی وڵامی دامەوە هیچ تێنەگەیشتم.

چوومە چایەخانەی تورکەکان نزیك مزگەوت بوو، زۆری نەمابوو بۆ نوێژی عەسر لەگەڵ کاك سەلمان بادینییەك بووم بە ڕەفیق و وتم لەو قسانە تێناگەم، بەڵکو بۆم بکەیت بە کوردی، تێمگەیاند ئەوە ژمارەی ئافرەتێکە لە شوێنی پەککەوتوانە دەیناسم دەمەوێت قسەی لەگەڵ بکەم و بڕۆمە لای.

کاك سەلمان: باشە، دەستی کرد بە قسەکردن و دوای داخستنەوە وتی ئەو ئافرەتە چی تۆیە؟

وتم: هەر کوردە و لیرە ناسیومە.

باوەشی پیاکردم و وتی: بۆ خۆت خۆشبی، مردووە عەمری خوای بەجێهێناوە، وایزانی دەگریم و باوکەڕۆ دەکەم.

وتم: خوا عەفوی کات، دەتوانی بلیتێکم بۆ ببڕی بۆ ڤوبەتاڵ؟

چوومە ماڵی مامۆستا باوڕ و دوو شەو لەماڵی ئەوان بووم تێوارەیەك لە ماڵی کاك باوکی بەهەشت و شەوێکیش لە ماڵی کاك عومەر سەلەفی ناسراو بە کاك بڵند، ئەو چەند ڕۆژە زۆر خۆش گوزەراندم لە ئەڵمانیا حەقی جارەکەی ترم کردەوە کاك باوڕ منی گەیاندەوە بۆ فڕۆکەخانە و گەڕامەوە بۆ نەرویج.

مەراقم بوو بزانم ئەو ساتانیستانە دەگەنە چی، مەرگی ئەفسانە و دایکی و کاك عەبدوڵلا زۆر ناخۆش بوو کاریگەری خۆی هەبوو.

بەداخەوە ئێستا لە کوردستان لەم جۆرە بیروباوڕانە زۆرە.

چەند نمونەیەك لەوانە:



له سابونکەران له سلێمانی زیاد له ٢٠ لاو گیراون کە هەموو بەیەکەوە کاری سێکسیان کردووە هەمووشیان کوڕن.

له هەولێر بە ئاشکرا هەن و له هەفتەنامەی باسدا چاوپێکەتن و ڕاپۆڕتیان لەسەر کرابوو...

له ناوچەکانی تر له شێوەی گروپ و ڕێکخراو دا دەردەکەون.

ئەو کەسانەی کە دەچنە ناو ئەو گروپەوە له کۆتایدا دەبێت خۆیان بکوژن یاخود شێت بن.

هەندێك زانیاری له سەر ئەم گروپی شەیتان پەرستانە له جیهان دا.

ئەمانە تەنانەت له ناو شاری مەککەی پیرۆز دا هەن له یەکێك له کۆڵانەکانی شاری مەککە من ئارمەکەیانم بینیوە لەسەر دیوار بۆیاخ کراوە، کە ئەستێرەیەکی پێنج چوکڵەیە و بۆ خوارەوە شۆڕە پێچەوانەی ئەستێرەکەی داود.

بارەگای سەرەکییان له ئەمریکایە و پاشان ئیسرائیل و ئینجا وڵاتی میسر.

له ئەوڕوپا زۆرن، بەڵام پۆلیس چاودێریان دەکات له ڕاستیش دا کۆنتڕۆڵ ناکرێن.

ڕۆژێکیان هەیە له هاوین دا بەرواری ٦/٦ هەموو ساڵێك یادی دەکەنەوە، چونکە پێیان وایە ڕۆژی لەدایك بوونی شەیتانە، هەموو بەکاری شاز و ئاشکرا و قێزەونەکانیان دێنە دەرەوە.

ژمارە سفریان زۆر لا پیرۆزە و گۆرانیەکیان هەیە کە هەموویان لەبەریانە بەناوی ڕێگەی فراوانی دۆزەخ.

له کاتی عیبادەتیان دا بۆ شەیتان ئافرەتێکیان بە ڕوتی خۆی خوێناوی دەکات و دەست ئەدات له پێشی پیاو و ژنان بۆ پیرۆزی بەندایەتییەکەیان گوایە شەیتان ئەمەی پێخۆشە.




مۆسیقایەکیان هەیە بەناوی ڕێگا بەرەو بەهەشت کە دەبێت وەك مناجات و قورئانی موسڵمان و ئینجیلی مەسیح و تەوراتی جولەکە ڕۆژانە گوێی لێ بگرن.

دەبێت تەنها گوێ لەیەك تیپی مۆسیقا بگرن ئەویش ناوی ڕۆکی لیدز بینغن.

باشترین گۆرانی بێژیان کە دەبێت گوێی لێ بگرن ناوی ڕۆلین ستونە، کە گۆرانییەکەی قسە وتنە بە خوا و بەرزڕاگرتنی شەیتانە، فێرکردنی ئەو خەڵکەیە بە خۆوسیتی و ئەنانیەت.

جۆری مۆسیقاکان سێ جۆرە کە پزیشکەکان دەڵێن ئەم جۆری مۆسیقایە کاردەکاتە سەر دڵ و مێشکی مرۆڤ وای لێدەکات خۆی بکوژێت بێ ئەوەی بترسێت، ناوەکانیان بریتییە لە:

یەکەم: مەعدەنی ڕەش بە ئینگلیزی پێی دەوترێت (بلاك مێتاڵ)

دووەم: مەعدەنی ڕەق بە ئینگلیزی پێی دەوترێت (هارد مێتاڵ)

سێیەم: مەعدەنی مردن بە ئینگلیزی پێی دەوترێت (دێث مێتاڵ)

دژی هەموو جۆرە ئایینێکن.

ئەو کەسەی دەیەوێت زیاتر لە شەیتان نزیك بێتەوە، دەبێت هەموو جۆرە مەی و مەشروب ماددەی هۆشبەر بخواتەوە، بۆئەوەی زۆر مەست بێت، پاشان خوێنی یەکتر دەخۆن، هەموو جۆرە سێکسێەک دەکەن بە پیاو و ژن و گەنجیان پیاو لەگەڵ پیاو ژن لەگەڵ ژن هیچ جۆرە قەدەخەکراوێك نییە، هەموو کارێکی نەشیاو دەکەن بە کۆمەڵ دەیکەن پییان وایە شەیتان ئەوکارەی پیرۆز کردووە، لە کەناری دەریاکان دا ئەو کارە دەکەن.

ئافرەتیان کە سکی پڕ دەبێت لە پێنج مانگی دا سکەکەی پێ لەباردەبەن دەبێت خۆی لە خوێنەکەی بخواتەوە.



منداڵ سەر دەبڕن و گۆشتەکەی دەخۆن و دەیکەنە قوربانی بۆ شەیتان بە دەستی دایکی خۆی.

هەوڵی زۆریان بۆ فێربوونی سحر و جادووە.

خاوەنی زیاد لە ٧٤٧٥ پێگەی خۆیانن لە هەموو دونیا دا بەربڵاون.

ئەوەی کە باسم کرد پەیامیی منە بۆ دایك و باوکان بۆ لاوەکان، خۆیان بپارێزن لەم جۆرە فیتنانە، بەتایبەت ئەوانەی لە ئەوروپان نەهێڵن منداڵەکانتان تێکەڵ بن بەم جۆرە خەڵکانە.

# چیرۆکی حەڤدەیەم
## من و گوڵی سور

ساڵی ٢٠٠٦ لە تۆڕی کۆمەڵایەتی پاڵتۆك چەند کۆڕێکم گرت لە ژووری کوردستان یونایتد، بۆتین سەرپەرشتی دەکرد کۆڕێك بوو لەسەر مافی ئافرەت، دوای تەواو بوون کەسێك پەیوەندی پێوەکردم بە ناوی گوڵی سور سڵاوی لێکردم، وەڵامم نەدایەوە تا درەنگ لەبەر ئەوەی تایبەتی ترم زۆر لەگەڵ بوو لە پاڵتۆك، دەرچوو لە پاڵتۆك منیش جوابی سڵاوم دایەوە و بەجێمهێشت، دوای ئەو لە تایبەت (پرایڤێت) نووسیبوی (ماکوان تۆ جاشی عەرەبی، بۆ خزمەت بە کورد ناکەیت خزمەت بە ئیسلامی عەرەبی شۆڤێنی دەکەیت، بۆ خزمەت بە محەممەد دەکەیت کچێکی هێناوە تەمەنی ٩ ساڵ بووە).

وەڵامم نەدایەوە لای خۆم سڕیمەوە کە نەتوانێت هیچ نووسینێکم بۆ بنێرێت.

پاشان بە ناوی سورە گوڵ هاتەوە، دیسانەوە بە ئەدەب سڵاوی کرد، وەڵامم دایەوە، وتی: کاك ماکوان جیاوازی یەهودی و ئیسلام چییە لە عونسوریەت دا، ئێوە وەلاء و بەرائتان هەیە، ئەوانیش هەر وەلاء و بەرائیان هەیە خۆیان بە گەلێکی پێشنگ دەزانن بۆ هەموو جیهانیان، ئێوەش هەروان.

بەم شێوەیە وڵامم دایەوە: بەڕێز سورەگوڵ ئەم باسە زۆری دەوێت بە نووسین کات زۆر دەبات ئەگەر مایکت هەیە بە دەنگ بۆتی شی دەکەمەوە.

سورەگوڵ: ببورە مایکم نییە.

بۆم نووسی: ببورە منیش کاتم نییە.

سورەگوڵ: ئاخر من کچم مایك ناگرم.

بۆم نووسی: دەی خوشکیمن تۆ قسە مەکە، من قسەدەکەم بەس گوێ بگرە، من داوای قسەم لێنەکردویت.

بەجێی هێشتم و وەڵامی نەدامەوە، پاش کەمێکی کە پەیوەندی پێوە کردم و وتی: ئاخر منداڵەکانم خەوتوون ئەکرێت کاتێکی تر بێت.

وتم: بەڵی، ئاساییە.

شەوێکیان ئەو ناوەم بینی لە ژووری دیدی نوێ، من قسەم دەکرد باسی سیرەی پێغەمبەرم دەکرد، ئاگام لێی بوو دەینووسی بە حقدەوە نووسیبووی (محەممەد هەرچی جولەکەی نیشتیمانی عەرەبوو کوشتی و دەریکردن ئیتر باسی چی دەکەن، کەی محەممەد ڕەحمەت بووە).

کاك ئاوات کەرکوکی ئەدمینی ژوور لە نووسین وەستانی تا من تەواو بووم.

وتی: بەڕێز هەر پرسیارێکت هەیە فەرموو مایك بگرە با مامۆستایانی ژوور وەڵامت بدەنەوە.

سورەگوڵ: من مایك ناگرم ئافرەتم.

کاك ئاوات ڕێگەی پێدا کە بە تێکست بنووسێت، نووسی بۆ عەلمانی بە کافر دەزانن و ئەوەی لە خۆتان نەبێت سەری دەبڕن؟ بۆ نابێت لەم ژوورەی ئێوە ئافرەت قسەبکات؟

کاك ئاوات وڵامی دایەوە وتی: بۆ ڕاست ناکەیت ئەوە نییە ئێمە پێت دەڵێین مایك بگرە و قسەی خۆت بکە، تۆ خۆت مایکت نییە!ئیتر بۆچی ئێمە ڕێگەت پێ نادەین.



قسەیەکی بە کاك ئاوات وت، لە وڵام دا پێی وت: ماددەم قسەت بە خۆم وت هیچ ناڵێم، مرونەتی نواند چونکە خۆی ئەدمین بوو.

لە پرایڤت بۆی نووسیبووم: من ناڵێم ئێوە عونسورین بەس خۆتان خۆشدەوێت.

هیچ وڵامم نەدایەوە.

دوای هاتەوە وتی: وەرە با بەمایك قسەبکەین.

منیش لە ڕووی فزولیەوە وتم: باشە، هەستم دەکرد ئافرەت نەبێت، چونکە ئافرەت ئەوەندە لەسەر شت ناڕوات، پاشان من مایکم بۆ نارد، قسەی نەکرد وتی: مایکم ئیش ناکات، واهەستم کرد درۆ دەکات.

وتم: ئاخ کورد درۆ و پارە و خیانەت، هەر بۆ خۆشی.

پاشان وتی: ماکوان!بۆ ئەوەی بزانی من ئەفسەرم لە سوپای ئیسرائیل ڕۆژانە بە دەیان موسڵمان دارکاری دەکەم، ڕۆژێك دێت تۆش ئاوا دارکاری بکەم.

زۆر ڕقم هەڵسا وتم: ئاخر ئەو کاتەی کە توانیت مایك بگریت و بووی بە پیاو لە ئافرەتی دەرچووی دڵنیام دەتوانیت.

من وا تەعامولم لەگەڵ دەکرد کە پیاوە، بۆ ئەوەی بیشکێنم دەمووت تۆ ئافرەتی، بەڵام دیار بوو بەوە تووڕە نەبوو، شانازی بە ئافرەت بوونی خۆیەوە کرد، چونکە پیاو بە تەبیعەتی حاڵ بڵێیت لە ژن دەچیت پێی ناخۆشە!

ئیتر هەستم کرد ئافرەتە و بلۆکم کرد، چونکە کاتی ئەو هەموو چەلەحانێیەم نەبوو لەگەڵی.

دوای چەند ڕۆژێك هاتەوە بۆلام بە ناوی روسا، دوای سڵاو ئەو پرسیارەی لێکردم.

نووسی ئایا لە ئیسلام دا ڕێگە دراوە ئافرەت شوو بکات بە پیاوی مەسیحی یان جولەکە؟ بە نووسینەکەی دا هەستم کرد ئەوە سورەگوڵ گوڵی سورە، بێ پەردە وتم: تۆ فلان کەسی؟

بە ڕاشکاوانە وتی: بەڵێ.

وتم: لەبەر ئەوەی بێ ئەدەبیت کردووە وڵامت نادەمەوە.

گوڵی سور: من لەسەر دوو ڕیانێك دا وەستاوم، دەمەوێت موسڵمان بم، زۆریش لە ئیسلام دەخوێنمەوە، بەڵام هەرچی دەکەم قەناعەتم بۆ دروست نابێت.

وتم: من ئامادەم وڵامی هەموو پرسیارەکانت بۆ دەستەبەر بکەم، ئەگەر خۆشم نەمتوانی لە مامۆستا کرێکار دەپرسم بۆت، ئەو دەمە مامۆستا کرێکار لە زیندان دا نەبوو، بەڵام بەمەرجی ئەوەی ڕاستگۆبیت لەگەڵم دا.

سورە گوڵ: من پەیمانت ئەدەمێ ڕاستگۆ بم.

وتم: چۆن بڕوات پێ بکەم؟

وتی: سوێندت بۆ دەخۆم بە خوا!

دەستم کرد بە پێکەنین و ئیشارەتی پێکەنینم بۆ نارد کە ئەوە بەتاڵە، چونکە من هەست دەکەم بڕوات بە خوا نییە.

گوڵی سور: لە تۆ زیاتر بڕوام بە خوایە ماکوان، بەڵام بروام بە ئیسلام نییە.

قسەیەکی کرد قەناعەتی پێکردم ئەویش ئەوەبوو وتی: ئەگەر هەستت کرد ڕاستگۆ نیم یان بۆ کات بەسەر بردن قسەدەکەم ئەوا ئەتوانیت ئیتر بەیەکەوە قسەنەکەینەوە.

وتم: فەرموو من ئێستا لە خزمەت دام ئەو داوای کرد کە بچینە تایبەت بە مایك قسە و ئاخافتن بکەین.



ڕۆشتین من مایکم نەگرت ئەو مایکی گرت و زۆر بە جوانی سڵاوی کرد و وتی: من ناوم ئاڤانە خەڵکی کوردستانم، بەڵام لە تەلئەبیب دادەنیشم خانەوادەکەم هەموویان کوردن، کوردستانم خۆشدەوێت و حەز بە ناوی کورد دەکەم.

چەند پرسیارێکم هەیە لە ناو تۆڕی پاڵتۆك تۆم دیوە حەز دەکەم پەیوەندیمان هەبێت و موتابەعەم کردوویت لە ژیانت دا جدیت، هیچ ڕۆتینات و قسە و باسی ناو پاڵتاکت نییە، تەنها بۆ مەبەست دەتبینم لە ناو پاڵتاك دا لە کوێدا جدیات بوو تۆ لەوێ دا هەی دیفاع لە ئیسلام دەکەیت، بۆیە ڕووم لە تۆ کردووە، من کچێکم تەمەنم ٢٦ ساڵە.

پاشان مایکی ئازاد کرد بۆ من وتی: فەرموو تۆش قسەی خۆت بکە.

منیش مایکم گرت و سڵاوم لێکرد و وتم: ڕاستە تۆ ئەفسەری ئیسرائیل_ی و ئازاری موسڵمانان ئەدەیت بەس ئەوەم بۆ ڕوون بکەرەوە.

گوڵی سور وتی: نا_ بەس تەنها بۆ ئیستفزازی تۆ بووە ئەو کاتە، ئەگینا من تەنیا ئەندازیارم و هیچ پەیوەندیم بە سەربازیەوە نییە و حەزیشم پێی نییە.

ئینجا من کەوتمە پرسیار و ئەویم هێنایە ژێر پرسیار.

وتم: چی دەکەیت لە ئیسرائیل و کوردیشیت، لە کەیەوە لەوێیت؟

گوڵی سور: لە ٣١ ئابەوە چوینە ئەمریکا و پاشان بە عەقدی کار باوکم هاتەوە بۆ ئیسرائیل باوکم لەگەڵ یەکێك لە ڕێکخراوەکان کار دەکات، ئینجا دەستی کرد بە قسە و باس و دەردە دڵی...

هەستم کرد کارێکی موخەبەراتی لە پشت ئەمەوەیە!

پرسیارە موخابەراتییەکانی لەگەڵ مندا، ئەو شەوە کە قسەمان کرد باسی هەندێک ژیانی خۆی کرد کەماڵیان لە سلێمانی لای ابوسناء وە بووە، ئینجا ئەوەی درکاند کە ئەوانە مەسیحی بوون، لە دوای ئەوەی باوکی

لەگەڵ ئەمریکییەکان کاری کردووە، کە ٣١ ئاب پارتی حیزبی بەعسی هێناوە، ئەمان مونەزەمەی ئەمریکی بەلجوئی سیاسی هەموویان بەرەو ئەمریکا ڕۆشتوون و باوکی بە گرێبەستێکی کارکردن لەگەڵ کۆمپانیایەکی ئەمریکی کار دەکات لە ئیسرائیل و لە ساڵی ١٩٩٧ هاتونەتە تەلئەبیب، هەندێک وتەی تری ئاسایی.

(کە ئەمانە هیچی نەچوو بە مێشکی من دا، واهەستم دەکرد درۆم لەگەڵ دەکات).

ئەو شەوە منیش باسی خۆمم بۆ کرد کە لە ساڵی ١٩٩٨ لە ئەوڕووپام بە هۆکاری نەبوونی کار و کەسابەت و بۆ بونیادنانی کەسایەتی خۆم هاتومەتە ئەوڕوپا و لە وڵاتی خۆم هیچ کێشەیەکی سیاسیم نەبووە وەك تەعاروف و یەکترناسین، یەکترمان بەجێهێشت، من باسی هیچم بۆ نەکرد، چونکە لەگەڵ خێزانم سەیری زنجیرەیەکی ئێرانیمان دەکرد بەناوی پاورچین.

بۆ ڕۆژێکی تر لە ناو پالتۆك هاتەوە بانگی کردم بۆ ژوورێکی تایبەت، بە مایك ئەو پرسیارانەی لێکردم.

گوڵی سور: سەلەفی جیهادی چییە؟

وتم: ئەوە قوتابخانەیەکی فیکری ئەهلی سونەت و جەماعەتە، باس لە مەنهەجێك دەکات، کە پێشینانمان چۆن ڕەفتاریان کردووە، خۆشیان بەو کۆمەڵە دەزانن کە لە ناو فەرموودەی پێغەمبەری نازدار (درووودی خوای لێبیت) بە تایفەی حەق یاخود (طایفه المنصوره) دەزانن، کە هەمیشە لە خەبات و شۆڕش و کۆششدان.

گوڵی سور: ئیخوان کێن و چین؟

وتم: قوتابخانەیەکی ئەهلی سونەتە پڕ لە شۆڕش و خەباتە بۆ گەڕاندنەوەی ئایینی پیرۆزی ئیسلام و ئایدۆلۆژیایی ئیسلامی، لەسەردەمی

حەسەن بەنناوە_ ڕەحمەتی خوای لێبێت_ دامەزراون، تا ئەم سەردەمەی کە ئێستا من و تۆ قسە دەکەین و سوپاس بۆ خوا بە هێز و بازوی ئیخوان بوو کە سینا لە ئیسرائیل_ی داگیرکەر پاکرایەوە، (لەو کاتە دا پێکەنینێکی نووسی بۆم)، منیش مایکم ئازاد کرد.

گوڵی سور: حیزبی تەحریر کێن؟

وتم: کۆمەڵێك موسڵمانی ئازا و بە جەرگن، هەوڵ و خەباتیان بۆ گەڕاندنەوەی خیلافەتی ئیسلامییە سوپاس بۆ خوا لە ناو فەڵەستینییەکان دا زۆرن بە تایبەت لە ئەوروپا دا و تایبەت تریش لە دانیمارك، هەوڵیان بۆ ئەوەیە کە حکومەت و خیلافەتی ئیسلامی دابمەزرێنن تەنها بە ئەدەبیاتی ئیسلامی دوور لە هەموو ئەدەبیاتێکی تری ڕۆژئاوایی یاخود ڕۆژهەڵاتی، بەڵکو تەنها ئیسلامی.

گوڵی سور: کاك ماکوان تۆ کامیانی لەم سێ قوتابخانەیە؟

ئیتر هەستم کرد ئەو هەروا سادە نییە، بە دڵنیاییەوە ئەمە پرسیاری موخابەراتییە و لە سەرێکەوە سەر دەردەهێنێت، ئینجا هەستم بەوە کرد کە ئەم ئافرەتە کەسێکی سادە نییە.

وتم: جاتۆ ئەم پرسیارەت بۆ چییە بۆ لە ژیانی شەخسی من پرسیار دەکەیت؟ ئەوە پەیوەندی بە خۆمەوە هەیە.

هیچی باس نەکرد لەسەر ئەو مەوزوعە، چووە سەرباسێکی تر و وتی: تۆ گوێ لە موسیك دەگری؟ حەڵاڵە یان حەڕامە؟

هەستم کرد ئینجا ئەو خۆی دزیەوە لە پرسیارەکەی من.

وتم: من بۆخۆم گوێی لێ دەگرم، بەڵام هانی کەس نادەم بۆ ئەوەی گوێی لێ بگرێت، پاشان منیش نەمکردووە بە عادەت کە گوێ بۆ موزیك بکرم پێناچێت بە مانگیش گوێ لە موزیکێکی تایبەت بکرم، مەگەر دەنگی

موزیکی دەنگ و باس و تەلەفیزیۆن بە گشتی، من باس لە حەڵاڵ و حەرام ناکەم، چونکە ئەوە ئیختیلافی لەسەرە.

گوڵی سور: ڕات چۆنە بۆ مافی ئافرەت؟

وتم: هیچ بڕوام بە مافی ئافرەتان نییە.

گوڵی سور: ئەی چۆن؟

وتم: لەبەر ئەوەی من بڕوام بە مافی مرۆڤ هەیە، پیا و ژن لە ئەنجامی ئەو مافی مرۆڤەوە دەبینم کە خوای گەورە بۆ ژن و پیاویش دەستەبەری کردووە لە ئیسلام دا ماف دراوە، بەڵام لە هەموو بەرنامە و ئایینەکانی تردا ماف بە زۆر دەسێنرێت، جیاوازیەکە ئاسمان و ڕێسمانە، تێگەیشتی یان زیاتر ڕوونی بکەمەوە؟

گوڵی سور: تێگەیشتم.

هەستم کرد ئەو ئافرەتە خەڵکی تر لە تەنیشتیەوەیە و فێری قسەی دەکەن و پرسیاری فێر دەکەن، دەیانەوێت من بخوێننەوە، لە ئەنجامی قسەکانم من و ناخم باش بناسن و بیخوێننەوە.

گوڵی سور: کاك ماکوان ئەگەر لە جەنگێك دا منت بەردەست بکەوێت چیم لێدەکەیت؟ دەمکەیت بە کەنیزەك بۆ خۆت؟

وتم: وڵامی من بۆ ئەم پرسیارە موخابەراتییە ئەوەیە زۆنی جەنگەکە دەست نیشانی دەکات، تۆ وەك جوندی و سەربازی ئیسرائیلی دەست من بکەویت، ئەوا مامەڵەی دیلیت لەگەڵ دەکەم، چونکە سەردەمی کەنیزەك نەماوە ئەو یاسایە لە ئیسلام دا ئێستا کاری پێ ناکرێت، چونکە لە سەردەمی سەلاحەدینی ئەیوبی مامەڵەی لەگەڵ ئافرەتانی جەنگ دا مامەڵەی دیل بوو، یاسای کەنیزەکی نەساپاند، لە جیهادی ئەفغانیش دا بەهەمان شێوە ئەفغانییەکان کە سەربازی ئافرەتی ڕووسیان دەگرت هەر مامەڵەی دیلیان لەگەڵ دا دەکرا، ئەگەر انشاءلله من تۆم گرت ئەوا

مامەڵەی دیلت لەگەڵ دەکەم، خۆ ئەگەر دوژمن کە ئێوەن مامەڵەی کەنیزەکتان لەگەڵ ئافرەتی موسڵمان کرد، ئەوکات ئەمیری موسڵمانان ئەمری دەکرد منیش تۆ ئەکەم بە کەنیزەك بۆ خۆم، یان ئەگەر زانیمان دوژمن کە دیسانەوە ئێوەن ئافرەتانمان دەکوژن ئەوا بە دڵنیاییەوە منیش ئەتکوژم بۆ ئەوەی چیتر موسڵمانان نەکوژرێن وەك وەڵامێك بۆ کردارەکەی ئێوەی دوژمن، هەڵبەت ئەم، باسانە زیاتر دەخوازێت، پێویستی بە ڕوونکردنەوەی فقهی جیهاد هەیە.

گوڵی سور: کاك ماکوان من شوت پێ بکەم دەمهێنیت دەبم بە موسڵمان؟

## کچە ئیسرائیلە کوردەکە، جوانییەکەی سەرسامی کردم:-

لە دوای ئەوەی کە پرسیاری کرد ئایا کاك ماکوان من ئەگەر موسڵمان ببم شوت پێبکەم دەمهێنیت؟ بە دەنگێکی ناسك و پاشان بە زەردەخەنەوە، هەستم کرد ڕاست ناکات.

سبحان الله_ ئەو دڵە وەك فەرش لوول بوو، خوا ڕەحمی کرد خێزانم لە تەنیشتمەوە حازر بوو، ئینجا هەستم کرد زانایانی ئەم ئیسلامە خەڵوەتی ئافرەتیان هەروا بەئاسانی حەرام نەکردووە، بە تایبەت لەم چاتە سارد و سڕانەوە.

پاشان بۆخۆم لە دوو ڕیانێك دا بووم، ویستم قسەکەی پێ ببڕم و بە جدی وەرینەگرم.

وەڵامم دایەوە وتم: خێزانم دانیشتووە بۆ حورمەتی خێزانم هیچ وڵامێکت نادەمەوە، هەرچەندە ئەمە بۆخۆی ڕازی بوون بوو، ئاگاشم لێبوو خێزانم توڕە بوو، بەڵام بۆ ئەوەی جارێ خێزانم هێور بێتەوە، پەیوەندیم بە خوشکێکییەوە کرد کە شارەزابوو لە هاککردن، پاشان کوڕێکی بەڕیزیترم دەناسی بارزانی بوو نازناوی کاك (خرپن) بوو، کوڕێکی بەڕێز بوو لەم بوارانە دا شارەزا بوو، هەلێکی باش بوو لەسەر خەت بوو، ئینجا داوای لێبوردنم لە گوڵی سور کرد و وتم خەڵکی ترم لەگەڵ دایە قسە دەکەینەوە.

خێرا لەگەڵ کاك خرپن و تارای خوشکی خێزانم دەستمان کرد بە قسە و مەوزوعەکەم بۆ باسکردن کە من داوای لیدەکەم کامێرا بکاتەوە، پاشان ئێوە وێنەیم بۆ بگرن، چونکە من ئەوشتانە نازانم.

تارا: من ئەوەت بۆ دەکەم، بەڵام دەبێت بێمە ناو کۆمپیوتەرەکەتەوە.

وتم: باشە، داوام کرد لە خرپن کە ئەویش ئایپی ئەدرەس و جێگا و مەکانیم بۆ ئاشکرا بکات.

خرپن: دەبێت من چاوم لە نووسینەکانی بێت تۆ وێنەیەکی خۆتی بۆ بنێرە با بتبینێت من بە وێنەوە نازانم چی هاوپێچکرد لەگەڵی دا، گرینگ ئەوە بوو ئەویش وتی دەبێت بێمە ناو کۆمپیوتەرەکەتەوە.

ڕێگام دا بەهەردووکیان، پاشان چوومەوە بۆلای گوڵی سور.

ئاگادارم کردەوە وتم: جا ئەم قسەیەت بەڕاستە کە دەتەوێت موسڵمان بیت؟

بۆی نووسیم بەڵێ!

وتم: باشە ئەی بۆ شو دەکەی بە من؟ ئەوە چەند برای ترمان هەیە ژنیان نییە بۆ شوناکەیت بەوان.

نمونەی دووبرام هێنایەوە، یەکێکیانم باش لەبیرە کاك ئەبودەردا بوو، من زۆر بە جدیم بوو، چونکە ئەو کوڕێکی جوان خاس بوو.

گوڵی سور: نا من بەس شوو دەکەم بە تۆ.

لەم حاڵەتە دا شتێکی زۆر عەجیب ڕووی دا، برایەکی تر لە ژوورەکە دا پەیوەندی پیوە کردم ناوی کاك (نەسرەت) بوو ئیزنم لێخواست کە خەڵك لە پێسێکەم دایە ئەوم وەستاند، پاشان بە رووسام وت باشە من چۆن بزانم تۆ راست دەکەیت من ڕازیم، بەڵام بە مەرجی ئەوەی دەبێ بتبینم.

گوڵی سور: وەرە بۆ ئیسرائیل.

وتم: من ناتوانم بێمە ئیسرائیل، تۆ وەرە وڵاتێکی عەرەبی، یان هەر وڵاتێکی تری ئەورووپی من دێم بۆ لات.

گوڵی سور: باشە.

وتم: تۆ منت دیوە؟

گوڵی سور: بەڵی وێنەی تۆم لە دەریای نور بینیوە.

خرپن: پێی بڵێ من تۆم نەدیوە با کامێرات بۆ بکاتەوە.

منیش پێم وت.

گوڵی سور: من کامێرات بۆ دەکەمەوە.

کامێرای بۆمن کردەوە چیم دی!ئافرەتێکی نازداری جوانی قژ خاو، هەر زۆر جوان، لەو ئافرەتە جوانانە بوو کە پەسەند کراون.

کوڕە من خەریك بوو دڵم بگۆڕێت، باش بوو خوا ڕەحمی کرد، دەنگ تۆمار دەکرا وێنەی ئافرەتەکە گیرا، منیش وتم تازەترین وێنەی خۆمت بۆ دەنێرم ئەو وێنەیەی کە کاك خرپن ئامادەی کردبوو ناردی وەریگرت، بە هۆی وێنەکەوە کە وەریگرت هەموو ئایپی ئەدرەسەکەی بۆ دەرهێنام لەکوێ دەژی و تەنانەت ناوی گەڕەکەکەشی بۆ هێنام جۆری خەتی ئەنتەرنێتەکەی کە بەکاری دەهێنێت ناوی ئەویشی بۆ هێنام.

ماڵئاواییمان لە یەکتر کرد و لە دوای هەندێک قسەی ڕۆتینی و سادده من خێرا هەڵسام دەستنوێژم گرت و دوو ڕکعات نوێژم کرد، تارا هەموو وێنەکانی لای خۆی خەزن کرد و دایەوە دەستی من.

کاك خرپن هات: کاك ماکوان ئەوکەسە ساختە چییە ئەو وێنەیە هی خۆی نییە.

وتم: چۆن؟

خرپن:ئەو وێنەیە لە پاڵتاک دا هەیە، ئەوە ئافرەتێکی ڕووسیە ڕیکلامی پاڵتاکە دیسانەوە وێنەکەی بۆهێنام.

زۆر بێتاقەت بووم، نەمدەزانی بێتاقەتییەکەم بۆ ئەوەیە کە درۆی لەگەڵ کردووم یاخود ئەم ئافرەتە جوان دەرنەچووە، یان چی بوو!بۆم نەدۆزرایەوە بۆیە ئیتر بە جدی وەرم نەگرت زانیم درۆزنێکی عەزیمە.





وتم: ئەی ئەدرەسەکەی کوێیە کاك خڕن؟

وتی: کاك ماکوان ئەوە لە ئیسرائیل_ە لە تەل ئەبیبە.

زۆر پەست بووم، چومە خزمەت کاك نەسرەت وتی: کاك ماکوان قسەیەکی خۆشت بۆ باس بکەم.

وتم: چییە برای خۆم؟

کاك نەسرەت: ئافرەتێك هاتووە لەگەڵ من دا قسەی کرد و وتی دەمەوێت شووبکەم بە تۆ یان ماکوان.

زۆر داوام کرد لە کاك نەسرەت وتم: کێ بوو؟

کاك نەسرەت: خوشکێك بوو.

ئیتر زۆر قسەم نەکرد، بەڵام تەوقیتەکەی زۆر سەیر بوو لەلام بەس هەر بەسادەیی وەرمگرت، کاك نەسرەت هەر پێی نەوتم تا ئێستاش.

ماوەیەکی دورودرێژ ئەم ئافرەتە نازانم ناوی بنێم پلاستیك، یان ئافرەتی درۆ یان چ ناوێك، بەهەرحاڵ چەند مانگێك ون بوو لەو ڕۆژەوەی کە هاککرا زانیم ون بووە، بەڵام بە دڵنیایەوە زانیم کە ئەویش شارەزایە لە بواری ئەم هاك و جۆرە کارانەدا.

حەمەن زانیویەتی بۆیە خۆی شاردۆتەوە، کات ڕۆیشت و زەمەن هات، من کوڕێکم هەبوو لە ژووری کوردستان نەتەوەیی.

لای کاك دەرون و کاك شێخ_ی بەڕێز، ئاگام لێبوو لە ژوورەکە دا بوو لە کاتی قسەکانی من دا جنێووم پێ ئەدات، بەو ناوەی کە یەکەمجار بلۆکم کرد بە ناوی گوڵی سور، قسەی سوك و ناشرینی زۆری بە ئیسلام و خۆم وت.

کاك شێخ دەری کرد، داوام کردەوە لە کاك شێخ ئەو کەسە بهێنێتەوە و وازی لێبێنێت چی دەڵێت با ئازاد بێت.

مامە شێخ زۆری بەلاوە سەیر بوو، بەڵام وتم وازی لێبهێنە چی دەڵێت با بڵێت، خوا هەڵناگرێت ئەم پیاوە بەڕێزە زۆر حورمەتی منی دەویست چیم بوتایە بە قسەی دەکردم، هەڵبەت لە پیاوەتی و گەورەیی خۆیان بوو.

دوای ئەوەی کۆڕ تەواو بوو پەیوەندیم بە ناوەکەیەوە کردەوە وتم: باشە کچی باش تۆ ئەو هەموو قسە ناشرینە چییە بە منت وت خۆ تۆ بەتەمابوویت شوم پێ بکەیت؟

هیچی نەوت و منی بلۆك کرد و لە خەت نەما، کەمێکی پێچوو بە ناوی (ڕووسا) هاتەوە ئینجا من خۆم بۆ نەگیرا وتم: هەی داوەشێیت ئەوەی بە دەممداهات پێم وت بە ئیسرائیل و دەوڵەتی ئیسرائیل زۆر توڕە بووم، جا یاخوا منیش توڕە نەبم ئاگام لە خۆم نامێنێت، لەبەر ئەوەی شەو قسەی زۆری وتبوو، ئینجا داخی ئەو ڤیدیۆیەم لە دڵدا بوو کە وێنەی ئەو ئافرەتە جوانەی دانابوو خەریك بوو بمخنکێنێت.

وتم: وەرە تۆ چیت_ چیت دەوێت دەستەکەت کەشف بووە بۆ بەئاشکرا قسە ناکەیت، پەیامت چییە بمدەرێ.

نووسی ماکوان گیان ئاگاداری خۆت بە من لە دەزگای مۆسادەوە لەگەڵت ئەدوێم ئەو ناوە من نەبووم کە قسەی بە تۆ وتوە کەسێکی تر بووە ناوەکەی بەکارهێناوە.

من بڕوام بە هیچ قسەیەکی نەبوو، بەڵام هەستم دەکرد بۆ وازی لێناهێنم وەك جگەرە و حەشیشی لێهاتبوو خۆشە و خراپیشە.

وتم: من هەموو دەنگەکانم تۆمار کردویت ئەو وێنەیەشی کە بۆت ناردووم زانیومە کە ئەوە ئافرەتێکی ڕووسیە ناوی پاڵتاکە، کە وام وت وێنەیەکی گریانی نارد و نووسی توخوا دەنگەکەم بڵاو نەکەیتەوە باوکم و کەسوکارم پێم بزانن دەمکوژن.

دیسان کەوتمەوە گومان، چونکە کەسێك موخابەرات بێت بەو شێوەیە قسە دەکات، دوایی وتم لەوانەیە هەر فێڵ بێت.

وتم: باشە تۆ چیت لە من دەوێت؟ بڕۆ خوات لەگەڵ ئیتر وازلەمن بهێنە.

وتی: باشە، ماڵئاوایی کرد.

کە بەو سادەیە ماڵئاوایی کرد، ئەوەندەی تر خەریك بوو دڵم ئەتەقی ڕۆیشت و بەجێی هێشتم.

دوای ئەوەی چەند ڕۆژێکی بەسەر دا تێپەڕی شتێکی زۆر عەجیب ڕووی دا لە ئۆسلۆ بووم لە خزمەتی مامۆستا کرێکار، جەنابیان فەرموویان کاك ماکوان خەوم پێتەوە دیوە.

وتم: خێر خەونەکەی بۆ گێڕامەوە، تۆزێکی پێچوو لای مامۆستا هاتمە دەرەوە لە ناو قیتار دا بووم دەگەڕامەوە بۆ شارەکەی خۆم، کوڕێکی بەڕێز تەلەفۆنی بۆ کردم لە بەڕێتانیا ناوی کاك حەمە شوان بوو وتی برایەکی من خەوی بە جەنابتەوە بینیوە و خەونەکەی بۆ گێڕامەوە.کە گەڕامەوە بۆ ماڵەوە چوومە سەر کۆمپیوتەرەکەم، رووسا (گوڵی سور) نامەیەکی بە جێهێشتبوو نووسیبووی: کاك ماکوان خەوم پێتەوە دیوە.

چاوەڕێم کرد خەونەکەم بۆ بگێڕێتەوە، ئەویش هاتوو خەونەکەی بۆ گێڕامەوە.

# چیرۆکی هەژدەیەم
## من و چەند کچێکی ئیسرائیل_ی

خەونەکەی مامۆستا کرێکار ئەو بۆی گێڕامەوە کە لە دوو کەسایەتی ناوداری ئیسلامی دوو دەمانچەیان داوە بە من و جەنابی مامۆستا، منیش زۆر خۆشحاڵ بووم، چونکە هەستم کرد مامۆستا زۆر خۆشحاڵە لە خەونەکە.

وتم: مامۆستا هیچ ڕاڤەیەکم بۆ دەکەیت؟

وتی: خەونەکە زۆر باشە، ئیتر هیچم نەووت، خەونەکەی براکەی کاك حەمە شوان لە بەریتانیا خۆی بۆی گێڕامەوە کە خەونی بە پێغەمبەرەوە بینیوە لە سلێمانی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبیت) لە ژێر پردەکەوە بەرەو سەر هاتووە منیش لە تەنیشتیەوە ڕۆشتووم زیاتر منی نزیك کردۆتەوە لە خۆیی، لە خەونەکە دا فەرموویەتی با ماکوان لە نزیکمەوە بڕوات لە تەنیشتمەوە بێت، بە قەدەر هەموو دوونیا دڵم بەو خەونە خۆش بوو، لە خۆشیان دا دەستم کرد بە گریان کە بۆیان گێڕامەوە لە خۆشی ئەو خەونە سەفەرم کرد بۆ ماڵیان بۆ شاری سڵاو نزیك لە لەندەن_ە.

پاشان رووسا (گوڵی سور) هەر هەمان ڕۆژ لە ئۆفلاین نامەی بۆ بەجێ هێشتبووم، منیس لەسەر خەت بووم ئەوەندەم زانی پەیوەندی پێوە کردمەوە، من هیچم نەوت تا خۆی سڵاوی کرد.

وتم: خەونەکەم بۆ باسبکە.

خەونەكەی ئەو ئەوە بوو كە گوایە جلی بوكێنی كردۆتە بەر و لە ڕێگا دا بە سەیارە وەرگڕاوە من چووم لە ناو سەیارەكە دا دەرم هێناوە، لێتان ناشارمەوە هەر بە درۆ و قسەی بێمانا لەوم وەرگرت.

ڕاشكاوانە وتم: بە خوا بڕوای هیچم پێت نییە، خەونەكەشت ئەوەندە بەلامەوە گەورە نییە.

وتی: باشە ماكوان تۆ لەكام بەرد و دار دروست كراوی؟ ئەوەندە ڕەقی.

وەڵامم نەدایەوە.

دوایی وتی ئەتوانم پرسیارێكت لێبكەم؟

بۆم نووسی ئەگەر پرسیارەكانت مەعقول بن وەڵامت ئەدەمەوە.

وتی: بەس بۆم شیكەرەوە بۆ لە ئیسلام دا ئافرەت وەك شەهوەت تەماشا دەكرێت؟

بۆ تۆ بڕوات بە مافی ئافرەت نییە، ئەوەتا من لە ئیسرائیل هەموو مافێكم هەیە، لە ڕۆژئاوا هەموو ئازادییەك بە ژن دراوە، بۆ دوان بە شاهیدێك هەژمار دەكرێت، بۆ دەبێت پیاو چوار ژنی هەبێت؟

وتم: پرسیارەكانت بۆ دەكەم بە چەند بەشێكەوە ئینجا وەڵامەكانت ئەدەمەوە، بۆم كردە خاڵ و وڵامەكانم بە گوێرەی توانا و خوێندنەوەی خۆم بۆم باسكرد.

یەكەم: ئافرەت لە ئیسلام دا شەهوەتە؟

بەڵێ بە دڵنیاییەوە ئافرەت شەهوەتە، چونكە زۆر جوان و ناسكە هەموو هۆڕمۆنی پیاوی پێ بەرز دەبێتەوە ئەمەش عەیبە نییە، بەڵكو لە شەدەلاری و ناسك و نازداری ئافرەتە.

شەهوەت بە واتای حەزە، پیاو دەبێت هەر حەزی لە ئافرەت بێت، نەك لە ڕەگەزی خۆی، ئەگەر وابوو ئەوە شازە و نەخۆشە كەواتە ئیسلام تەندروستانە پێناسەی ئافرەتی كردووە بۆ پیاو، چونكە بیركردنەوەی پیاو

لەسەر بنەمای حەزە نەك خۆشەویستی، پێچەوانەکەی ئافرەتە کە پیاوی وەك خۆشەویست خۆشدەوێت نەك حەز، کەواتە لە بنەڕەت دا ئەمە گلەیی لە پیاوە نەك ئافرەت، چونکە خوای گەورە باسی ئافرەت دەکات لە قورئان دا بە گوڵ ناوی ئافرەتی بردووە، چونکە ترۆپکی خۆشەویستییە.

بۆی نووسیم کەوا لە کوێی قورئان دا ناوی ئافرەت بە گوڵ هاتووە؟

لە وڵام دا ئەم ئایەتەم بۆ خوێندەوە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ زَهْرَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ۚ وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ﴾ [طه: ١٣١].

بۆ وڵامی بڕگەی دووەمی پرسیارەکەت کە من بڕوام بە مافی ئافرەت و ئەو قسە بێ مانایانە نییە، لەبەر ئەم هۆکارەیە.(١)

رووسا (گوڵی سور): ئەی ئیسلام کە مافی داوە بە ئافرەت باسی نەکراوە لە فەرهەنگە جیهانیەکان دا؟

وتم: هەر باسی ئیسلامی تێدا نییە لەوێش دا نەیان وێراوە باسی ئیسلام بکەن، ئەوان بە بۆچوونی خۆیان ئیعتراف بە ئیسلام ناکەن بۆیە باسیان نەکردووە، من حەزم دەکرد باس بکرایە، بەڵام دڵنیابە رووسا خاتوون نەیانوێراوە باسی بکەن کە چۆن مافی داوە بە ئافرەت، بۆیە بیانویان بۆ دۆزیوەتەوە گوایە ئیعتراف بە ئیسلام ناکرێت، ئەوەیە وڵاتانی پێشکەوتووی دونیا و دیموکراسی خوازەکان.

ئەنجامی ئەم بزوتنەوەیە فێمەنیستی دروستکردە کە گوایە ئافرەتان لە بنەڕەت دا دژی پیاون، ئەوە بزوتنەوەکەیە و دەرئەنجامەکەیەتی.

داوای مایکی کرد، مایکی گرت و وتی: کاك ماکوان من بەڕاستی پرسیارت لێدەکەم و چەند هاوڕێیەکی تریشم لەگەڵ دایە ئەوانیش دەیانەوێت پرسیار بکەن، ئاساییە؟

وتم: ئاساییە، بەڵام جارێ با بەکورتی وڵامی ئەو دوو پرسیارەی تریشت بدەمەوە ئینجا پرسیاری تر بکە.

بە نسبەت شاهیدیدان بۆ ئافرەت ڕاستە دووانتان بە شاهیدێك هەژمار دەکرێن، بەڵام لە هەموو حاڵەتێك دا نییە، جاری وا هەیە لەبواری شیردان و هەندێك بواری تر دا تەنها شاهیدی لە ئافرەت وەردەگیرێت و حیساب بۆ پیاو ناکرێت.

بە نسبەت چوار ژنە لە بنەڕەت دا پیاو دەبێت یەك ژنی هەبێت، بە بەڵگەی ئەوەی کە خوای گەورە ئادەمی دروست کرد یەك حەوا_ی بۆ دروست کرد نەك چوار حەوا، بەڵام ٤ ژن ڕێگا پێدراوە تەنها ڕوخسەتێکە، من چیبکەم تۆ حەز دەکەیت شوو بکەیت بە پیاوێك خاوەنی خێزانە داوای لێدەکەیت شووی پێبکەیت، خەتای پیاو نییە ژنیش خۆی بەژدارە لەو پرۆسەیە دا.

دوای قسەکان من مایکم ئازاد کرد، هەستم کرد چوار ئافرەتی تری لەگەڵ دایە.

یەکێکیان مایکی گرت و بە گریانەوە هەنسکی هەڵئەدا و قسەی بۆ کردم.

ئەی هاوار چ موعاناتێکی هەبوو دڵی منی کرد بە ئاو، ئەوانە هەموو سجن بوون کە قسەیان لەگەڵ من دەکرد کوردیش بوون، وتم تۆ بڵێی ئەنفالەکان بن چووبێتنە ئەوێ؟

وتی: ماکوان باوکەکەم توخوا چی بکەین لێرە؟ ئەزانی من چەندە بێتاقەتم؟

ئەزانی لەوەتەی لێرەم نە نانم نانە و نە خەوم خەوە، ئەزانی خۆمم لە دەست داوە منداڵم لە دەستداوە، کەسوکارم لە دەستداوە دین و قیامەتیشم چووە.



یەکێك لە کچەکان ئەو ئافرەتەیان بردو ئەولاوە و لە مایکەکە دوریان خستەوە.

بە منیان وت: ئەوە چییە ماکوان_ە فەنی دەبڕۆ ملت بشکێنە و وازمان لێبهێنە.

زۆر پەست بووم سور بوومەوە و نووسیم خۆ بە زۆر ئێوەم نەهێناوە، ئێوە منتان بانگکردووە، بەڵام بە هێمنی سڵاوم نارد بۆ ئەو ئافرەتەی کە دەگریا و ئەوی تریشم بە تەعلیق و قسەی ڕەق شۆرد، چونکە بەڕاستیش ئەوان منیان بانگکرد قسەم لەگەڵ بکەن.

بۆیە ژوورەکەم بە جێهێشت و هاتمەوە بۆ ژووری دیدی نوێ گوێم لە وتاری یەکێك لە مامۆستاکان گرت.

پاشان ناوێك بە ناوی باهۆز پەیوەندی بە منەوە کرد و وتی: کاك ماکوان هەندێك پرسیارم هەیە.

وتم: ببورە مەشغوڵم سەرم قاڵە، چونکە بەڕاست توانای وڵام دانەوەم نەبوو.

وتم: بڕۆ بۆلای کاك ئاوات یان مامۆستا ئەنصاری ئەوان لە ژوورەکە وڵامت ئەدەنەوە.

وتی: من پرسیارەکەم لە جەنابتە.

وتم: باشە فەرمووو.

پرسیارەکەی نووسی، ئایا دبلۆماسییەت لە ئیسلام دا هەیە؟

نووسیم: بەڵێ.

نووسی شیکارییەکم بدەرێ کاك ماکوان گیان.

بۆم نووسی برای خۆم ئەمانە بە نووسینی لاتینی نابێت و منیش کاتم ئەوەندە نییە بە نووسین بۆت بنووسم، پێویستە ئەگەر بتوانیت بە دەنگ بۆت ڕوون بکەمەوە جەنابت گوێبگرە.

باهۆز: باشە فەرموو.

بانگم کردە ژوورێکی تایبەت، دەستن کرد بە قسە بۆم شیکردەوە ئەوەندەی لێمزانی و لە فەرهەنگەکان دا خوێندبوومەوە لە ژیانی پێغەمبەرمان (دروودی خوای لێبیت) لێی شارەزا بووم.

ئەم وشەیە لە بنەڕەت دا دەگەڕێتەوە بۆ یۆنان و وشەکە (دیپلۆما) بووە واتە وەرەقە یان کاغەزی نوشتاوە یاخود لوولکراو، ئینجا فەڕەنسا بەکاری هێنا و بە ناوی دیپلۆمات و یان دیپلۆماتیك یاخود دیپلۆماسی ئەمانە هەمووی یەك سەرچاوەن ئەم چەمکە بۆ کەسێکی لێزانە کە لە نێوان دوو دەوڵەت دا کار بکات، عەرەب بە سەفیر بەکاری هێناوە، لە ئیسلام دا پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبیت) سەرەتا خۆی ئەم کارەی ئەنجام داوە، چونکە بە زمانی ئەم سەردەمە بەشێك جیاکراوەتەوە بۆ سەرۆکەکان بە ناوی دیپلۆماسی سەرۆکەکان لە ١٩٥٠ (وینستۆن چەرچڵ) هەڵسا بەوەی لەگەڵ هەموو سەرۆکەکان کۆبونەوەی کرد، بەڵام پێغەمبەرمان (دروودی خوای لێبیت) خۆی سەرەتا لەگەڵ زەیدی کوڕی حارس ئەو کارەی ئەنجام داوە لە طائیف و پاشان لەگەڵ ئەبوبەکرد لەگەڵ گەل و هۆزەکانی عێراق و بەحرین و یەمەن، دواجار خەڵکی بۆ تەعین کردووە، پاشان بۆ حەبەشە سەفیری ئیسلام جەعفەری کوڕی ئەبو طالیب بۆ ناو شاری مەدینە سەفەری هەبوو کە موصعەبی کوڕی عومەیر بووە، دواتر بۆ لای پاشاکانی دونیا، هەریەکە سەفیری تایبەتی هەبوو هیچی لە قوریش نەبوو بۆ ئەوەی توانا و هێزەکان لە دیپلۆماسی ئیسلامی دا بخاتە کار.

بۆ نمونە کە نامەی نارد پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبیت) وەك سەرۆکی دەوڵەتی ئیسلامی و حاکم و فەرمانداری موسڵمانان لە ساڵی ٧ کۆچی دا بەم سەفیرانە دا ناردی، بۆ هەر یەکێکیان سەروەرمان قسەی

تایبەتی بۆ کردووە پاشان ئوسلوبی و وتوێژیان جیاواز و زمان زان بوون و بۆ نەجاشی ئەصحەمی ڕەحمەتی خوای لێبێت پاشای حەبەشە.

عومەری کوڕی ضمری ناردووە ڕەزامەندی خوای لێبێت بۆ مەقەوقیس.

بۆ لای پاشانی میسر حاطبی کوڕی ئەبی بەلتەعەی لەخمی ناردووە ڕەزامەندی خوای لێبێت.

بۆ کیسرا پاشای فارس عەبدولای کوڕی حوزافەی سەهمی ناردووە ڕەزامەندی خوای لێبێت.

بۆ هەرقل پاشای ڕۆم دەحیەی کوڕی خەلیفەی کلبی ناردووە ڕەزامەندی خوای لێبێت.

مونزیر کوڕی ساوا پادشای بەحرین، عەلائی کوڕی حەزرەمی ناردووە ڕیزامەنی خوای لێبێت.

هەوزەی کوڕی عەلی پاشای یەمامە سەڵیتی کوڕی عەمری عامری ناردووە ڕەزامەندی خوای لێبێت.

بۆ حارسی کوڕی شەمری غەزانی پادشای شام و شوجاعی کوڕی وەهبی ئەسەدی ناردووە ڕەزامەندی خوای لێبێت.

ئەمانە هەموو نمونە بوون دەتوانی سوودیان لێوەربگری، سەفیری زیاتریش هەیە ئەگەر بگەڕییتەوە بۆ سیرەکەی د.السرجانی و د.الصلابی و د.اباظة...

باهۆز نووسی ئەی کە ئەمانە دەزانی بۆ دیپلۆماسییانە مامەڵە لەگەڵ خەڵك ناکەیت؟

خۆ ئێوە دەمتان دەکەنەوە دەڵێن لە ئیسلام دا هەموو شتێکی تێدایە، کە تێیدایە بۆ خۆتان پیادەی ناکەن؟

قسەکەی زۆر سەرنجڕاکێش بوو، من زۆر قسەم نەکرد زانیم قسەکەی مەعقولە تەنها وتم: ئاخر دیپلۆماسییەت لە نێوان دەوڵەت دەکرێت نەك

خەڵك، بەس لە ڕاستی دا ئەم قسەیە وانییە دەوڵەتیش پێکهاتەی خەڵکە!بەس باش بوو ئەو قسەی نەکرد.

داوای مایکی کرد مایکم ئازاد کرد، دەستی کرد بەقسە و وتی: ببورە کاك ماکوان من رووسام ئەو کاتە ئەو هاوڕییەم توڕە بوو، من داوای لێبوردن دەکەم، ئەو ئافرەتەی کە گریا ئەوە بۆ ماوەی دوو ساڵە هەموو شەوێك گوێ لەئێوە دەگرێت لە ژوورەکەتان.

من داوای لێبوردن دەکەم لە هەموو شتێك.

داوای مایکم کرد دەستم کرد بە قسە و وتم: رووسا ناتوانن چەند سەعاتێك ڕاستگۆبن لەگەڵم دا بەس بزانم ئێوە کێشەتان چییە؟

ڕۆژێك خۆت بە مۆساد نیشانی من ئەدەیت ڕۆژێك کافر و یەهودی و ڕۆژێکی تریش بە گوێگر و قوتابیەکی گوێڕایەڵ، ئێوە چین؟ بەس تێمگەیەنە ئەگەر کات بەسەر دەبەن، کات لای من زۆر پیرۆزە، ئەگەر پەیامێکت هەیە بیگەیەنە و تەواوی کە، ئینجا ئەو ئافرەتە بۆ نەتانهێشت قسەبکات، بەڕاستی قسەم بۆ بکە، ئەوە مایك ئازادە.

وتی: باشە کاك ماکوان قسەت بۆ دەکەم، بەڵام وەعدمان بدەرێ دەنگمان تۆمار نەکەی.

من داوای مایکم کردەوە و وتم: ئاخر رووسا ئێوە واتان کردووە کە خۆتان خستۆتە جێگای شك و گومان وەك موخابەراتێکی نەزان خۆت نیشان داوە منیشتان ترساندووە، من ڕۆژانە بە سەدان خەڵکی قسەم لەگەڵ دەکات، دەنگی کەسیش تۆمار ناکەم.

سوێند بەخوا تۆش ئەگەر خۆت وا لێ نەکردایە نەمدەکرد، دڵنیابە تۆماری ناکەم.

رووسا مایکی گرت و هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا و وتی: جارێ با من خۆمت بە تەواوی پێ بناسێنم و ئەو ئافرەتەش با بناسیت کە دەستی بە



گریان کرد، ئەو دووکچەش هەر کچی ئەو ژنەن، ئینجا دەستی کرد بە قسە و باسەکان دڵم بوو بە بریان بۆیان.

## گفتوگۆی من و رووسا و دەردە دڵی بۆ من:-

رووسا ئەوەی بۆ گێڕامەوە، ئەو ئافرەتەی کە گریاوە ناوی نەوال خانە تەمەنی ٥٤ ساڵە، فەرمانبەر بووە لە شاری سلێمانی، هاوسەرەکەی لەگەڵ باوکی من دا بەیەکەوە هاوڕێ بوون لە سلێمانی و هەردووکیان مامۆستای زمانی ئینگلیزی بوون، کاتێك باوکی من دامەزرا لەو ڕێکخراوە بە هۆکاری برادەرایەتی هاوسەری ئەمی دامەزراند کە چووین بۆ ئەمریکا بەیەکەوە چووین، هەر بەهەمان گرێبەستی کار هاتن بۆ ئیسرائیل، ئێمە ماوەی چەندین ساڵە لە ئیسرائیل_ین تا ئێستاش نەمان توانیوە لەگەڵ ئەم کۆمەڵگایە دا تێکەڵ بین، هەرچەندە من مەسیحیم، بەڵام هیچ لەبارەی ئایینەکەی خۆمەوە نازانم، نەوال خانیش ماوەی دوو ساڵە دێتە ژوورەکەی ئێوە لە پاڵتۆك، دڵی زۆر دەکرێتەوە بە ژوورەکەتان، منیش تەنها خاوەنی یەك برام و لەگەڵ ئەم خێزانە دا تێکەڵ بووین، هەرگیز لەمان جیانەبوومەتەوە بە هۆکاری کچەکانی کە هاوڕێمن بە تایبەتی کچە گەورەکەی کە هاوتەمەنین، ئەوەی کە ئەو ڕۆژە قسەی پێ وتی کچی بچوکیانە و دایکی زۆر خۆشدەوێت هەرکاتێك دایکی بگری ئیتر پەست دەبێت، ئەوەبوو باسی ئیسلامەتیت کرد دایکی دەستی کرد بە گریان، ئەویش لە داخا قسەی پێ وتی، ئەو ڕۆژەشی کە لە ژووری (کاك دەروون و کاك شێخ) قسەت دەکرد باسی پێغەمبەرت کرد لەسەرەتاوە دەگریا و نەیدەهێشت لای بەرین، کچەکەی بە ناوی گوڵی سور هاتبووە سەرخەت لە داخی دایکی قسەی بە تۆ و ئیسلام دەوت، بەڵام ئێمە نەمانزانی بەس ئەو لە داخی دایکی وای دەکرد، زۆر ناڕەحەت دەبێت بەوەی دایکی

فرمێسك لە چاوی بێتە خوار، منیش کە وتم مۆسادی ئیسرائیل_یە تەنها بۆ ترسی تۆ بوو، کاك ماکوان هیوادارم بە ڕاستگۆی لێم وەربگریت.

بەردەوام بوو لە قسەکانی.

وتی: کاك ماکوان کۆمەڵگای یەهودی چەند بەشێکە، ئێمە لێرە زۆر بێزارین، بە ئێمە دەوترێت (ئەشکەناس) واتا ئەو کەسانەی یەهودی هاوردەن بۆ ئیسرائیل یان یەهودی وڵاتی ڕۆژهەڵاتن (شەرقن)، یاخود ئەفریقا.

لێرە دا قسەکەم بە رووسا بڕی و داوای مایکم کرد...

وتم: باشە تۆ کە مەسیحیت ئەوانیش خانەوادەی موسڵمانن یان مەسیحین؟ تکایە بە نووسین وڵامم بدەرەوە؟

نووسی نا ئەوان موسڵمانن..

وتم: ئاخر من لەم لوغزە تێناگەم چۆن مەسیحی و موسڵمان لە تەلئەبیب جێگایان دەبێتەوە؟

فەرموو تێم بگەیەنە؟ بۆ تۆ ئازادە/

وتی: کاك ماکوان وانییە لە ناو تەلئەبیب بە سەدان بەناو موسڵمان و مەسیحی تێدایە، هەموو لە ڕێکخراوەکانی ئیسرائیل_ی کاردەکەن بۆ خزمەتی ئیسرائی، بۆ نمونە ڕێکخراوی لیۆن و مۆساد و شەباك و هتد...، ئەمانە تەنها بۆ پارە کاردەکەن تەنها پارەیان دەستبکەوێت، ئیسرائیل وەک عونصور بۆ کاری خۆی بەکاریان دەهێنێتەوە.

لەوکاتە دا من بۆم نووسی کەواتە باوکی تۆ و هاوسەری نوالخان جاسوسی بۆ ئیسرائیل دەکەن؟

نووسینەکەی منی خوێندەوە بەڵام وتی: دوایی وڵامت دەدەمەوە.

بەردەوام بوو لە قسەکانی و وتی: پەلە مەکە ئەویشت بۆ باس دەکەم، بەڵام من ئێستا لە ماڵی نەوال خانم دەیەوێت قسەت لەگەڵ بکات.



نووسیم لە خزمەتیام خۆشحاڵ دەبم.

نەوال خان مایکی گرت و وتی: ماکوان کوڕی خۆم چۆنی باشی خوا عومرد درێژت بکات.

ماکوان گیان پرسیارێکم لێت هەیە، من خۆم نوێژ دەکەم ئایا نوێژەکانم قبوڵە لە ئیسرائیل؟ لێرە هیچ کەس ناناسم بچم بۆ لایان، ئەم جولەکانە زۆر خراپن زۆر دڵتەنگم، من چی بکەم باشە؟

قسە و باس و خۆشەویستی خۆی زۆر دەربڕی و باسی ئەوەی کرد کە ڕۆژانە گوێ لە ئێمە دەگرێت لە ژوورەکە دا، گوێ لە مەلا عومەر چنگیانی دەگرێت لە زاگرۆس، دیارە ئەو کاتە بەرنامەی دەست پێکردبوو لە تەلەڤزیۆن.

ویستم وەڵام بدەمەوە داوای مایکیان لێبکەم، کەچی رووسا وتی ببورە دەبێت بڕۆین، چونکە کاك شەماڵ هاتەوە با گوێی لە قسەکان نەبێت، ئێمە دەڕۆین کاتێکی شاد.

ئەوەندەی تر بێزار بووم، داخۆ بەم کاتە ئەم پیاوە بۆ خۆی کردووە بەم ماڵە دا، چاوەڕێ بووم هیچ دەسەڵاتێکم نەبوو.

بە ناوی باهۆز چوونە دەرەوە نیو سەعاتی پێنەچوو، رووسا بەناوی خۆیەوە هاتەوە سەرخەت، داوای لێبوردنی کرد.

بۆم نووسی ئاساییە رووسا، بەڵام تۆ چۆن هیچ لە دینەکەی خۆی نازانیت و دەڵێیت من مەسیحیم لە کاتێك دا ئافرەتێکی ڕۆشنبیری؟ تۆش بڕوات بە سێیانە هەیە؟ واتا خوا و مەریەم و عیسای کوڕی مەریەم ئەم سیانە بە خوا دەزانیت؟

نووسی ماکوان من هیچ لە دینەکەم نازانم، هەندێک شتی سەرەتایی نەبێت.





نووسیم ئەم جارە مەنووسە ماکوان کاکی پێوەکە خۆ ماکوان لە تۆ نەبووە، زیاتر مەبەستم بوو کە ئەدەب لە نێوان دا هەبێت و بە چاوێکی قورسەوە تەماشای هاوڕێیەتیەکە بکات و ئینجا مەسیحیشە نەدەبوو بە بچووکی من بانگ بکات، چونکە وڵامم نەئەدایەوە، بۆیە بۆم نووسی بە کاك ماکوان بانگم بکە.

نووسی ببورە کاك مامۆستا ماکوان، ئیمۆجی شەرمەزاریەکی دانابوو بۆم.

وتم: کاك بەسە مامۆستاکەم ناوێت.

نووسی ماکوان با قسە بکەین.

نووسیم کوا کاکە ئێستا ئامۆژگاریم نەکردیت؟

نووسی ببورە.

ئەو بانگی کردم بۆ ژوورێک و مایك بە دەستی ئەوەوە بوو وتی: کاك ماکوان بەو خوایە لە تاو بێکەسی و لە ژیانێکی زۆر بێمانا دا دەسوڕێمەوە، لەبەر خاتری دایکم نەبێت ئەم وڵاتەم بە جێدەێشت.

نووسیم دایکت چییەتی؟

وتی: شوی کردووە بە پیاوێکی عەرەبی جولەکەی میسری لێرەن بەیەکەوە.

نووسیم ئەی چۆن شتی وا دەبێت؟

وتی: لە داخی باوکم خیانەتی لێ کردووە.

نووسیم ئەی تۆ لەگەڵ کامیان دەژیت؟

وتی: هیچیان من بۆخۆم ماڵم هەیە، لە هەردووکیان جیام، باوکم ئافرەتێکی ڕووسی هێناوە بەیەکەوە دەژین.

نووسیم جولەکە؟ (چونکە جولەکە شوو ناکەن نە بە موسڵمان و نە بە مەسیحی).



وتی: نا بڕواناکام دینی هەبێت.

نووسیم ئەی تۆ بەرنامەت چییە بۆ ژیان؟

بە پێکەنینەوە وتی: نازانم!ئەی تۆ بەتەمانیت بمهێنیت!

نووسیم نا بەتەمای من نەبیت، چونکە من خێزانی خۆم خۆشدەوێت.

هەستم کرد دەچینە بابی لەغو قسەی بێمانا، بۆ ئەوەی ڕیگای پێنەدەم بۆ هەندێك قسە و باس، ئەوەشم پێووت ئەو ڕۆژە کە ئەو قسەیەت کردووە وتت بمهێنە موسڵمان دەبم، هەر قسەیەکی سەر زارەکی بوو، هیچمان ئەوەندە لە خصوصیاتی یەک گتریمان نەزانیوە، من تۆ ناهێنم لە ئیسرائیل، بەڵام بە دڵنیایەوە دەتوانم برایەکی مرۆڤی تۆ بم وەك هاونیشتیمانییەك هاوکارت بم یاخود هاوڕێیەکی باش بین بەیەکەوە لەسەر بنەمای ڕاستگۆیی هەموو خزمەتێکت پێشکەش بکەم.

خەریکی خوێندنەوەی نووسینەکەی من بوو، بەڵام دەستی کرد بە گریان و وتی ئەی تۆ وەعدت نەداوە من بهێنیت؟

وتم: نەوەڵڵا من بەس وەعدم نەداوە.

ئینجا هەنسکی قوڵی هەڵکێشا و وتی: باشە، شەو شاد.

منیش بۆم نووسی خوا هیدایەتت بدات.

کات شەڕی نێوان فەڵەستین و ئیسرائیل_ە ساڵی ٢٠٠٨ە هەموو بێزارین ڕۆژانە بە سەدان خەڵکی فەڵەستینی شەهید دەبن بە دەستی هێزەکانی ئیسرائیل_ی خوێن ڕێژ.

کاك ئارام ئەحمەد خاوەن ژووری ئۆپۆزسیۆن لە پاڵتۆك کۆڕێکی سازدا بۆ مامۆستا کرێکار لەسەر دڕەندەیی ئیسرائیل و کارە قێزەونەکانی ئیسرائیل، ژوور جمەی دەهات لە خوڵك هەموو چاوەڕێی مامۆستا کرێکارمان دەکرد دەست بکات بە کۆڕەکەی، بەڵی کۆڕ دەستی پێکرد، کۆڕێکی سەرکەوتوو بوو.

منیش لە ژوور بووم لە پڕ بەناوی گوڵی سور پەیوەندیم پێوە کرا، دوای سڵاو وتی: کاك ماکوانم من نەوال_م دەمەوێت قسەت لەگەڵ بکەم.

حاڵەتەکە ئەوەندە قورس بوو ئەوەی ناوی ئیسرائیل بوو ڕقم لێی بوو، چجای ئەوەی کەسێك لە ئیسرائیل_ەوە پەیوەندیم پێوە بکات، ئەو شەوە لەماڵی ئێمە پیاوێکی بەڕێز میوانم بوو هەر زۆر یەکێتی بوو، لەوانە بوو کە دەڵێن خوێنەکەی سەوزە.

وەڵامم دایەوە وتم: ببورە کاتم نییە میوانم هەیە، بە ڕاستیش حەزم بە کۆڕەکەی م.کرێکار بوو ئەو پیاوەش میوانم بوو دانیشتبووین دوو قۆڵی گوێمان لە مامۆستا گرتبوو، حەزم نەدەکرد لە هەندێك تایبەتی من بزانێت، بەڵام کەس نازانێت چۆن خوای گەورە پلان دادەڕێژێت بۆ هیدایەتی کەسێك.

دووجار من یان بانگ کردە ژوورێك من هەر هاتمەوە دەرەوە، هەرچەندە ئەمە لە ناو پاڵتاك دا جوان نییە بێ پرس بانگت بکەن، یان بانگیان کردی لە ژوور خێرا دەرچیت.

من دەرچووم گوێم نەدایە، بەڵام بۆ جاری سێیەم هەر بانگکرامەوە، دیار بوو ئەو چەندین جار منی بانگکرد هەر ئەو سێ جارە من دەستم بە دەعواتەکەی دا نا، کۆتا جار چووم مایکی نەگرت منیش نووسیم لە ژوورەکە دا دەنگ نییە.

دوایی یەکسەر مایکی گرت یەکێك لە کچەکانی بوو وتی: دایکە قسەبکە ئێستا گوێی لێتە.

دەستی کرد بە قسە و وتی: ماکوان باشی ئەو ڕۆژە شەماڵ هاتەوە وەڵامی پرسیارەکانت نەدامەوە باوکی من، ئاڵتونیشم هەیە زەکاتەکەی چەندە باسی کرد کە چەند مسقاڵ زەکاتی لێ دەکەوێت، هەندێك قسە و باسی تر، وتی: ئەوە بۆ دالیات عاجز کردووە.



لەوێدا بۆم ئاشکرا بوو کە رووسا ناوی دالیا_یە بەردەوام بوو لە وتەکانی،

وتی: ماکوان ئەو کچە گوناهە هیوادارم ئاشتی بکەیتەوە، من وەك دایکی خۆت ئەو قسەت بۆ دەکەم.

ئینجا من داخ لە دڵم بەرامبەر بە جولەکە، بەرامبەر بەوەشی موناسەرەی دەکات، کاك حەسەن_یش لە تەنیشتمەوەیە هیچ نازانێت، مۆلەتم لێخواست و وتم: ببورە هەندێك قسە و باس دەکەم لەگەڵ ئەم ئافرەتە دا، بەڵام ئەوەندە تورەم لە ناخی خۆم دا خەریك بوو بە کاك حەسەن_ی بڕێژم، بەڵام میوان بوو، بەس ئەزانم کە دەستم کرد بە قسە زۆر تورە دەبم کە ئەو مایکی ئازاد کرد، ئینجا من مایکم گرت.

وتم: نەوال خان تۆ پێت وایە نوێژ دەکەیت، ئیتر خۆت بە موسڵمان دەزانیت، تۆ کافری و کچەکانیشت کافرن و کاك شەماڵی هاوسەریشت هەر زۆر کافرە، تۆ لە وڵاتێك دەژی خاکی موسڵمانی داگیر کردووە و باسی ئیسلامیش دەکەیت، ڕۆژانە سەدان منداڵی موسڵمان شەهید دەکرێت تۆ باسی زەکاتی ئاڵتونم لێ دەپرسی، جارێ تۆ دەبێت بزانیت بیروباوڕ چییە ئینجا باسی نوێژ بکەیت، تۆ وەلائ و خۆشەویستیت بۆ یەهودە هاتووی باسی چی بۆمن دەکەی خوشکی من، ئاخر هەرکەس خۆشەویستی بۆ غەیری موسڵمانان بوو ئەوا لەوانە و وەك ئەوان هەژمار دەکرێت، ئاخر دایکی من تۆ ئێستا جولەکەیت، هاتووی چی باس دەکەیت بۆ من.

نەواڵ خان جارێ وەڵامی ئەو پرسیارەت ئەدەمەوە کە نەتکردووە، تۆ و ماڵ و منداڵت دەبێت لەم وڵاتە بچنە دەرەوە، باشە ئاخر بۆ ناگەڕێیتەوە بۆ ئەمریکا خۆ ئەگەر موحاربیش بێت خۆ خاکی موسڵمانان نییە بڕۆ لەوێ ئەمانێکت هەیە، چی دەکەیت لە ئیسرائیل_ێکی خوێنڕێژی سەرسەری.




من ئەگەر دڵم بسوتێت، دڵم بۆ شۆڕە کچێکی شاری غەزەی موسوڵمانان دەسوتێ، ئاخر بە رووسا بڵێ من ئەگەر هەر ژن بهێنم ئافرەتێکی موسڵمان دەهێنم، کە لە سێبەری پیاوێکی موسڵمان دا بحەسێتەوە، ئەصڵ و بنچەی بناسم، تۆ کچەکانت فێری ئەوە بکە قسەی بە خەڵك نەڵێن ئینجا پرسیاری ئیسلامەتی بکە.

جا خوشکی من زۆر تووڕەم وازم لێبهێنە بە زۆر بانگت کردم با هەمووی تێك نەدەم بە سەریەك دا، شەود شاد خوات لەگەڵ.

من لە ژوورەکە هاتمە دەرەوە چاوەڕوان ی ئەوانم نەکرد.

کە ئاوڕم دایەوە لەسەر کورسییەکەم، تەماشای کاك حەسەن_م کرد ڕەنگی زەرد ببوو، وای زانی ئێستا ئەو سەر دەبڕم، داوای لێبوردنم لێکرد.

کاك حەسەن: ئەرێ کاك ماکوان ئەوە چی بوو؟

شتێکم بۆ باسکرد و عەرزم کرد خێزانێکن لە ئیسرائیل_ن، هەندێک شتم بۆ باسکرد کە گشتی بوو نەچوومە ناو تایبەتمەندییەکان.

کاك حەسەن: کاك ماکوان من جاروبار لە داخی ئەوەی عەرەب وڵاتی داگیر کردوین، ئیسرائیل_م خۆش دەوێت، ئەوە منیش کافرم؟

وتم: کاك حەسەن ئەوە پێویستە لە بنەڕەتەوە بۆت باس بکەم ئەمە پەیوەندی هەیە بەسەر وەلائ و بەڕایەتی تۆوە.

کاك حەسەن: جا بەخوا من نازانم وەلائ و بەرائەت چییە ماکوان گیان؟

وتم: وەلاء، واتا خۆشەویستی بۆ موسڵمانان، دەبێت هەموو موسڵمانان کە ئەهلی سونەت و جەماعەن خۆشت بوێت، پشتیان بگریت و بە ماڵ و سەروەت و سامانت.

بەڕائەت، واتا بەرائەت بکەیت لە هەرچی دوژمنی خوایە لەسەر ئەم زەوییە بە عەلمانی و جولەکە و مەسیحی و هتد...هەرگیز پشتیان نەگریت..



کاك حەسەن: بەخوا بەو حیساب و کیتابەی تۆ بێت منیش تۆزێک کافرم ماکوان گیان وایە؟

وتم: کاك حەسەن گیان نەخێر ان شاللە تۆ موسڵمانیت، بەڵام تۆزێک تاوانباریت.

ئەمەش مانای وانییە کە وتمان وەلاء و بەڕائەتت هەبێت ئیتر زوڵم نەکەیت واتا دەبێت هەر داتپەروەر بیت، نا_ ناشبێت بۆ نمونە خەڵکێك خاوەنی توانان ئیتر بادام موسڵمان نیین یا دوژمنیش بێت بە ئینسافەوە باسی نەکەیت، بۆ نمونە من شێرکۆ بێکەس شاعیر نییە!دەبێت بە ئینسافەوە ئەوە بڵێین کە بەڵێ یەکێکە لە شاعیرە بە تواناکانی ئەم سەردەمە لە شیعری حداثەدا، پاشان تۆ کە عەلمانیت خۆ ناکرێت من بەرائەتت لێبکەم و قسەت لەگەڵ نەکەم، ڕوونە کاك حەسەن؟

کاك حەسەن: ماکوان تۆ خۆت دەزانیت من هەر یەکیتی بووم تۆش ڕێزت لێگرتووم و لە دەرێشەوە لەگەڵ باوکی ڕەحمەتیت کە پێشمەرگە بووم بەخوا نەمهێشتووە نوێژم بڕوات، بەڵام ئەمەی تۆ باسی دەکەیت ئیسلامێکی زۆر گەورەیە، من وام نەزانی بوو.

تۆزێك دڵم جوڵا ئاتۆ شتێکی ترم بۆ ڕوون بکەرەوە بە خوا زۆر ڕوون نییە.

وتم: کاك حەسەن گیان ئێستا وەك جاران نییە، تێکەڵییەك هەیە لە نێوان کفر و ئیمان دا دەبێت زانایان قسەی لەسەر بکەن، تۆ واز لەوە بهێنە من ئەم شەو تووڕە بووم بە ئارەزووی خۆم ئەو خانەوادەیەم کافر کرد، ئەوە من هەڵەم ئەوە ئیشی من نییە، کافرکردنی خەڵك، بەگشتی کاری زانایانە، کەسی تایبەتیش کە کافر دەکرێت لە ناو ئوممەتی موسڵمان ئەوە کاری قازی موسڵمانانە کە دەست نیشانی دەکات کافرە یان موسڵمانە، وەڵ عەرزم کرد دەبێت ڕوون بکرێتەوە بۆ خەڵکەکە



تێبگەیەنرێت لە غەیری ئایینی ئیسلام هەر ئایین و بەرنامەیەکت هەبێت ئەوا خوا لێت وەرناگرێت و بە کافر هەژمار دەکرێیت، ئەگەر زانی ئەوە خۆی بەرپرسە لە قیامەت، نابێت بێجگە لە دینی خوا و موسڵمانان کەسی تر هەڵبژێردرێت و خۆشی بوێت، بێجگە لە شەریعەتی خوای گەورە نابێت هیچ بەرنامە و ڕێبازێکی ترت هەبێت.

کاك حەسەن: باشە ماکوان گیان تۆ ئیشەکەت لەسەر من قورس کرد من ئەوەتەی هەم مام جەلال_م خۆش دەوێت، ئیتر لەمەو لا چی بکەم یان دەبێت لەمەولا م.عەلی باپیرم خۆشبوێت لە جیاتی مام جەلال؟ وەڵامی ئەمەم بدەرەوە ماکوان گیان ئیتر من هەموو شتێکم بۆ ڕۆشندەبێتەوە.

لەم قسانەیا بووین لەگەڵ کاك حەسەن، رووسا پەیوەندی کرد لە پاڵتاکەوە نووسیبووی، ئەی ئەو کەسەی لەخۆت ڕازیت کاتت هەیە قسەبکەین؟

## رووسا دێت بۆ لام:-

من و کاك حەسەن قسە و باسمان دەکرد، وتی: تەنها ئەوەم تێبگەیەنە من هەموو کوردم خۆشدەوێت، بەڵام تا ئێستا هەستم بەو بەرپرسیارێتییە نەکردووە لە ئیسلامدا، من ئەوەی کە خۆشمدەوێت کار بۆ ئایین ناکات ئایا من کافرم؟

لە خزمەتی کاك حەسەن دا باس و خواسەتەکانم بۆ ڕوون دەکردەوە، عەرزمکرد: مرۆڤ بە سروشتی خۆی خەڵکی خۆشدەوێت، خۆشەویستی فیتری (سروشتی مرۆڤ) جیاوازە لەگەڵ وەلائی بیروباوڕ، تۆ کە تاڵەبانیت خۆشدەوێت دەزانیت کە بۆ ئیسلام کاری نەکردووە، بەڵکو بۆ نەتەوە و حیزبەکەی خۆی کاری کردووە، تۆش ماوەیەك لەگەڵ ئەو حیزبە دا کارت کردووە هەستت بەم بەرپرسیارێتی بیروباوڕە گەورەیە نەکردووە کە وەك ئێستا بۆت دروست بووە.

پاشان ئاساییە ئەگەر وەك خاوەن خەباتێك ڕێزی لێبگریت، تێکۆشانی بەکەم نەگریت، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبیت) ئەبو تالیبی مامی کافر بوو، بەڵام چەندە ڕێزی دەگرت و چەندە خۆشی دەویست (خۆشەویستی فیطری بوو مامیەتی)، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبیت) لە هەموومان زاناتر بووە بە ئیسلام، کاتێك کە موتعیم_ی کوڕی جوبەیر کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێبیت) خستە جیواری خۆی (پاراستی لە دەستی قورەیشییەکان) دوای ئەوەی لە جەنگی بەدردا پێغەمبەر (دروودی خوای لێبیت) فەرمووی ئەگەر موتعیم بمایە لە بەدر دا کوژرا بوو لە موشریکەکان بوو، ئەوا ئەو داوای بکردایە ئەو ٧٠ دیلەم لەسەر قسەی ئەو ئازاد دەکرد واتا موتعیم، مرۆڤی موسڵمان دەبێت خاوەنی وەفاش بێت، بەڵام لە ئیسلام دا کێت خۆشویست وەك وەلائ و

خۆشەویستی ئەوە لە قیامەت لەگەڵ ئەو کەسە دا حەشر دەکرێیت، جا من بۆخۆم پیاوانی ئەم دینەم خۆشدەوێت، تۆش دەبێت پیاوانی ئەم ئیسلامەت خۆشبوێت ئەمە وەلائە، بەڕائەتیش واتاکەی ئەوەی کە نەفی هەرچی بیروباوڕە بیکەیت بێجگە لە موسڵمانان، ئەمە ڕاستی ئەم ئیسلامەیە.

کاك حەسەن بەخوا خەڵك ئێستا ئایینی وەك کارێکی سادە وەرگرتووە بڕوابکە هەموو ژیانی مرۆڤ بەندە بەم خواناسییەوە، هەر هەڵەیەك تێیدا بەرەو هەڵدێرت دەبات، خوا هەروا بەبێ لێپرسینەوە دروستی نەکردوین بە بێهودەش نەهاتووین بۆ ئەم ژیانە.

کاك حەسەن سەری داخستبوو بیری لە قسەکانی من دەکردەوە.

منیش ئاوڕم دایەوە بەلای کۆمپیوتەرەکەم دا تەماشام کرد رووسا نووسیبووی چۆن ئەو خانەوادەیەت ئەمشەو دا بەیەک دا، شەماڵ زۆری لە نەوال خان داوە بە پەلە بردویانە بۆ خەستەخانە.

خێرا پەیوەندیم کرد بە رووساوە، بردمە ژوورێك و وتم: مایك بگرە چی بووە بۆم ڕوون بکەرەوە؟!

_رووسا نووسی ببورە کاتم نییە دەبێت بڕۆم.

هەستم دەکرد بۆ ئیزعاج کردنی منە، دیسان مایکم گرتەوە وتم: من وەك ئێوە لە ئیسرائیل مرۆڤ کوژ نیم هیچ نەبێت هەواڵێکی تەندروستیم بدەرێ؟

کاك حەسەن بە دیارمەوە دانیشتبوو دەستی خستبووە ژێر چەناگەیەوە چاوەڕوان بوو بزانێت چی ڕوویداوە.

وامزانی هەڵدەستێت دەخەوێت، بەڵام دیار بوو مەوزوعەکەی بەلاوە خۆش بوو قاچی کۆکردەوە لەسەر کورسییەکە و لەسەر کورسییەکە بە چوار مشقی بۆی دانیشت.



رووسا مایکی گرت وتی: نازانم چیت بە نەوال خان وتوە کە شەماڵ_ی هاوسەری هاتۆتەوە، بووە بە دەمەقاڵەیان ئیتر شەماڵ_یش لێیداوە و بردویانە بۆ خەستەخانە.

نووسیم ئەی وەزعی چۆنە؟!

وتی: کچەکەی لێرەیە هاتووە بۆ لای من با بۆت باس بکات.

کچەکەی زۆر بەئەدەبەوە سڵاوی کرد و دەستی کرد بە قسەکردن.

وتی: کاك ماکوان لەدوای ئەوەی جەنابت تورەبویت، دایکم حەپەسابوو کاتێك باوکم گەڕایەوە بۆماڵەوە، دایکم بردی و ژوورەکەی خۆیان، ئەوەندەم زانی بە باوکمی دەوت جاسوس، جاسوس بە دەنگی بەرز.

باوکیشم زۆری لێدا دەرگاکەش داخرابوو، من و بێریڤانی خوشکم هەر هاوارمان کرد دەسەڵاتمان نەبوو، بەڵام باوکم لە دوای نیوسەعات دەرگای کردەوە دایکمی بە باوشەوە بوو بەپەلە بردیە ناو سەیارەکە و من و خوشکەکەشم لەگەڵی دا ڕۆشتین، دوایی وتم بابە چی بووە؟!

وتی: لەگەڵ دایکت بووە بە شەڕمان.

ئێستا خوشکەکەم لەلای دایکمە و باوکیشم منی هێناوە بۆلای رووسا و خۆی چووە بۆ ماڵەوە.

من داوای مایکم کرد، مایکیان ئازاد کرد.

وتم: خوشکی من ئەی دایکت وەزعی چۆنە؟ باشە نازانیت هۆکارەکەی چی بوو؟ باشە من چۆن بتوانم هەواڵێکی دایکت بزانم؟ دەمەوێت قسەی لەگەڵ بکەم.

کچەکەی نەوال: نا کاك ماکوان شکور وەزعی باشە، باوکیشم زۆر خەفەتی خوارد هەستمان دەکرد پەشیمانە.

ژمارە تەلەفۆنەکەی دایکی دامێ وتی دەتوانی قسەی لەگەڵ بکەیت.

شەو درەنگ بوو منیش لەبەر کاك حەسەن پەلەم بوو، دەوروبەری سەعات ٣ی شەوی ئێمە بوو، ئیتر خوا حافیزیم کرد لە پاڵتۆك هاتمە دەرەوە، بەڵام کاك حەسەن زوو زوو دەیوت: ماکوان گیان من خەوم نایەت!مەوزوعەکەی بەلاوە خۆش بوو، جێگام بۆ داخست خەوتین.

بۆ بەیانی ویستم تەلەفۆنی بۆ بکەم سبحان الله هەستێکی زۆر عەجیبم بۆ دروست بوو، هەرچی دەمویست تەلەفۆن بکەم بۆ ئیسرائیل وام دەزانی دەرزی دەکەم بە دڵی خۆم دا، هەرچی دەستم نا بە ٠٠٩٧٢ هەر نەمدەتوانی لەوە زیاتر بڕۆم، بۆیە تەلەفۆنم بۆ نەکرد.

کات ڕەحمی بەکەس نەدەکرد تا ماوەی چەند مانگێك ئاگام لێیان نەما، پاشان زوو زووش کاك حەسەن تەلەفۆنی دەکرد، هەواڵی دەپرسین، ئەوەندەی ئەو پەرۆش بوو من لەبیرم نەما بوو.

ماوەیەکیش ئاگام لە کاك حەسەن نەبو ڕۆژێکیان تەلەفۆنم بۆ هات کاك حەسەن:کاك ماکوان دێم بۆ لات بۆ نەرویج، ئەو لە شاری یۆتۆبۆری لە سوید دەژیا.

منیش زۆر بە خۆشحاڵیەوە عەرزمکرد یاخوا بەخێربێیت، چونکە یەکێك بووە لە پێشمەرگە دڵسۆزەکان لەگەڵ باوکم دا لەبەر حورمەتی باوکم زۆر ڕێزم لێدەگرت و ئەویش باوکی منی زۆر خۆشدەویت.

لە وێستگەی قیتارەکە چاوەڕێی بووم خوایە کاك حەسەن هەر دانەبەزی، سبحان الله...کاك حەسەن دابەزی ڕیشی لەسەر سنگی بوو بە شەڕواڵێکی جوانی کورت و سیمایەکی ئیسلامی جوان هەر خەریك بوو شاهگەشکە بم.

باوەشمان کرد بەیەك دا وتی:با سێ چارەکە بێت سوننەتە.

لە ڕێگاوە هاتین بەرەو ماڵ وتی:کاك ماکوان تۆ لەمن شارەزا تریت بۆ ڕیشت درێژ نییە؟



منیش بۆ خۆشی هەموو گیانم پێئەکەنی وتم: بە ڕیش نییە بە ئیشە.

وتی: أستغفرالله برام ئەوە قسەی جاهیلەکانە، خەریك بوو بکێشێت بە دەمما.

وتم: بۆ خۆشی بوو..

کاك حەسەن: براکەم کوا لە ئیسلام دا سوعبەت لەسەر عیبادەت دەکرێت.

بەهەرحاڵ من هیچم نەوت، چونکە بە تەمەن زۆر لەمن گەورەتر بوو، دوای دانیشتین و نان خواردن عەرزم کرد کاك حەسەن گیان ئەم ئیلتیزاماتەت چۆن بۆ دروست بوو؟ بەڕاستی زۆر خۆشحاڵم.

کاك حەسەن: کاك ماکوان دوای ئەوەی ئەو شەوە لای تۆ ڕۆیشتمەوە و توڕەبونەکەت لەو ئافرەتە و قسەکانت زۆر کاریگەر بوون لەسەرم، لێت ناشارمەوە، کە ئەو هەموو کتێبەم بینی لە ماڵەکەی تۆ کە من بیرم دێت تۆ بە چ ڕۆژێك لە دایك بوویت، هەستم دەکرد قسەی زۆر جوان و ئیسلامیانەت دەکرد، وتم باشە من چیم نوقسانە لە کوڕی عەبدولکەریم.

ڕۆژێك چووم بۆ مزگەوت، لە مزگەوت کوڕێکی کوردم بینی ناوی م.عەبدولحەمید بوو..(دوایی بۆم ڕوون بوویەوە ئەو مامۆستا بەڕێزەم دەناسی ماوەیەکیش من لە خزمەتی دا بووم)، وتی ئەویش وەك تۆ خنی بە مێشکم دا ئیتر لەو ڕۆژەوەی لای تۆ ڕۆشتووم هەر بۆ خۆم خەریکی لێکۆڵینەوەم لەم ئایینە.

زۆر خۆشحاڵیم بۆ دەربڕی و سوپاسی خوام کرد لەسەر ئەو نیعمەتی ئیسلامە کە بەخشیویەتییە جەنابی، بەڵام زوو زوویش ئەیووت ئەی خوا نەواڵ خان چی بەسەرهات!

شەوێك وانەم هەبوو لە ژووری دیدی نوێ باسی سیرەی بۆن خۆشی پێغەمبەرم (دروودی خوای لێبیت) دەکرد، رووسا لە ژوور بوو گوڵی دەنارد

بۆم، کە قسەکانم تەواو بوو، وتی ئەمەوێت چەند دەقیقەیەك قسەت لەگەڵ بکەم، عادەتەن ئەگەر ببوایە بە پرسیار و وەڵام لە ژوورەکەدا کاتی زۆرم دەبرد.

وتم: ئیشەکەت چییە؟ چەند دەقەیەك دێمە خزمەتت و دوایی دەچمەوە خزمەتی ئەو خەڵکە بەڕێزانە، چاوەڕێم دەکەن.

وتی: باشە.

بانگم کردە ژوورێك و بۆم نووسی فەرموو مایك بگرە.

مایکی گرت و وتی: ماکوان دەمەوێت بێم بۆ ئەوروپا هاوکاریم دەکەیت؟

نووسیم ئاخر من ناتوانم بە قاچاخ بتهێنم.

وتی: نا من پاسپۆرتم هەیە، بە ڕسمی دێم، بەڵام من دەتوانم بێمە لەندەن، ماڵی خاڵم لە کۆنەوە لەوێن ئەتوانین لەوێ یەکتر ببینین؟

منیش پەلەم بوو بۆ ژوورەکە و وتم: باشە هەرکاتێك هاتم بۆ لەندەن دێمە خزمەتتان لەوێ یەکتر دەبینین.

رووسا زۆر خۆشحاڵی دەربڕی و وتی: ماکوان ماڵی نەوال خان بۆ ماوەی دوو مانگە چونەتەوە بۆ ئەمریکا.

زۆرم پێ ناخۆش بوو کە دەیووت ماکوان، بەڵام هیچم نەووت و زۆر خۆشحاڵ بووم بەو هەواڵە.

نووسیم شەماڵ_یش گەڕاوەتەوە لەگەڵیان؟

وتی: شەماڵ_یش گەڕاوەتەوە.

وتم: دوای بابەتی ژوورەکە قسەدەکەینەوە من دەبێت بڕۆم بۆ ژوور.

ماڵئاواییمان کرد و هەردووکمان هاتینەوە ژوورەکە و ئەو چاوەڕێی دەکرد من تەواوبم و قسەبکەینەوە.



دوای ئەوەی لە ژووری دیدی نوێ لە باس و سیرەی پێغەمبەرمان(دروودی خوای لێبیت) تەواو بووم ماندووییم حەسایەوە.

پەیمانم دابوو لەگەڵ رووسا قسەبکەم، گەڕامەوە بۆلای چاوەڕوانی من بوو، بانگم کردە ژوورێك و مایکم گرتوو وتم گوێت بۆ دەگرم بە مەرجێك کە نەڵێیت ماکوان، ئەبێت بڵێیت کاك ماکوان_ی براگەورەم، ئەوە مایك ئازادە وەرە قسەبکە.

رووسا دەستی کرد بە قسە و بە منی وت: ئاخ بەس بمزانیایە تۆ لە چی درووست بوویت، نە هەستت هەیە، نە ئەتەکێت دەزانی لەگەڵ ئافرەت قسەبکەیت، باشە توخوا ماکوان تۆ قەت لەگەڵ ئافرەت قسەت کردووە؟ یان چۆن خۆشەویستی ئەدەیت بە خێزانت؟ بەس پێم بڵێ تۆ چیت؟ هەست و شتی وا هەیە لە گیانت دا؟

ئاگام لێبوو بە برینداربیەوە ئەو قسانەی دەکرد قورگی پڕببوو لە گریان.

وتم: خەمی خێزانمت نەبێت، ئەگەر هیچی بۆ نەکەم ئەزانێت کە چاوباز و خیانەتکار نییم، بڕوا بکە ئافرەتیش ئەوەی بەسە، وتم: تۆ باسێکی خۆتم بۆبکە ژیان چۆن دەگوزەرێت لەو کافرستانە خوێنمژانەی ئیسرائیل؟ (من هەمیشە ئیسرائیلم لەبەر چاو ناشرین دەکرد) مایکم بۆ ئازاد کرد.

وتی: ماکوان زۆر بێتاقەتم، نازانم چییە کە قسە لەگەڵ تۆ دەکەم هەست بە ئارامی دەکەم، بەڵام حەز دەکەم دەردە دڵێکت بۆ بکەم، من نازانم کچی کێم ڕۆژێکیان ئەم دایك و باوکەی کە ئێستا هەمە شەڕیان بوو، دایکم بە باوکمی وت: ئەی پیسترین مرۆڤ تۆ هەر ئەوە بوویت دالیات لە باوکی کرد و لەبەر سەروەت و سامانەکەی بردت بۆ خۆت.

من حەپەسام و هەموو گیانم ببوو بە گوێ.

داليا واتا (رووسا): زۆرم کرد لە دايکم هەر وەڵامی نەدامەوە، زۆرم هێنا بۆ باوکم هەر وەڵاميان نەدامەوە.

دايکم: لە تورەيدا ئەم قسەيەمان کردووە، بەڵام من نەچوو بە مێشکم دا، سەفەرم کردەوە بۆ سلێمانی لە ساڵی ٢٠٠٥ چوومەوە گەڕەکی خۆمان، ئەو ماڵانەی کە تێيدا ژيابووين لە گەڕەکەکەمان دا چوومەوە لای دراوسێکانمان لە نزيك موڵکەکانی حەمەی ئەورەحمان ئاغا لە مەڵکەندی چوومە لای پياوێکی بەڕێزی خەڵکی شاری سلێمانی پرسياری کەس وکار و ئەو ماڵە مەسيحييەم کرد کە منيان بەخێوکردووە وتی ماڵيان لای ماڵی کەريمی ئەلەکەوە بوون، باسی ئەوەی بۆ کردم کە باوکی من بە دۆلارەوە لە بەغداد لە ساڵی ١٩٨٢ ئعيدام کراوە، ئەم ماڵەش زياتر خزمەتی باوکی خۆميان کردووە نزيك بوون لە باوکمەوە دوای لە سێدارە دانی باوکم هەر ئەمان منيان بەخێوکردووە دايکيشم بەسەر منەوە گيانی لەدەست داوە، باوکم پياوێکی دەوڵەمەندی شاری سلێمانی بووە، بەڵام هەموو سەروەت و سامانەکەمان بە وەکالەتێکی عامە ئەم باوکەی تێستام کردوێتی بە ناوی خۆيەوە، بەڵام دريغيان لە من نەکردووە بۆ هاوکاری، دوو پورم هەبوون چووم بۆلايان ئەوانيش هەر بەدوای پارەوە بوون، کوڕی پورێکم هەر خەريك بوو بە ئاشکرا لەبەرچاوی دايکی دەستدرێژيم بکاتە سەر تا تورە بووم، ئيتر هەستم کرد سلێمانيش جێگای منی تێدا نابێتەوە، گەڕامەوە بۆلای دايك و باوکە مەسيحييەکەم کە هيچ نەبێت منيان بەخێوکردووە هەستێکم بۆيان هەيە، دڵم بە براکەم خۆش بوو کە کوڕی ئەوانە و هيچی من نييە.

من بۆم نووسی ئەی کە گەڕايتەوە چيت کرد باسی ئەو حاڵەتەت بۆ کردن؟ کە لەگەڵ تۆ ئەنجاميان داوە، ئەم ژن و پياوە مەسيحييە؟



وتی: ئاخر ماکوان خۆ ئەوان پیاوەتیان کردووە، من کە زانیم خیانەت نییە ئیتر بۆ لەخۆمەوە تورە بم، ئەگەر لای پورەکانم بوومایە ئێستا لەوانە بوو شەڕەفم بشکایە.

قسەکەی مەنطقی بوو، من گوێم گرتبوو نووسیم ببورە فەرموو بەردەوام بە.

وتی: ماکوان دەمەوێت بێم بۆ بەریتانیا لەوێ لەگەڵ خاڵۆژنم قسەم کردووە لە کۆمپانیایەکی تەلەفۆن دامەزراوم لەوێ کارم وەرگرتووە.

نووسیم ئەی ئەوان خاڵی ئەصلێتن؟

وتی: بەڵێ، من ڕۆژی یەك شەمە دەچمە فڕۆکەخانەی ستاندستێد لەوێ دادەبەزم.

زۆر بە خۆشحاڵییەوە باسی دەکرد واتا ئەو ڕۆژە سێ شەممە بوو.

داوای مایکم کرد مایکی ئازاد کرد و وتم: کچی باوکم تۆ کەی مەسیحیت تۆ موسڵمانیت، بۆ وازت لە ئایینی خۆت هێناوە، تۆ بەڕاستی خوشکی منیت، ئیتر دەشڵێیت ماکوان قبوڵمە سەر سەر و سەرچاوم (تەبعەن بە پێکەنینەوە)، دالیا گیان ئەگەر پێت خۆشبێت من ئەو ڕۆژە بە چەند برایەکی خۆمان دەڵێم لەوێ بێن بە دەمتەوە هەرچیت پێویست بوو ئەوان لە خزمەتتدا دەبن.

هەڵبەت دوایش تەلەفۆنم بۆ ئەو برایانە کرد خوا هەڵناگرێت زۆر پیاوانە هاتن بە دەممەوە، شەو درەنگ بوو منیش ماندوو بووم خواحافیزیم لێکرد.

وتم: ئەم ئایەتەلکورسییە لەبەربکە زۆر باشە هەرچی هاتە ڕێگات ئەتپارێزێت، بە دەنگی سەعد غامدی بۆم نارد وەعدم لێوەرگرت، کە بچێت خۆی بشوات، شایەتومان بهێنێت، پەیمانی دامێ بە خۆشییەوە هەردووکمان ڕۆیشتین، خۆشترین ڕۆژی ژیانم لەو ساڵە دا.

رووسا گەیشتە بەریتانیا، منیش خەریکی بلیت بڕین بووم.

ماوەی ئەو چەند ڕۆژە پەیوەندیم هەر لەگەڵ رووسا نەپچڕاند، لە ڕێگای خوشکێکەوە لە تۆڕی پاڵتۆك کە یەکێك بوو لە خێزانی مامۆستا بەڕێزەکان تەکلیفم کرد کە هەندێك شت هەیە فێری رووسا_ی بکات، چونکە ئافرەت لە هەندێك ڕووەوە خاوەنی پێداویستی تایبەتە پێویستیشە هەندێك شت هەیە ئافرەت خۆی ڕۆشنی بکاتەوە بۆ یەکتری.

لە لەندەن پەیوەندی بە منەوە کرد و وتی: ئێستا لە ماڵی خاڵمم.

وتم: تەلەفۆنەکەتم بدەرێ با ئەگەر هەر پێداویستیەکت هەبوو لە خزمەتاندابم، ژمارەی تەفۆنەکەی نەدامێ.

وتی: لە پاڵتۆکەوە پەیوەندیمان هەر دەبێت، منیش کە نەیدا دووبارەم نەکردەوە.

دوای چەند شەوێك هاتە سەرخەت ئاگاداری کردمەوە کە دەستی کردووە بە کارکردن.

وتی: پێدەچێت من بگوازرێمەوە بۆ جێگایەکی تر دوور لە لەندەن، ناوی شەریکەکەشی وت ئەگەر هەڵە نەبم (پۆس مۆرس) بوو، ئەوەندە گرینگیم پێ نەدا چونکە هەستم کرد سوپاس بۆخوا ئاسوودەیە.

دوای ئەوەی پەیمانم دابوو بڕۆم بۆ ئەوێ لەگەڵ خێزانم بە دوای بلیتی هەرزان دا دەگەڕاین، بۆ ئەوەی بەرەو لەندەن بڕۆین، قەدەری خوای پەروەردگار وابوو بلیتمان دەست نەکەوت، پێشترین لە زانکۆیەك لە بەریتانیا خەریکی خوێندن بووم واتا لەوێ وەرگیرابووم بە موراسەلە دەبوو هەر بچومایە بۆئەوەی هەندێك کاری ڕۆتینات هەبوو بمکردایە، بەهەرحاڵ من سەرقاڵ بووم بە کاری ڕۆژانە و خوێندنی خۆمەوە هەر لە نەرویج و پاشان ئاگادار کرابوومەوە بۆ بحث و ئیمتیحانات دەبێت بگەڕێمەوە بەریتانیا، چونکە سەرەتاش بوو ئەوەندەم بەلاوە گرینگ نەبوو، بەڵام

خێزانم زۆر حەزی دەکرد خوێندنەکەم تەواو بکەم لە بەریتانیا پێشتریش زۆر هانی ئەدام.

ڕۆژێکیان لە پۆلیسی شارەکەی خۆمانەوە تەلەفۆنێکم بۆ کرا وتیان ماکوان کەریم ئەتوانی تا پۆلیس بێیت؟

وتم: باشە، نزیك بووم لە فەرمانگەی پۆلیسەوە چووم.

کە چوومە ژوورەوە کابرایەکی زل ئەگەر بتبڕیایەتەوە ٤ کەسی وەك منی تێدابوو، هات بە دەممەوە بە گەرمی تەوقەی لەگەڵ کردم و وتی: ماکوان کەریم ئێمە وەك نەرویج هیچمان لەسەر نییە، خۆشمان تێناگەین ئەمە چییە و چۆن کێشەیەکە، تەبعەن من هەر تێنەدەگەیشتم مەوزوعەکە چییە.

وتی: لە سەفارەتی بەریتانیاوە هاتوون دەیانەوێت قسە لەگەڵ تۆ بکەن.

وتم: کێ هاتووە؟

وتی: نوێنەری سەفیری بەریتانی.

هەر زۆر کارەکە گەورە هاتە بەرچاوم، دەستبەجێ لە دڵی خۆم دا وابیرم کردەوە وتم: حەتمەن موخابەراتی ئیسرائیل_ی ئیزعاج بووە بەم کارەی من و پاشان چاودێری من کراوە کە لەگەڵ ئەم کچە قسەم کردووە، یان دایك و باوکی رووسا سکاڵایان لێکردووم ائیتر سەد جۆر بیرکردنەوەی خراپم بۆهات لەم کاتە دا، ئەوەندەی پێ نەچوو نوێنەری سفیر هات بۆلام موتەرجیمێکی نەرویجی ئینگلیزی لەگەڵ بوو نوێنەری موخابەراتی نەرویجی و پۆلیسی نەرویجیشم لەگەڵ دانیشتبوو.

وتم: بەخوا کێشەکە زۆر گەرەیە، بەڵام زوو زوو نوێنەری پۆلیسەکە وەك دڵخۆشی بۆمن ئەیوت: ماکوان ئەم کێشەیە ئیلاقەی بە نەرویجەوە نییە.

وتم: کێشەکە چییە؟!

وتی: ئەوان بۆت باسدەکەن.

نوێنەرەکە دەستی کرد بە قسەکردن و وتی: کەریم مەبەستی من بوو، ئێمە وەك حکومەتی گەورەی شاهەنشاهی بەریتانیا ڕازیمان نییە بێتە وڵاتەکەمانەوە!هەواڵمان بەدەست گەیشتووە کە تۆ کەسێکی چالاکی ئیسلامی و خەڵك کۆدەکەیتەوە، لەبەر ئەوە بۆ ئاساییشی وڵاتی بەڕیتانیا خراپە و شکاتت لێکراوە نابێت بێیتە وڵاتی ئێمە، زەرفێکی دامێ پڕ بوو لە وەرەقە وتی: ئەمە کێسەکەتە، لەسەر چی و بۆچی ناهێڵین بێیت....

پەیوەندیم کردەوە بە کاك مەلا عومەر (عومەر عەلی) کە خوێندنەکەم نەفەوتێت.

وتی: باسی مەکە ئەم قەزێیە تۆ لە زانکۆ وەرگیراوی، ئەوەی کە پێویست بە تۆ بکات من بۆت دەکەم، لە سوید لە مالمۆ ئەم زانکۆیە نوێنەریان هەیە لەوێ دەتوانی تاقیکردنەوەکان بکەیت، باسی یاسایەکی ستودێنتی بۆ کردم تێنەگەیشتم بەو یاسا بەریتانییە دەتوانن بەردەوام ببم لە خوێندن.

ساڵی ٢٠٠٩ یە، بەڵام کاك عومەر عەلی پەیمانی لێوەرگرتم تا خوێندنەکەم تەواو نەکەم باسی ئەم کێشەیە لای کەس نەکەم، منیش باسم نەکرد، تەنها چەند کەسێك دەیزانی کە دەخوێنم لە بەریتانیا، لەوانە خێزانم و کەسوکاری خۆم نەمدەهێشت بزاندرێت، هەندێکیش لە هاوڕێ و ئەو دڵسۆزانەی خۆم دەیان زانی کە لە بەریتانیا (مەمنوع دخوڵ) واتا بۆم نییە بڕۆمە ئەو وڵاتە.

سوپاس بۆخوا بە هاوکاری کاك عومەر عەلی توانیم سەرکەوتن بە دەست بهێنم بە پلەی ئیمتیاز لە لێکۆڵینەوەکەم لەسەر مێژووی شەریعەت بوو، بەسەرکەوتووی بەکالۆلیۆس_م بەدەستهێنا، کاك مەلا

عومەر وتی ئەتوانیت ماستەرەکەشت بخوێنیت، بەڵام هەر بە بێدەنگ هەتا بحثەکان پێشکەش دەکەیت، ئەوەی کاك عومەر عەلی فەرمووی هەموویکم کرد تاکو ماستەرەکەشم بەسەرکەوتووی و پلەی ئیمتیاز تەواو کرد.

کە نامەکەم کردەوە کە لەلایەن نوێنەری بەریتانیاوە هاتبوو، نوسرابوو لە کاتێکدا تۆ هاتوویت بۆ بەڕیتانیا خەڵکی زۆرت لێکۆبۆتەوە ئەمە جێگای سەرنجە بۆ ئێمە، پاشان کۆڕت گرتووە لە لیدز و لە کاردیف و لە لەندەن و لە بێرمنگهام خەڵکی زۆر هاتوون کۆبونەوەت بە خەڵکی کرووە!ئێمەش هەواڵمان پێگەیشتووە کە تۆ خەریکی دروستکردنی ڕێکخراوێکی ئیسلامی توندڕەویت.

ئەمە هەموو کێسەکەی من بوو.

پەیوەندیم کرد بە رووسا وە کە ئەوە حاڵەتەکەی منە، بڕوای نەکرد، منیش زۆر گوێم پێینەدا، وا هەستم دەکرد سکاڵاکە لەلایەن ئەوە بێت ئینجا هەستم بۆ دروست بوویەوە کە موخابەراتە، کێشەکان لای ئەوەوە بۆم دروست بووە.

پەیوەندیم کرد بە برایەکەوە لە بەیتانیا کە پارێزەرێکم بۆ دابین بکات بۆ ئەوەی ئیستنافی ئەو مەوزوعە بکەم، چونکە من هیچ شك نابەم ئەوەی ئەوان باسی دەکەن بەڵگەشیان نییە و هەمووی قسەی بێمانایە.

دوو پارێزەرم دەست کەوت هەردووکیان هەتنە ناو کارەکەوە، لە کۆتای دا ئەوەمان دەستکەوت کە ئەوانەی سکاڵایان لەسەر من تۆمار کردووە کوردن و بۆ مەرامی حیزبی خۆیان بووە وایان زانیوە من لە حیزبەکانی ئەوان دەبم بۆ خۆم، ئینجا بۆم دەرکەوتەوە هیچ پەیوەندی بە رووسا_وە نییە.

پارێزەرەکەم هاواڵێکی خۆشی بۆهێنام و وتی ئێمە دوو پارێزەرین یەکێکمان کە دەچێتە ناو کێسەکەتەوە جارێکی تر قسە لەگەڵ تۆ ناکاتەوە، لە ناوەوە دیفاعت لێدەکات، چونکە ئەوان کەسان ئاشکرا ناکەن کە سکالایان لەسەر تۆۆ تۆمارکردووە، ناڕاستەو خۆ لەسەر مەوزوعەکەی تۆ قسەدەکەن بڕیاریش ئەدەن!پاشان وتی یاسایەك خراوەتە بەردەم پەرلەمانی بەریتانیا لەسەر ئەم کێسانە، ئەو کەسەی کە سکاڵای ئەمنی تۆمار دەکات، ئەگەر بەڵگەی نەبوو دەبێت ڕووبەڕووی تۆمەتبارەکە ببتەوە، ئەگەر چاوەڕێی ئەوەش دەکەیت ئەوە ساڵێك بۆ دوو ساڵی پێدەچێت، منیش بۆ ئەوەی بزانم ئەو گەندەڵانە کێن تا ئێستاش چاوەڕێی ئەو یاسایەم، پەلەی چییە ئەم ساڵ نا ساڵێکی تر، لە دوایی هەر بۆم ئاشکرا دەبن خۆ ئەگەر ئاشکراش نەبن سوپاس بۆ خوا قیامەت هەیە.

من ئەم حاڵەتەم بەسەر هات، بەڵام سوپاس بۆ خوا هەر بە سەرکەوتوویی هاتمە دەرەوە لێی، لە دوای ئەم ڕەوشەی کە بەسەر من دا هات لەم ماوەی ڕابردوو دا لە فەیسبووك کەسێك لە ئەمریکاوە پەیوەندی بە منەوە کرد وتی: ماکوان گیان من نەوالم، ئەزانی چووم بۆ حەج و شوکر بۆ خوا لەگەڵ شەماڵ عەمرەیەکیشمان کردووە، ئەی رووسا چی لێ بەسەر هات کەوتووەتە کوێ؟

مەجالی زۆر قسەم نەبوو لەبەر ئەوەی لەسەر کار بوو ناوەکەم لای خۆم یاداشت کرد، بەڵام دوایی ئەو هەر نەهاتە سەرخەت، ئەوەندەش گرینگ نەبوو بەلامەوە، چونکە دڵخۆش بووم بەوەی کە خێزانێکی بەختەوەرن.

من گەڕامەوە بۆ کوردستان بەتەنها واتا بێ ماڵ و منداڵ، دایکم وتی ڕۆڵە (خەسرەو) ناوی ئەسڵی خۆمە ئێستا ڕۆژگار کورتە زوو بگەڕێوە بۆ ماڵ ئیشم پێتە.



منیش لە دوای نوێژی عەسر زیاتر لە ئۆفیس دادەنیشتم سوبحان الله ئەو ئێوارەیە لە هەموو ڕۆژەکان لای من قەرەباڵغتر بوو هەموو فەیسبوك لای من بوو.

دایکم تەلەفۆن لەسەر تەلەفۆن بۆم دەکات و نازانم مەوزوع چییە و ئەم هەموو پیاوە بەڕیزەش لای منن، دوای ئەوەی میوانەکان ڕۆشتن تەکسیم گرت بەرەو ماڵەوە ئەو ڕۆژەش هیچم نەخوارد وتم حەتمەن دایکم خواردنی بەدەستی خۆی درووست کردووە دازانێت من حەزم لە نانی دەستی خۆیەتی بۆیە بانگم دەکات، چوومە ماڵەوە نە بۆنی خواردن دەهات نە هیچ، دایکم فەرمووی ئەی ڕۆڵە نەمووت زوو بگەڕێوە؟

وتم: بەخوا میوانم هەبوو، ئەوەندەم زانی جەماعەت هەموو هاتن لە خوشك و خوشکە زا و زاوا و برا و برازا.

وتم: مەوزوع چییە؟

دایکم وتی: وەڵلا هیچ نییە مەطعەمێك هەیە تۆ ئەقڵت بەو جێگایانە ناشکێت ئەمانەوێت بتبەین بۆ ئەوێ.

وتم: کوێیە؟

وتیان: ناوی داوا_یە.

خێزانێکم بەدی دەکرد هەر تەماشای منیان دەکرد، لە دڵی خۆم دا وتم حەتمەن لە تەلەفیزیۆن منیان بینیوە، بەڵام هەستم دەکرد سەرنجی زۆریان ئەدا من هەر ئاسایی وەرمگرت.

پێشرەوی برام هات وتی: کاکە ئەزانی ئەو عائیلەیە تەماشای تۆ زۆر دەکەن لە ئاسایی دەرچووە، منیش بە فشقیات بە پێشڕەوم وت ئاخر کاکت قۆزە بۆیە.

وتی نەوەڵلا تۆ بڕۆ سەر کورسیەکەی من خۆی لە جێگای من دا دانیشت ئەو لە ڕووی ئەمنییەوە لە من وریاترە، منیش بەقسەم کرد.

تۆزێکی پێچوو یەکێك لەو بەڕێزانەی کە لەوێ کاری دەکرد هات و وتی: کاك ماکوان پارەی ئێوە دراوە، ئێمەش زیاد لە ١٢ کەس بووین زۆرم پێ ناخۆش بوو، چونکە یەك نەفەریش لەو مەطعەمە بە ٢٥ هەزار دینار بوو، زۆر بێمانا گران بوو.

وتم: برای باوکم کێ داویەتی؟

وتی: ئەو خانەوادەیە.

کە هەڵسام بچم بۆ لایان چایان دەخواردەوە من دەستم چەور بوو، چونکە قبوڵم نەکرد، وتم بە پێشڕەو و ئارامی زاوامان بڕۆن پارەکە بهێننەوە و بیاندەنەوە.

چوومە خزمەتیان گوێم لێبوو خانمێکی نازداری زۆر جوانی دەم و چاو جوان کە بەرەو ڕویان دەڕۆشتم پێدەکەنی.

وتی: بەخوا ماکوان هات.

منیش سڵام لێکردن، وتم: بەخوا قبوڵم نییە، لە ئێستاوە دەبێت وەریبگرنەوە ئەگینا هەر مەرحەباشتان ناکەم یان بەس پارەی من بدەن.

پیاوێکی زۆر مەعقول وتی: کاکە ئێمە چاوەڕێی تۆین بڕۆ نانەکەت بخۆ دوایی قسە دەکەین.

تەبعەن ئەو مەطعەمە ئوتێلیشە، ئەوان هەڵسان یەکێکیان وتی کاك ماکوان لە میوانخانەکە چاوەڕێتین، ئەو جێگایە زۆر فاخر بوو دوای ئەوەی تەواو بووم یەکێکیان نارد بە شوێنم دا وتیان لە میوانخانەکە چاوەڕێتانن، منیش لەگەڵ ئامینە خانی دایکم و جەماعەت ڕۆشتین.

لای من زۆر قەرەباڵغ بوو دەنگی منداڵ و قیڕەیان ئەو ئوتێلەی کرد بوو بە حەمام من و پێشڕەوی برام و هەردوو زاواکەم چوین بۆلایان ئەوان بەخێرهاتنی گەرمی منیان کرد.



وتم: کاکە پارەکەیان بدەنەوە عەیبە، دوایی بیرم کردەوە وتم لەوانەیە مەسولێکی گەندەڵبێت، لەم ڕێگەیەوە بیەوێت پەیامێك بگەیەنێت.

دانیشتم لەگەڵیان ئەو خانمە جوانە کە لە تەمەنی دایکم دا بوو ڕەحمم چووە سەری هەر پێدەکەنی.

وتی: ماکوان ڕۆڵە من ناناسیت؟

وتم: نەخێر!

وتی: من نەوال_م، کاك شەماڵ_یشم بینی و دەستمان کرد بە قسە چوون بۆ لای دایکم و سڵاویان کرد و دانیشتین، کاك شەماڵ ومن و نەواڵ خان و ئەو خێزانەی تریش بەیەکەوە بووین، پاشان هەواڵی رووسام پرسی.

وتم: دالیا لە کوێیە چی بەسەرهات و ئێستا چۆنە؟

وتیان: شوی کردووە بە کوڕێکی خەڵکی سلێمانی و دوو منداڵی هەیە یەکێکیانی ناوناوە بە ماکوان و ئەوەی تری ناوناوە لانە، واتا کچ و کوڕێکن.

وتم: چۆن پەیوەندی پیوە بکەم، ژمارە تەلەفۆنەکەی دامێ ژمارەی کوردستان بوو.

وتیان: خۆی و هاوسەرەکەی لە یەکێك لەم کۆمپانیای تەلەفۆنەکانی کوردستان کار دەکەن ماڵیان لە کازێوەیە.

وتم: بۆ زانیاریتان چەند ساڵە من لە سلێمانیم بەخوا نازانم کامە کازێوەیە، ئێستاش من بە سلێمانی پاڵاس دەڵێم حەسیب ساڵح.

دەستیان کرد بە پێکەنین و قسەوباسی زۆرمان کرد، ئەخیرەن پارەکەیان دا منیش تەلەفۆنم کرد بۆ رووسا خاتون هەواڵم پرسی و وتم: دەمناسی من کوڕی خۆتم ماکوان_م گەورە بووم.

دەستی کرد بە پێکەنین و وتی: ماکوان گیان تۆ نوری چاوی منی، وەی کە خۆشحاڵم تەلەفۆنت کردووە دوای قسەوباس و هەواڵ پرسین دایە دەست مێردەکەی ناوی کاك بەڕیز بوو، بەڵام بەڕاستی بەڕێز بوو، پەیمان





درا کە یەکتر ببینین، دەوامی بەردەوامی ئەوان و سەرقاڵی من یەکترمان نەبینی من گەڕامەوە بۆ نەرویج ئێستا ئەوان لە کوردستانن.

## چیرۆکی نۆزدەیەم
## باس و خواسی ناو سەیارەکەی پێشڕەو

لە دوای ئەوەی دەرچووین من خەیاڵ گرتبوومی پێشڕەو_ی برام وتی: ئەوە چویت بۆ کوێ؟ وا خەیاڵت ڕۆیشتووە دەمێکەیە ئاگات لە من نەماوە، قسەت بۆ دەکەم.

وتم: لەو دەوروبەرە و ئەوڕوپا بووم ئەوە گەڕامەوە بۆ لات، بەیان زۆر شتی بیرخستمەوە پێشڕەو_ی برام، نیوەی ژیانی خۆمم بە فیلم بینیەوە.

پێشڕەو: ئەزانی بەیان شووی تری کردووە، دوای ئەوەی مێردەکەی تەڵاقی دا، ئێستا خێزانی ئەو کوڕەی ڕەفیقی خۆتە، کاك مەزن.

وتم: بەڕاست!وەڵاهی ژیان سەیرە، یاخوا ئاسودە بن و پیر و دڵخۆش بن بەیەکەوە.

پێشڕەو: بڕۆین بۆ کوێ؟ حەزدەکەیت بڕۆین بۆ سەرقەبران سەردانی باوکم و باپیرەکانمان و نەنکەکانمان بکەین؟

وتم: ئەرێ وەڵڵا زۆر باشە زۆریش حەز دەکەم.

ڕۆیشتین تا چووینە گردی سەیوان و چوینە سەر گۆڕی باوکم و دوعای سەرقەبرانم خوێند و سڵاوم کرد لە مردوان و لەسەر قەبری هەموویان دوعای خێرمان بۆ موسڵمانان کرد و بەتایبەتیش بۆ کەس و کارمان.

لەگەڵ پێشڕەو_ی برام کەوتینە قسە.

پێشڕەو: بۆ ئێستا وەك جاران ڕووداو دروست نابێت، ئەم گەنجانەی ئێستا وەك جارانی ئێمە نین.

جاران ئێمە و پێش ئێمەش لە ژیانمان دا ڕووداوی زۆر ڕووی ئەدا و دەمانگێڕایەوە، بەڵام ئەم جیلە هیچیان نییە بیگێڕنەوە.

وتم: ئەم ڕەوەندە نوێیە بونەتە ڕۆبۆت بەدەست سیاسیەکانەوە، پاشان تەکنەلۆجیای سارد و سڕی فەیسبوك و تۆڕەکانی دیکەی ناو ئینتەرنێت هەمووی تەمەڵ کردوون، مەشغولن بەو تۆڕانەوە هەموو مێژوویان بووە بە فەیسبوك و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانی تر ئەوە هۆکاری ئەوەیە کە ڕووداو لە ژیانیان دا ڕوونادات.

پێشڕەو: ڕاستە، بەڵام دەبێت ئاوا بڕوات بەم شێوەیە، خەڵك ئیتر مێژووی نامێنێت و هەموو ون دەبن.

وتم: نا بەدڵنیایەوە دەبێت چاکەکاران سەرلەنوێ ئەدەبیاتی ئەم کۆمەڵگایە بکەنەوە گۆڕانکاری ڕووبدات، ئەم قسە و باسانەمان هەمووی لەسەر گۆڕستانەکە بوو.

پێشڕەو: چی بکەین بڕۆینەوە؟

وتم: با بڕۆین.

هاتینە خوارەوە لە سەیوانەوە بەرەو شەهیدان، سەردانی هەندێك گۆڕی ترمان کرد.

تەماشامان کرد ژنێك لە نزیکی دوو گۆڕەوە دانیشتووە دەستی لەسەر کێلی دوو گۆڕ داناوە دەگری بەدەم گریانەوە دەیانلاوێنێتەوە.

دەڵێت بۆ کامتان بگریم بۆ لای منتان چۆڵ کردووە بچمە لای کێ و کێ بەهاوارمەوە بێت.

ئێوارەیەکی سارد و ڕەشابایەکی زۆر قاییم هەبوو، وتم پێشڕەو بابچینە لای ئەو ژنە و فاتیحایەك بۆ مردووەکانی دادەخەین و دڵنەواییەکی دەکەین.



پێشڕەو: کاکە بۆ خاتری خوا ئێستاساڵی نەوەدەکان نییە، دنیا گۆڕاوە بانەچین نەوەکو پێی ناخۆش بێت، حەقمان چییە بەسەرییەوە_ کاکە ئەمە جاران نییە.

وتم: ئێ باشە دەچین بەلای دا خۆ هیچمان لێ کەم نابێتەوە بڵێین بۆخۆت خۆشبیت، مەگری و دوعای خێریان بۆ بکە و لە جیاتی ئەو لاواندنەوەیە فاتیحایان بۆ دابخە.

پێشڕەو بە نابەدڵی وتی: با بڕۆین.

وردە وردە نزیك بووینەوە لە ژنەکە و ڕەشەبای سلێمانیش ئەوەندەی تر ماندووی کردبووین، چووینە نزیکی پشتی لێمان بو من سڵاوم لێکرد و ئاوڕی دایەوە کە من و پێشڕەو_ی بینی وتی: سوپاس بۆ تۆ خوایە کورەکانم گەڕانەوە، سوپاس بۆ تۆ خوایە کوڕەکانم گەڕانەوە.

منیش زۆرم لا سەیر بوو دڵم نەشکاند، زانیم حاڵەتێکی ئاسایی نییە وتم: بەدڵنیایەوە ئێمە کوڕتین.

ژنەکە تۆزێك ورد بوویەوە لە من و پێشڕەو_ی برام هیچی نەووت دووبارە گریایەوە بێ هیچ شتێك منیش دڵم پڕبوو، ئەوەندە بە کوڵ گریا منیش بە گریانی ئەو تێر گریام.

پێشڕەو: خۆ تۆ هاتی دڵنەوایی بکەیت کەچی خۆشت دەگریت.

ژنەکە تەمەنی ٥٠ ساڵ دەبوو سەراپای ڕەش بوو، دەموچاوی سور بووەوە لە سەرمان دا، ئەوەندەگریا بوو لەسەر ڕوومەتی جۆگای فرمێسك دیار بوو.

دەستم کرد بە خوێندنی قورئان لەسەر قەبرەکان و چەند ئایەتێکم خوێند لە سورەتی واقیعە.

دوای تەواو بوونم دوعای خێرم کرد و عەرزی ئەو ژنەم کرد ئەمانە چیتن؟

ژنەکە: وەڵا باوکەکەم ئەمە هەردووکیان کوڕمن و باوکیان ئەوەتا لەو پشتەوە کوڕێکی تریشم مردووە وا لای شێخ مارفەوە(٢) ناشتومانە.

وتم: ئەی ئێستا لەگەڵ کێ دەژیت؟

ژنەکە: لە ماڵی زاوایەکم دوو ڕۆژە دەریکردووم، وتی مەیەرەوە بۆ ئێرە بچۆ بۆ مالی کچەکەی ترت، دوێنێ شەو لەوێ بووم زاواکەی ترم دەیوت بۆنت لێدێت.

ئیتر من ئەوەندەی تر گریام، ژنێکی زۆر پاك و جوانیش بوو ئاگام لە پێشڕەو بوو ئەویش دڵی پڕببوو.

ئینجا هەردووکمانی خستە گریان.

ژنەکە: کە لە دوامەوە سڵاوتان کرد، لەوکاتە دا بیرم دەکردەوە ئەمووت خوایە هەردوو کوڕەکەم بۆ زیندوو بکەیتەوە، ئێوەش لە دوامەوە پەیدا بوون، وامزانی کوڕەکانی خۆمن و خەریك بوو باوەشتان پێدا بکەم، بەڵام نائومێد بوومەوە، ئێوەش هەر کوڕمن بە قوربانتان بم.

من و پێشڕەو بەو قسەیەی ئەو بەکوڵ گریاین خێرا وتمان: بە دڵنیاییەوە کوڕتین.

وتم: ئەی چی بکەین ئێستا چیت دەوێت بۆت بکەین؟

ژنەکە: وەڵلا باوکی من هیچم ناوێت، بەس خۆشی ئێوە.

پێشڕەو: نابێت دایکە گیان خۆ هەروا لێرەدا بە جێتناهێڵین، فەرموو هەستە بابڕۆین بۆ ماڵی ئێمە لە خزمەت دا دەبین، من و کاکم و دایکمین ماڵێکی گەورەمان هەیە لە خزمەتا دەبین.

وتم: بێزەحمەت ناوت چییە دایە گیان؟

ژنەکە: ناوم مینایە.

وتم: میناخان ئاخر خۆ ناهێڵین لەم سەرقەبرانە ئاوا دانیشیت، بەدڵنیایەوە ئەتبەینەوە بۆ ماڵی خۆمان.



میناخان: ئاخر باوکی من دەچمەوە بۆ ماڵی ئەو کچەم، خۆ دەزانم ئەوان لێم ناپرسن بچم یان نەچم، بەڵام هەر حەزدەکەم لەوێبم.

وتم: ئەم کوڕانەت بەچی وافاتیان کردووە؟

میناخان: بە ڕووداوی هاتووچۆ لە یەك ڕۆژ دا لەناو سەیارەیەکدا وەرگەڕان هوردووکیان، باوکیشیان مۆزەفی کارەبا بوو کارەبا گرتی، کوڕە گورەکەشم گورچیلەی وەستا.

دوو کچم هەیە شویان کردووە شکور بۆ خوا لە ماڵ و مێردی خۆیان دان، بەڵام زاواکانم زۆر خراپن.

هەستم دەکرد ناهەق نەبوو لەگەڵ دوو کوڕدا بۆ کوێ بچێت ژنێکی ئاوا بە تەمەنیشی هەبێت هەر دەترسێت.

پێشڕەو: ئەی کێ هاوکاریت دەکات؟

میناخان: خوا گەورەیە کاکەگیان، خوا پەکی کەس ناخات.

هەڵمانساند لەگەڵ خۆمان دا هێنامانە خوارەوە و وردە وردە بۆ لای سەیارەکەی خۆمان کەوتینە ڕێ بەدەم قسەکردنەوە بانگی مەغریبیدا.

میناخان باسی ئەوەی بۆ کردم لە بازیان خزمی هەیە پییان وتوە ژوورێکت ئەدەینێ وەرە لەوێ بژی، ژوورەکە زۆر کۆن و خراپە منیش بێجگە لە تەقاعودی مێردەکەم هیچی ترم نییە، ئەویش بە چەند مانگ جارێك ئەمدەنێ.

میناخان نەهات لەگەڵمان دا بۆ ماڵی ئێمە، بردمانەوە بۆ ماڵی کچەکەی و نزیکی ماڵەکەیان دامانناو عەرزی کرد هەر چۆن بووە دان بەخۆی دا بگرێت لەم ڕۆژانە دا سەردانی دەکینەوە.

لە سەیارەکە دا لەگەڵ پێشڕەو باسی ئەوەمان کرد کە هەرچیمان کردووە ئەو ژوورەی بۆ چاك بکەین و مانگانەیەکی بۆ ببڕینەوە...!



هاتینەوە بۆ ماڵەوە ئەو شەوە من میوانی زۆرم هەبوو لە خزمان هەموو هاتبوون بۆ ماڵمان کە گەڕاینەوە دایکشم باشی کرد بە من و پێشڕەو، هەر نەیدەبڕیەوە.

وتم: بەخوا توشی ژنێك بووین ئەمە حاڵ و گوزەرانی بووە خوای گەورە کردی یەکێک لە میوانەکانم دەوڵەمەندێکی باش بوو وتی داینێ بۆخۆم مانگانەکەی لەسەر من بێخەمبن.

من و پێشڕەویش وەعدی چاککردنی ژوورەکەمان بۆ دا کە بەم نزیکانە دەچیتە ناوی و هەموو کەرستەیەکی بۆ دابینکراوە.

لەم کەین و بەینە دا من نەگەڕابوومەوە بۆ ئەوروپا زاوایەکی هاتە لام وتی من ناوم بێستونە حەزدەکەم بەیەکەوە قسەبکەین.

وتم: فەرموو.

هەندێك دەردە دڵی قەیرانی بۆ کردم و سوپاسی زۆری دەربڕی و وتی حەز دەکەم سەردانێکمان بکەیت.

وتم: باشە، بەسەرچاو.

کە چووم تەماشای ماڵەکەیم کرد مامۆستابوو تەلەفیزیۆنی فرۆشتبوو، سەلاجەی نەمابوو، ئەڵقەی پەنجەی خۆی و خێزانەکەی فرۆشتبوو، بەو سەرمایە زۆپا و نەوت لە ماڵی دا نەبوو، خاوەن سێ منداڵ بوو.

وتی: کاك خەسرەو ئەوە حاڵ و گوزەرانی منە، من خزمی سەرهەنگم.

کە وتی خزمی سەرهەنگم ئای چ برینێکی کولاندمەوە.

## ئەو ئافرەتەی کە لەسەر جادە هەڵمگرتەوە:-

لە دوای ئەوەی بێستون باسی ئەوەی کرد کە گوایە خزمی سەرهەنگ_ە منیش سەرهەنگ_م زۆر خۆشدەویست، باسی ناسینی سەرهەنگ_م کرد و بەڵام وتم پێش ناسینی سەرهەنگ ئافرەتێکم ناسی لەسەر شەقامەکانی سلێمانی دوای باسی سەرهەنگ_ت بۆ دەکەم، هەردووکیانم بە بۆنەی سەروپێوە ناسی.

سەرەتای پایز بوو خەیاڵ چواردەوی پێچابووم باسی سیاسی وڵات و کێشە کۆمەڵایەتییەکان جەختێکی زۆریان خستبوە سەرم بۆیە هەمیشە لە دەروازەی خەیاڵ دا دەژیام ۳۱ی ئاب ڕووی دا بوو یەکێتی چووبونە سەر سنورەکان.

کاتێ کە پیاسەم دەکرد حەزم بە تەنیایی دەکرد کاتێ چووم بۆ کار بە هەمان شێوە هەر کاتێك وەنەوز بیگرتمایە کەچی خەیال لێنەدەگەڕا و هەمیشە کۆنترۆڵی هەست و بیری کردبووم.

زۆرجار واهاستم دەکرد نەخۆشییە، بەڵام کەسایەتی خۆم باش دەناسی بۆیە ترسم نەبوو هەر ئەو خەیاڵ و بیرەم دەگەڕاندەوە بۆ کێشە سیاسییەکانی وڵات، بیرەکەشم زۆر سادە بوو خەیاڵ و بیرکردنەوەم تەنها دەسوڕایەوە کە چۆن بتوانم ژن بهێنم و چۆن منداڵ درووست بکەم وە بیرم لە دروستکردنی خانوی جوان و دەوڵەمەندی و زۆر جار ئەو خەیاڵەم سەری دەکێشا بۆ ئەوەی ببمە سەرکردەی وڵاتێك.

تا وڵات ئازاد بکەم و خۆشی و شادی لە کوردستانە بێ نازەکەم بڕوێنم زۆرجاریش دەبوومە دەوڵەمەندی هەموو دونیا و وا بیرم دەکردەوە کە

مۆنۆپۆلی دەوڵەمەندی جیهان بکەم، تا ئازادی و یەکسانی بۆ هەژاری دەستەبەر بکەم، هەمیشە هەژارانم خۆشدەویست بۆیە لە خەیاڵیشمدا هەر پشگیری هەژارانم کردووە چونکە وەك کورە هەژار پەروەردە کرابووین، ئەگەر چی سوپاس بۆ خوا هەر پارەدار بووین.

ئەم خەیاڵانەم تابلۆیەکی ڕەنگاو ڕەنگی دروستکردبوو هەمیشە بیرم لە شتە جوانەکانی ئەم بوونە دەکردەوە ماڵی خۆش، ژنی جوان، ئۆتۆمبێلی کەشخە، بەرگیشم شیك بێ وە خۆشترین بۆنیش بەکاری بهێنم وە هەمیشە حەزمکردووە چڵە گوڵێك بم لە گۆزەی نیشتیمان دا خزمەت بە خەڵکی هەژارانی کوردستانە بێنازەکەم بکەم.

هۆکاری ئەو هەمووە خەیاڵ پڵاوییە دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی لە ماوەی ڕابردوو دا زۆر خراپەکار بووم، دوای سوپاس بۆ خوا گەڕامەوە بۆ لای خوای پەروەردگارم، بەڵام نێوانی من و باپیرم و کەسوکارم بەهۆکاری خراپی خۆم تێکچوو بوو هاوکارییان نەدەکردم.

هەر لە نێوانی ئەو ساڵانە دا کێشەیەکی سیاسی ڕووی دا لە نێوان دوو دەسەڵات داری وڵات دا بۆ لەناو بردنی یەکتری پەنایان بردبووە بەر بەها ڕەوشتییەکانی ئەم جیهانە.

تا وایان لێهات کوڕنوشیان برد بۆ دوژمنەکانیان تا بتوانن بینا سازی نیشتمانی خۆیان بکەن بە دەستی داگیرکەران بۆیە لە ناو نیشتیمان دا نا ئومێدی ڕووی کردبووە خەڵکەکە و هیچ گومانێکی باش لەو دەسەڵاتدارانە نەدەبیندرا.

زۆربەی ڕۆشنبیران و دەسترەنگینەکان لە وڵات هەڵهاتن تاکە شاڕێگای خۆیان بۆ دەربازبوون نەك لە کوردستان، بەڵکو لە ژێر دەساڵی ئەو دوو زلهێزە کە زۆریان دوور کەتنەوە و هەڵهاتن بۆیە هەر ئەو خەیاڵانە لای من دروست ببوون بیرم لەوە دەکردەوە کە چۆن بتوانم بژیم و

دەستەبەری سەرمایەیەك بکەم بە ڕێگایەکی چاك تا لە پاشەڕۆژدا ویژدانم سانا و ئارام بێت وە پێش ئەوە بەرامبەر بە خودای خۆم.
دوو هۆکاری گرنگ پاڵی بە مەنەوە دەنا کە خۆم بپارێزم.
یەکەمیان: بیرکردنەوە لە پاشەڕۆژ و قیامەت و گەڕانەوە بۆ لای خوای پاك و بێگەرد.
دووەم: ترسی کۆمەڵگا و قسەوباسیان، لەبەر ئەوەی کۆمەڵگاکەی ئێمە زۆر حەزیان لە قسەوباسە یان جوانتر بڵێم زەم کردن زۆر بە بێڕەحمانە کە لە هیچ بەهایەکی مرۆڤانە ناترسن بە ئارەزووی خۆیان وشە هەڵدەبەستن و وەك ئەندازیار چین لەسەر یەك نەخشی بۆ دەکێشن.
لە ڕاستی دا دەوڵەمەند بوون لە وڵاتی ئێمە دا زۆر ئاسانە تەنها پێویستت بە خۆبردنە پێشەوەیە واتا ماستاوچێتی یان دزییەکی لێپرسراویانە بەو دوو هۆکارە دەتوانیت سەرمایە زۆر بە باشی کۆبکەیتەوە ئەوەش جێگای خۆشییە کە من هەرگیز بیرم لەوە نەکردۆتەوە وە خەیاڵیشم ئەوەی لێ قەدەغە کردووم.
ڕۆژێك خەیاڵ لەگەڵ جەستەم ڕێککەوتن پرۆتۆکۆلێکیان ئیمزا کرد کە لە پاشاگەردانی وڵاتدا من بتوانم سودێك وەربگرم، بەڵام کێشەیەك هاتە ڕێگامان ئەویش نەبوونی سەرمایەیەکی ئەوتۆ تا بتوانم کارە خەیاڵییەکەم لە پراکتیک دا ئەنجام بدەم، بەڵام خەیاڵ و جەستەم پاڵیان بە ڕۆحمەوە نا کە بچم بۆ قەیسەری نەقیب بۆ لای حاجی عەزیز خەیاڵەکەم بۆ باسکرد لە بەرئەوەی هاوڕێی باوکم بوو منی زۆر خۆشدەویست وە زۆرجار لە مزگەوتیش یەکترمان دەبینی و زۆر بەگەرمی هەواڵی خیزانەکەمی دەپرسی کە باسەکەم تەواو کرد ئەوەی لە بیرما گەڵاڵە ببوو هەموو ئەگەرەکانیشم پێ وت لە هەمووشی گرینگتر ئەوە بوو کە پێم وت من پارەم نییە و هیچ سەرمایەیەك شك نابەم لە ئێستا دا ئەوەم پێڕاگەیاند کە

پارەکانم گیراوە لە کاریتر دا، لە ڕاستیش دا هیچم نەبوو، عەرزم کرد بۆیە هاتووم بۆلای تۆ کە یارمەتیم بدەی خوا هەڵناگڕی یەکسەر وتی: باشە.

بەڵام پێی وتم خەسرەو گیان من و تۆ لەگەڵ پارەکەم دەبین بە سێ شەریك.

زۆر سەرسام بووم ئەوکاتە زانیم وە تێگەیشتم کە مرۆڤ و پارە لەیەك ئاستا ئاماژەیان بۆ دەکرێت پێم وت حاجی خوا هەڵناگرێت خۆ ئەگەر من و تۆ بکەرین لە کارەکە دا، بەڵام سەرمایەکەت تەنها ئامرازێکە.

وتی کوڕم تۆ نازانیت دەبێت ڕیزی پارە زۆر بگریت، تەنانەت لە خۆشمان زیاتر ئەگەر وانەبێت (یەغنیش و گەلوش کەفشتەییت) لێدەردەچێت.

وتم: ئاخر بۆ حاجی گیان وەڵڵا خوا ڕابەرداری نییە.

حاجی عەزیز: خەسرەو گیان ئەگەر وا بیر لە پارە دەکەیتەوە من وشەی بەشەکەم هەڵدەگرمەوە من سەرمایە نادەمە دەست کەسێك کە لە خۆم مندالْ تر بێت و یاساشم بۆ دابنێت، من یاسا بۆ تۆ دادەنێم وە تۆش دەبێ بڵێیت باشە، سەیری ڕەشەی حەماڵ بکە ئەبینی چۆن لای کۆپانی حەماڵییەکەیەوە خەوی لێکەوتووە سەیری پێڵاوە لاسیکەکان و گۆرەویە دڕاوەکانی بکە کە بۆنی ڕۆژە ڕێیەك دەڕوات، ئەو خاوەنی پارە نییە و حەماڵە، بەڵام حاجی عەزیز لە ناو دوکانەی خۆی دا دانیشتووە و توجارە هەرگیز وەکو ئەویشم پێناکریت خۆ ئەگەر هەر بیریشم پێ نەکرێتەوە ئەوا بە دەیانی وەك تۆ بیرم بۆ دەکەنەوە، لەو کاتە دا پارەکەم یارمەتی من دەدات لە دونیاش دا هەروا بووە هەرکەس دەستی یارمەتی بۆ درێژ کردی دەبێت ڕێزی لێبگری منیش نامەوێ بە پارەکانم بێوەفا بم بۆیە پێت دەڵێم تۆ بەشێك، من بەشێك، پارەکانم بەشێکی تر.

رازیت خەسرەو گیان یان نا؟

بەڵی حاجی گیان ڕازیم بۆیە دەڵێم سوپاس بۆ خوا بەس نییە بیرم بۆلای سوو سەلەم دا ناڕوات ئەوەش هەروا بمێنێتەوە بە ڕاستی کارێکی باشە و بەسەدان مرۆڤی وەکو منیش دەتوانێ سودتان لێوەربگرێت، خوای گەورە تەمەند درێژ بکات ئەگەر پارەکانیشت حەڵاڵە هەروەك تەمەنی خۆت بەرەکەتیان تێبخات، چۆن من نزام بۆ تۆ کرد تۆش نزا بۆمن بکە بەیانی دەکەومە ڕێ بە پشتیوانی خوای پاك و تەنها تا کارەکەم ئەنجام بدەم زۆر دڵخۆش بووم کوتمە ڕێ.

دوای کڕینی ئەو پێداویستیانەی کە نەخشەم بۆ کێشابوو هەموویم لە مەرزی باشماخ دەستەبەر کرد، لەگەڕانەوەم دا باجی دەرامەت هەڵگیرا بوو واتا گومرك نەبوو بەهۆی ئەو پاشا گەردانییەوە کە ڕووی کردبووە وەڵات لە ساڵی ١٩٩٦ دا.

هەموو کاڵاکانم لە بازاڕ دا فرۆشت زۆر دڵخۆش بووم زۆر لەوە زیاترم دەست کەوتبوو کە بە خەیاڵیشم بیرم لێنەدەکردەوە، تەنانەت ڕۆژێك لە ڕۆژان نە خۆم نە خانەوادەکەم وە نە باپیرە گەورەشم بە هەموومانەوە نەمان توانی بوو بە یەکجاری کەسابەت ئەو سەرمایە کۆبکەینەوە.

زۆر سوپاسی خوام کرد، بێجگە لەوەی کە حاجی عەزیز و مامە باپیرەی برای هەریەکە بەشی خۆیان برد بە هەر جۆرێك بوو کە پارەکە دابەشکرا من بە تەنها خۆم بووم بە خاوەنی چڵ هەزار دیناری تەواو، زۆر دڵخۆش بووم خێرا کە چاوم بە پارەکەی خۆم کەوت پێش هەموو شتێك حەزم کرد کە ئاواتە زۆر گەورەکەم بهێنمە دی کە بریتی بوو لە کڕینی بەڕازیلییەك بە ٣٠ هەزار دینار، چونکە سەیارە بۆ من زەروور بوو سومعەش بوو ئەو کاتە.

لە دوای گەیشتن بە هیواو ئاواتەکەم بەیانییەکیان زۆر ئارەزووی سەروپێکەی عوسمان_ی خولە سینەیم دەکرد زۆر دەمێك بوو تامەزرۆ

بووم خۆ خواردنی سەروپێی بەر بەلەدێکە، هەر ئەو شەوە خەوم پێوە دەبینی حەزم دەکرد زوو بانگی بەیانی بدات نوێژەکەم بکەم و بڕۆم هەر بیرم لە زمانەکەی و مۆخ و تریت و ئاوەکەی دەکردەوە با جارێ کیپە و شیلاوەکەی لەولاوە بوەستێ.

لە پڕ گوێم لە چریکەی الله اکبری مزگەوتەکان بوو، چاوم لە جریوەی زەردەخەنەی بەری بەیان و ئەستێرە و شنەبایەکی فێنك کە لە گوێژەوە بەرەو گڵەزەردە ڕەوی دەکرد، گوێم لە گمەگمی کوکوختی سەر عەمودە بێ کارەباکانی سەر شەقامەکان بوو، دەنگی پێی خەڵکی تاکە تاکە بەرەو ماڵی خوا بە هێدیش وتنەوەی بانگ بەدەم خۆیانەوە، جارو باریش جیکەجیکی چۆڵەکەی عەجول، داگیرساندنی گیزەی سەماوەر و هەمووی کۆنسێرت و ئاواز و گۆرانیان تەپچڕی بۆ جوانکەنای ژیان و خۆشەویستی مرۆڤەکان.

هەر لەوێوە سەدای الله اکبر و سرودی یەکتاپەرستی لەو کازێوە وە ڕێژنەی دەکرد هەموو دڵەکان ئارام بوون، چونکە ڕووە و خوا وەستابوون ئەو گزنگە لە بەرە بەیانی جەژن دەچوو، بۆیە بە زەردەخەنە هەڵسامەوە و تۆزێك ورتە ورتم کرد لەبەر خۆمەوە وتم ڕاستە دەڵێن: هەر دەوەنە دەبێ بە دارستان، هەر خەیاڵیشە دەبێتە ڕاتسی بۆیە شیعرێکم بیرکەوتەوە زۆر پێکەنیم بە تێکستی ئەو شیعرە وتراوە (خەیاڵی ژێر لێفەی گەرم بەتاڵە تا ڕەنجێك نەدەی گەنجێك مەحاڵە).

چوومە بەردەم بەرمیلە کون کوناوی حەوشەکەی ماڵی نەنکم دایە گەورەم بە سابونی ڕەقی کونەکانی گرتبوو، دەستنوێژێکی پڕ ئارم و پڕ دڵخۆشی و بە نزایەکی زۆرەوە گرت، دەنگێك لە پشتمەوە هات وتیان: دەست بە ئاوەوە بگرە ئاومان نییە ئاو مەبڕێنەوە تا دوو ڕۆژی تر سەرە

ئاومان نییە، ئەنکم بوو وتی: سورە گیرم خواردووە ئەوەندە ئاو دەبڕینیتەوە، منیش باشەیەکم بۆ کرد و بە ناچاری وتم: بەسەرچاو.

هاتە لام و وتی: بۆ کوێ بەم بەیانییە زووە وا ئەوەندەش بە زەوق و شەوقی؟

بۆم باسکرد کە ئەم شەو خەوم بە سەروپێ وە بینیوە لە دوایش دا مەنجەڵێك بۆ ئێوە دەهێنمەوە دەستی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و نزای بۆ کردم بەرماڵەکەی داخست و دەستی کرد بە نوێژکردن ئەگەر بەهەڵە دا نەچوبێتم تا یەك چارەك هەر نییەتی دەهێنا و نوێژەکەی بۆ دانەئەمەزرا.

ئەو بەیانییە ئارامە لە دوای نویژکردنمان بەرەو شەقامی تووی مەلیك کەوتمە ڕێ، فێنکی ئەو شەقامە و بۆنی گوڵ و خونچەکانی سەمایان لەگەڵ ئاورینگی گیادا دەکرد، لەنجە و بۆنی گوڵە دەمەشێرەکانیش وەك بڵندگۆ شنەی خۆشەویستیان دەپرژاند، هەموو ئاوازی دەم بە پێکەنینی نیشتیمانێکی جوان بوون، وەك کچێکی بەناز چۆن پرچی خۆی شانە دەکات و یاری بە تاڵی بسکی دەکات ئاوا ئەو شەقامە نازی بەسەر من دا دەکرد.

هاتم تا لای کەلاوەکەی ماڵی تەڵاخانی ژنی شێخ لەتیف، شەبابم لە دەرەوە بینی هاواری کرد و وتی: خەسرەو_ە سور دەوەرە بۆ لام.

کە چوومە لای زانی من حەزم لە دەنگی دیلانە لاوانەوەیەکی بە دەنگی خۆی و شیعرەکەی مەحوی و بە ئاوازی دەنگی دیلان بۆ وتم بە نەرمی دەیووت (لە ناکەس کاریا خاکم بەسەر ڕۆی بەبا عومرم)...

منیش بێ دەنگ ببووم وە گوێم لە قسە خۆشەکانی گرتبوو لە پاشان دا داوای لێکردم کە پاکەتێك جگەرەی بۆ بکڕم.

وتم: شەباب گیان بەسەرچاو سڵاوێکی سەربازیانەی بۆکردم و پارچەیەك نانی دامێ وتی بیخۆ با برسیت نەبێت، لێم وەرگرت و خێرا

خواردم ماڵئاواییمان لە یەکتری کرد من لەلای فولەکەی کاوەی ئاسنگەر پەڕیمەوە بەرەو لای فولکەی شێرەکە ڕۆشتم.

لەو نزیکانە گوێم لە دەنگی گریانێکی بە کوڵ بوو زۆر بە کەیلی دەگریا دەنگێکی مەلوول ئەو دەنگە کەساسە سەرنجی ڕاکێشام هەرچی خۆشییەکانی ئەو بەیانییە هەبوو هەمووی لە گیانمدا راو نا لە راستیدا نەموێرا بچمە لای، بەڵام هەستم کرد کە دەنگی ئافرەتە لەو بەری شەقامەکە، پیاوێکی بەتەمەنی لێبوو دیار بوو پاسەوانی ئۆتۆمبێل و دوکانەکانی ئەو ناوچەیە بوو لە دورەوە لە پاسەوانەکەم پرسی خاڵۆ ئەو ئافرەتە بۆ دەگری؟

پیاوەکە: نزیکەی نیوسەعات زیاتر دەبێت ئەو ئافرەتە لەوێدایە دەگری بەڕاستی بۆتە جێگای گومان لەلای من هەر بۆیە نەم ویستووە بچمە لای گومانی ئەوەم هەبووە لێی، من بە هەڵەدا بەرن و زەرەرێك بەو ئۆتۆمبێل و دوکانانە بگەیەنن، من پاسەوانم بیانەوێت بێئاگام بکەن و لە پشتەوە دزیم لێبکەن تۆ خۆشت دەزانی من بەرپرسم لە کارەکەی خۆم وە گریانەکەشی جێگای گومانە.

کە دەگریا زۆر بەزەییم پێیدا هاتەوە وتەکانی ئەو پاسەوانە منی زۆر ترساند، گومانیشی بۆ من دروستکرد، بەڵام قسەیەکی بابەگەورەم بیرکەوتەوە کە بەمناڵی هەر کارێك سەخت بوایە و بۆم نەکرایە هاواری لێدەکردم و دەیووت ڕۆڵە ئازابە و غیرەت سەگ بتخوات، منیش وام بەخۆم وتی و بە پاسەوانەکەم وت: ئەوا دەچم بۆ لای، بەڵام تۆ ئاگادر و شاهید بە کە من ڕێبوارێکم و لێرەوە ڕابوردووم، تەنها مەبەستیشم چاکەیە ئەگەر شتێك بوو تۆ ئاگادار بە خۆشت دەزانی کۆمەڵگای ئێمە چۆن بیردەکاتەوە ئەویش ئافرەتە و بەم بەیانییە زووە زۆر جێگای گومانە لوێدایە و دەگری.

پاسەوانەکەش: منیشی توشی دڵە ڕاوکێ کردووە گەر بچیتە لای یارمەتییەکیشە بۆ من.

وتم: خەمت نەبێ هەر عەجولی خۆم ڕۆژێك لەناوم دەبات، بە هێمنی چوومە لای ئافرەتەکە و سڵاوم لێکرد جوابی دامەوە و هەناسەیەکی کیلی و خەریك بوو دەخنکا.

پێم وت: ئەوە خێرە بەم بەیانییە لێرە دەگریت ئەگەر دەکرێت با یارمەتیت بدەم، بەڵام یەك تکای برا و خوشکانە یان دایك و فەرزەنیانەت لێدەکەم وە یان هەر ناوێکی بۆ دەدۆزیتەوە بە ڕاستی پێم بڵێ و درۆم لەگەڵ مەکە چی ڕوویداوە تا ئەوەندەی لە توانام دابێ یارمەتیت بدەم بە مەرجێك ڕاستگۆبیت.

ئافرەتەکە: پەیمانم پێ ئەدەی کە یارمەتیم دەدەی؟

وتم: ئەگەر لە توانام دا بێت گومانت نەبێت کە درێغیت لێناکەم.

ئافرەتەکە: چەند ڕۆژێك لەمەوبەر لە ئوردوگای باریکە وە مێردەکەم هێنا بۆ ئێرە زۆر نەخۆش بوو دەی وت سکم دێشێ ئازار لاشەی هەژاندبوو زۆر بێ هێز و لاوازی کردبوو دووسەد دیناری دانراومان هەبوو بە نیازی چارەسەری مێردە کلۆڵەکەم بیهێنم بۆ سلێمانی، کاتێ کە هاتینە نەخۆشخانە وتیان گوایە بەردێکی زۆر لە گورچیلەی دایە و پێویستی بە نەشتەرگەری هەیە، منیش وتم چارەسەر نییە نەشتەرگەرییەکەی بۆ بکەن، بەڵام دکتۆرەکان پێیان وتم دەبێ سێ مانگ تا شەش مانگ چاوەڕێ بکات، بەڵام ئەگەر لە نەخۆشخانەی تایبەت نەشتەرگەری بۆ بکرێت ڕاستەوخۆ یەکسەر بۆی دەکەن بۆیە منیش جێگام نەبوو ڕووم کردە ماڵی مامم لێرە ئەو زۆر دەوڵەمەند بوو چاوەڕێی ئەوەم لێدەکرد کە یارمەتیم بدات و ئاسانکاریمان بۆ بکات.

سێ ڕۆژە لە ماڵی مامم ڕۆژێك پێی نەوتم ئەرێ قوربەسەرەكەی مێردت چۆنە؟

ئەم دوو شەوەی كە لەوێ بووم كوڕی مامەكەم لە باتی ئەوەی پارمەتیم بدات كە هاتومەتە ماڵەكەی لە باتی ئەوەی شەرەفم بپارێزێ كەچی ئەو داوێن پیسە ویستی پەلامارم بدات منیش بە بێدەنگی چووم بە ئامۆژنم وت لەبەر ئەوەی لانەیەكم نەبوو، نەمویست كەڕامەتی ئامۆزاكەم ڕاستەوخۆ بشكێنم بۆیە بە شەرمێكەوە بە ئامۆژنم وت ئامۆژگاری كوڕەكەت بكە.

كەچی قیژاندی بەسەرما و هاواری كرد و وتی ئەتەوێت بە شەڕەفی ئێمە مێردە گولەكەت چارە بكەیت وە بەو ناوەوە داوای پارەمان لێبكەیت، ئیتر ئەم شەو سەعات یەك منیان كردە دەرەوە ئێستاش دەمەوێت بچم بۆ لای مێردەكەم بەڵام دەرگای نەخۆشخانە نەكراوەتەوە بۆیە تاكە سەرمایەی من گریان بوو لێرە دا كە ویستم هەرچی خەمەكانی خۆمە لە سەر ئەم شەقامە بیكەمە یادگاری، نازانم چی بكەم بێ هیوایەكی زۆر منی پێچاوەتەوە، ئەوە حاڵ و گوزەرانی ژیانمە.

منیش گەڕامەوە بۆ لای پاسەوانەكە و بۆم گێڕایەوە ئەویش هەر وەكو من سەرسام بوو، بەڵام هەردووكمان هێشتان لە گومن دا بووین.

قسەكانی ئەو ئافرەتە گوماناوی دایربوو هەندێك پرسیاری ترم لێكرد و وتم: ئەگەر ئێستا تۆ بگەڕێیتەوە بۆ لای مێردەكەت و ئەو باسەی بۆ بكەی پێت وانییە كە ئەو ئەوەندەی تر دەردی كاری ئەبی؟

وتی: ١٣٠ دینارم پێ ماوە تا ئەو پارەیەشم نەخواردووە، دەیگەڕێنمەوە بۆ ماڵی خۆمان ئەگەر مردیش شەرەفی بپارێزم.

بەڕاستی ئیتر من گومانم نەما كە ئەم ئافرەتە ڕاستگۆیە دیارە ڕەوشتیشی وەكو كێوی پیرەمەگرون و هەڵگورد و حەسارۆست بەرزە بە

ئافرەتەکەم وت: من سوێندت بۆ دەخۆم بە خوای پەروەردگار دەستت لێ بەرنادەم خوشکی من، لەوەی کە پەیمانم دایتێ کە هاوکاریت بکەم وە مەرجێکیش لە مەرجەکانی ئیماندار ئەوەیە کە پەیمانەکەی خۆی بباتە سەر وەرە ماڵی ئێمە تا کاتی کردنەوەی نەخۆشخانەکە پشوویەك بدە و نانێ بخۆ ئەو کاتە هەرچییەك لە دەسەڵاتی من دا بوو دەیکەم، دیار بوو ئافرەتەکە زۆر بڕوای بە من نەبوو، وتم ئەگەر پێشت خۆشە من ناسنامەکەی خۆم دەدەم بەم پاسەوانە ئەگەر سەعات نۆی بەیانی نەهاتیتەوە ئەم جێگایە، با ئەم پاسەوانە ئاگاداری دەزگای پۆلیس بکات، بڕوا بکە وە سوێند بە خوای گەورەش تەنها بەزەیم پیاتا دێتەوە خوای گەورە زۆر یارمەتی منی داوە، من دەمەوێ ئەو چاکەیە بگەڕێنمەوە بۆ لای خوای گەورە.

دیار بوو ئافرەتە گومانەکەی ڕەویەوە پێی وتم: پێویست ناکات من دێم لە گەڵتا.

لێم پرسی ئەو پزیشکە کێ بوو کە وتی لە نەخۆشخانەی تایبەتی نەشتەرگەرییەکەت بۆ دەکەم؟

ناوی ئەویشی پێ وتم پزیشکێکی ناسراو بوو ناوی نەخۆشخانە تایبەتییەکەشی پێ وتم، بە دەم ئەو قسانەوە گەیشتینە ماڵەوە یەك سەعاتی مابوو بۆ کردنەوەی نەخۆشخانەکە، من گومانیشم نەبوو لەوەی کە هەلومەرجە ناڕەحەتەکەی وای لیکردووە کە دوای من بکەوێ دەنا ئافرەتێکی زۆر سەنگین دیار بوو لە تەکسیەکە لەبەر دەرگای ماڵەوە دابەزین بردمە ماڵی خۆمان و بە نەنکمم وت: ئەم شێرە ژنەم لە فولکەی شێرەکە دۆزیوەتەوە و ئافرەتێکە نمونەی ژیانی داوێن پاك کە داوێنی بە قەدەر ئاڵای وڵاتێك بێگەردە وە فرمێسکی چاویشی ژیانێکی نەهامەتی دەردەخات و هەر ژیانە ماندووی کردووە بەرائەت ڕێژنە دەکات لەلای

ئەو، ئەگەر دەکرێت با یارمەتی ئەم ئافرەتە بدەین، دایە گەورە ئەگەر دەشتوانی هەندێ شتی بۆ ئامادە بکە تا بیبات بۆ مێردەکەی.

مێردەکەی لە نەخۆشخانە کەوتووە و ئالودەیە بە دەست نەخۆشییەوە کە ئەو قسانەم بۆ نەنکم کرد چاوەکانی پڕبوون لە گریان خێرا دەستی کردە ملی ئافرەتەکە و پێی وت: کچم برۆ دەم و چاوم بشۆ تا نانێکت بۆ ئامادە بکەم، ئەنجا من دڵنەوایی نەنکم ئەدایەوە، چونکە وازی لە گریان نەدەهێنا زوو زوو بە ئافرەتەکەی دەوت ئەی دایکت کوێر بێ.

منیش پێم وت: چیت نەکراوە لە کیسەی خەلیفە دەبەخشی، بۆیە دەستی کرد بە پێکەنین و وتی: برۆ سورە گیان تۆ سەروپێت خواردووە دە دوانزە نانی گەرمیش بۆ ئێمە بهێنە.

وتم: کوڕە نانی چی خەفەتم خواردووە.

وتی: باشە دوو هێلکەش بۆ تۆ دەکەمەوە ناو ڕۆن، پێشی وتم کە بچم بۆ لای کاکە برای بەقاڵ بزانە ماستی جوانی هەیە ئەگەر ماستەکەی شیرین بوو مەنجەڵێ ماستمان بۆ بهێنە، بەڵام توێژەکەی نەخۆی ئەگینا دوای لە مەنجەڵە ماستەکەت هەڵدەکێشم.

برۆ با نانێ بۆ ئەم ئافرەتە ئامادە بکەم.

خوای گەورە چاکەی چاکەکاران ون ناکات، کەوتمە ڕێ نانەکە و مەنجەڵە ماستەکەم بۆ هێنا هاتمەوە بۆ لای و پێم وت لە سەروپیوە هاتمەوە سەر نان و ماستە حەیاتەکە.

کێشەی ئافرەتەکەشم بە جوانی بۆ گێڕایەوە، نەنکم هەمیشە بیری دەخستینەوە بەوەی کە دونیا بۆ باوکتان نەماوە ئێوەش دەچن بۆ لای ئەو، بۆیە هەموو کات گۆڕەکانی خۆمانی ئەخستینە پێش چاومان و مردن ببووە سرودێکی نیشتیمانی، لە پاشان دا لە ئافرەتەکەی پرسی ناوت چییە کچی خۆم؟



ئەویش بە تەواوی خۆی بە نەنکم ناساند و وتی: ناوم بەهارە.

دایکم بە بەردەوامی قسەی لەگەڵ بەهار دا دەکرد و پێش وەخت ئەو مشت و مڕەی لەگەڵ من دا کردبوو بۆیە بەویشی وت بەهار گیان کچی خۆم من لەگەڵت دێم بۆ نەخۆشخانە با سورەمان لەگەڵدا نەبێ لەبەر ئەوەی پیاوەکەی تۆ ئێستا باری دەرونی لە لایەکەوە و نەخۆشییەکەشی لە لایەکی ترەوە تەنگی پێ هەڵچنیوە با بیرکردنەوەیەکی لە لا دروست نەبێ هەر بۆ ئەوەی ئەو گومانانە لە بیری ئەودا نەمێنێ من ئامادەم لەگەڵتا بێم وە هەر لەوێش دەڵیم کە مامی تۆ منی ناردووە وە پێشی وت هەر ئەمڕۆ پیاوەکەت لەو نەخۆشخانەیە دەهێنینە دەرەوە و دەیبەین بۆ نەخۆشخانەی تایبەتی وە هەر هەموو ئەرکەکەش لەسەر دایکی خۆت دەبێ وە هەرواش خۆمان نیشان دەدەین کە ئەو پارەیە لای مامتەوە بۆی دابین کراوە، بۆ ئەوەی هیچ کێشەیەك نەمێنێ و کارەکان بچنەوە دۆخی جارانی خۆی.

وتی: کچی خۆم بۆ سەرت داخستووە سوێند بە خوا چۆن نەنکی سورە گیانم ئەو هەستەیشم بۆ تۆ هەیە.

من وازم لە مشت و مڕەکەی ئەوان هێنا و بەرەو کارەکەی خۆم ڕۆیشتم کە گەڕامەوە دایکم و بەهار هەردووکیان لە ماڵەوە بوون چیشت و نانێکی بەلەزەتیان لێ نابوو زۆر بە شادی و خەندەوە دانیشتبوون تەنانەت دیواری ماڵەکەشمان لەگەڵ بن میچەکان دا قاقای خۆشیان لێدەدا لە دوای سڵاو کردنم دایکم بۆی گێڕامەوە کە مێردەکەی بەهاریان بردووە بۆ نەخۆشخانەی تایبەت ئێستا لەوێیەو هەموو کارەکانی ئەنجام داوە و پارەی نەشتەرگەریەکەشی ئامادە کردووە بۆی، سبەی بەیانی سەعات یانزە نەشتەرگەرییەکەی بۆ دەکرێ.

# چیرۆکی بیستەم
## سەرهەنگ و خاك

دوای ئەوەی نەنكم و بەهارخان وتیان: سبەینێ بەیانی سەعات یانزە نەشتەرگەرییەكەی بۆ دەكرێت و ئیتر تۆش لە دوعای خێر بێ بەشمان مەكە.

بەڕاستی زۆر دڵخۆش بووم وا هەستم دەكرد كە هەموو ئاواتەكانم هاتۆتە دی بۆیە هەرخێرا تێرم خوارد وامزانی كە سەروپێی بەیانیم خواردووە لە پاش ئەوەی كە نان خورا لەگەڵ بەهارخان دا كەوتبوونە گفتوگۆیەكی خۆش و هەستێك دروست ببوو لەلام كە ئەم وت: دەستێ بۆ خێر نەبێ بۆ بڕین باشە كورد وەتەنی نان بە تەنها ناخورێ، ئەگەر بخورێ لەزەتی لێنابینی بە تەنهایی.

بە هەر جۆرێك بوو كۆتایی بەو كێشەیە هات و دوای سێ هەفتە ئێوارەیەكیان لە دوای نوێژی شێوان لە مزگەوتەوە گەڕامەوە پیاوێك و بەهارخان و دوو منداڵ لە دەوری نەنكم دانیشتبوون.

بە بینینی من كاك ڕێبوار هاوسەری بەهارخان بەرەو ڕووم هات و ویستی دەستم ماچ بكات، بەڵام نەمهێشت زۆرم پێناخۆش بوو من داوای گەردەن ئازاییم لێكرد.

ئەو زۆر بە تاسەوە باوەشی بە من دا كردبوو وە زۆر بە ڕیزەوە و بە كزۆڵی دانیشتبوو خۆی بە من ناساند و باسێكی كورتی خۆی بۆمن كرد كە لەسەر مەرزی ئێران عێراق نیازی هەیە كار بكات لە دوای باس و گفتوگۆیەكی كەم دیسانەوە سوپاسێكی زۆری كردم.

وتی: ئێستا توانام نییە پارەکەت بدەمەوە، بەڵام لە داهاتوودا پەیمان دەدەم کە پارەکەت بۆ بگەڕێنمەوە بە زوویی من وشەکانیم لە دەم فڕاند وە پێم وت کاك ڕێبوار گیان من جەنابتم نەناسیوە کاتێکیش کە پارە بۆ جەنابت بەکارهاتووە بڕوام پێبکە من ئاگادار نەبووم.

کاك ڕێبوار من پرسیارێك لە جەنابت دەکەم ئەگەر توانیت جوابی پرسیارەکەم بدەیتەوە ئەوە من پارەکەت لێوەرناگرمەوە وە ئەگەر نەشت توانی کێشەیەك نابێ پارەکەت لێوەردەگرمەوە هەرکاتێ هەتبوو.

پرسیارەکەم ئەوەیە ئەگەر کەسێك پارەیەکی زۆری هەبێت کاری پێوە نەکات و ساڵێك بەسەری دا چووبێت دەبێ ئەو پارە بەشی خوای لێدەربکرێت، وایە؟

کاك ڕێبوار: ڕاستە ئەوە لە دین دا پێی دەوترێت زەکات.

کەواتە ئازیزم کاك ڕێبوار تۆ جوابی پرسیارەکەت دامەوە ئەو پارەیە بەشی خوایە و من نەم داوەتە تۆ، بەڵکو گەڕاندومەتەوە بۆ خوای گەورە.

کەواتە ئەگەر تۆ پارەت بوو قەرزەکە بگەڕێنەوە بۆ لای ئەو کە خۆی ئاگادارە بەسەر هەمووومانەوە.

دیار بوو لە قسەکانی من خۆشحاڵ بوو وام تێگەیاند کە پارەکەم هیچ منەتێکی تێدا نییە و منیش خاوەنی نیم، بۆیە زەردەخەنەیەك کرتی و دیسانەوە باوەشی پیاکردم و بە تاسەوە نێوچاوانی ماچکردم وە داوای ئەوەی لێکردین کە بە خێزانی بچین بۆ ماڵیان بۆ ئوردوگای باریکە، نەنکیشم لەولاوە کە زۆر حەزی لەگەڕان بوو پێش ئەوەی کە من هیچ بڵێم ئەو خێرا ڕازیبوونی خۆی دەربڕی و لەگەڵ باپیرم ئامادەییان دەربڕی.

بە دوای کاری ڕۆژانەم دا وێڵ بووم دیسانەوە خەریك بووم بە ئازارەکانی ژیانەوە وەك پیشەی هەمیشەیم ژیانێکی کۆپیکراو ڕۆژانە

دووباره دەبوەوە زەمەن تێپەڕی بەیانییەکی ساردی زستان بوو دیسانەوە کەڵکەڵەی سەروپێ کەوتەوە یادم زۆر تامەزرۆبووم بۆ خواردنی بڕیارم دا دوای نوێژی بەیانی بکەومە ڕێ بۆ سەروپێ خواردن.

دەرچووم لە ماڵ چوومە لای مزگەوتی گەورە زۆر وشکە سەرما بوو ددانەکانم لە سەرمان دا هەڵپەڕکێیان دەکرد هەڵدەلەرزیم.

کەچی لە تەنیشتمەوە گوێم لە ناڵە و هاوار و جنێو دانێکی زۆر بوو کە دیم لاوێکی سور و سپی هەر لە تەمەنی خۆم دا بوو بە دوای سندوقی تەختەی سێو دا دەگەڕا و هەڵدەلەرزی و سەرما کوڵمەکانی سور کردببووەوە، زوو زووش هەنسکی بێ فرمێسکی هەڵدەدا، دەست و پەنجەی لە سەرمان دا سور ببووەوە، دەستە ماندووەکانیشی بە سکییەوە گرتبوو سۆزێکیشی دەکرد دەیووت دایەگیان بۆ بەجێت هێشتم بەس تۆم هەبوو، تا سەبووری دڵە گلاراوەکەمی پێ خۆشبکەم، ئای خودایە کە بێ کەسم ئای خودایە گیان بێ کەسی خواردومی.

وتەکانی سەرنجی ڕاکێشام بۆیە چوومە لای و پێم وت: براکەم بۆ ئەوەندە ناشکوریت، ئەو هاوار و هەنسکەت لە چییە؟ تۆ لاوێکی جوانخاسیت و توانای کارکردنیشت هەیە گوێم لێتە هاوار بۆ دایکت ئەکەی ئەگەر دایکت نەماوە خوا سەبوری دڵت بداتەوە، خوای گەورە ئارامی بەسەر دڵ و ڕۆحتا بهێنێت، ئەو هەموو گلەییە بۆ بەرامبەر بە خوا و بە زەمەن هەڵدەڕێژی ئەی نازانیت کە مردنیش نیعمەتێکی خواییە، ڕاستە و حەق دەبێ بیچێژین.

ئاگام لێی بوو هەڵدەلەرزی لە سەرمادا سەرما بلوزەکەی ڕەق کردبوو ئاو بە لوتیەوە نەدەوەستا و قژە ئاڵەکەشی زوقم گرتبووی، هەستم کرد کە سەرمایەکی بێ شوماری خواردووە خێرا ئاگرێکی بچووکم بۆ کردەوە و لە بەردەم ئاگرەکە دا دامنا و کەوتمە گەڕان بەدوای تەختە و دار دا، پێشم

وت ئەگەر برسیتە با بچینە ئەو چێشتخانەیە نانێ بخۆ با گەرمت بێتەوە، بەڵام ئەو بێدەنگی خامۆشی کردبوو.

وردە وردە ئاگرەکەم بۆ خۆشکرد، بەڵام ئەو زیاتر هەڵدەلەرزی شانەکانی وەکو بێژنگ یاریان دەکرد، جاروباریش وەنەوزی دەدا و خەریك بوو بەسەر ئاگرەکە دا دەکەوت، هاوارم لێکرد براکەم ئاگاداری خۆتبە من دەبێت بڕۆم ئەگەر پارەت پێویستە با پارەت بدەمێ؟

ئەو کوڕە کەتە دۆزێکی نا ئاسایی و بە سەر ئاگرەکە دا بێهۆش بوو بەپەلە فریای کەوتم هەڵم ساندەوە کەچی ئەو هەر دەستی لەسەر سگی دانابوو باوەشم پیا کرد، لە پاشان ویستم بە نەرمی بیشێلم، بەڵام کە دەستم بەر سکی کەوت دەستی من و خوێنی ئەو و لۆکە بەیەکەوە تێکەڵ بوون، خوێن گرتمی.

وتم لەوانەیە چەقۆیان لێدابێ، پێم وت: ئەرێ ئەوە جێی چەقۆیە یان فیشەك؟ جوابم بەرەوە لە وڵاتی ئێمە دا چەك و چەقۆ وەکو تەزبیحی دەستی حاجییەکانی لێهاتووە، بۆیە خێرا گومانم بۆ چەقۆ و فیشەك چوو، بەڵام ئەو هەر بێهۆش بوو بەجێم هێشت و لە ترسان ڕامکرد، سەرشێت و عەجولیەکەم بونەوە هاوڕێم هەمدیسان هەموو ئەندامەکانی لەشم پێیان دەوتم هەرێ سەرشێت لە چی هەڵهاتی لە بیرتە کە باپیرەت پێی دەوتی غیرەت سەگ بتخوات، بۆ ئەو لاوەت بەجێ هێشت؟

ئەو بمرێ ئەی دوایی ترسنۆکی تۆ ناکوژێ؟ بگەڕێوە لە دەروازەی ترسنۆکی دا مەژی ئەگەر بشمری وەك ئەحەی کڕنوو بە ترسنۆکی لەسەر جێگا دەمری.

ئەم گفتوگۆ و جەدەلە لەگەڵ خۆم دا گەڕامەوە سەر لاوە بێ هۆشەکە کە سەیرم کرد ڕەنگی هەڵبرسکابوو، خوێنی مەیووش بلوسەکەی گرتبوو هەر لەوکاتە دا هاوارم کرد بۆ خەڵك، چونکە بەیانی زوو بوو ئۆتۆمبێلیش

دەست نەدەکەوت (عەرەبانەیەك) لەبەر بەلێدەکەوە سەردەکەوت هاوارم لێکرد و وتم: بگەرە لام، ئەو لاوەم بە پەلە خستە سەر (عەرەبانەکە) و کەوتینە رێ بەرەو نەخۆشخانە، لەگەڵ خاوەن عەرەبانەکە هەردووکمان پاڵمان پیوە ئەنا و بە ڕاکردن بۆنەوەی بە زوترین کات بیگەیەنینە جێگای تایبەت، عەرەبان چییەکەش زوو زوو پرسیاری لێدەکردم ئەی وت: ئەرێ کاکە چی ڕووی داوە؟

بە هەناسە بڕکێوە بە پەلە پەلی خۆمەوە بۆم گێڕایەوە، کە گەیشتینە بەردەم نەخۆشخانەکە هەردووکمان لاوەکەمان بردە ژوورێ گەیاندمانە سەرجێگایەك بە زووی پزیشکەکان هاتن بە دەنگمانەوە و بردیانە ژووری نەشتەرگەری، هەرچەند من زۆر ئازارم چەشت بوو بەدەستی ئەو لاوەوە، بەڵام ئەوەندەش پزیشکەکان و لێپرسراوانی نەخۆشخانەکە پرسیاریان لە من کرد سەبارەت بە ڕووداوەکە و ئەو گەنجە تەواو ماندوویان کردم.

سوپاس بۆ خوا دوای چەند ساتێکی کەم پزیشکێك هەواڵی هێنا کە برینەکە نە جێگای فیشەکە و نە جێگای چەقۆیە، بۆیە زۆری نەبرد لە ژووری نەشتەرگەری هێنایانە دەرەوە و بردیانە ژووری چاوەڕوانی، پاشان پزیشکێك هاتە لامەوە و پێی وتم کە نەخۆشییەکەی زۆر سامناك و کاریگەرە، پێویستی بە نەشتەرگەرییەکی زۆر گەورە هەیە وە چارەشی بڕوام نییە لەم نەخۆشخانەیە بکرێت، چونکە سکی وەرەمێکی گەورەی تیایە و ناوکیشی کراوەتەوە، ئێمە نەشتەرگەرییەکی سەرەتاییمان بۆ کردووە تا ئەوکاتەی دەیگەیەننە لای پزیشکێکی تایبەتی.

لەو کاتە دا دەستەکانم بەرزکردەوە بۆ ئاسمان سوپاس و ستایشێکی بێ پایانی خوای پەروەردگارم کرد، کە ئەم لاوە برینەکەی جێگای چەقۆ نەبووە و نە فیشەکیشی بۆتە میوانی جەستەی.

دوای ئەوەی وردە وردە چوومە لایەوە و سەلامم لێ کرد و دەستم خستبووە ناو دەستی یەوە چاوە ڕەشەکانی بە ئاستەمێك بەرزکردەوە بۆی ڕوانیم، کە بینیم دوو دڵۆپە فرمێسك لە ناو چاوەکانیا گۆڵکۆ و قەتیز مابوون، هیلاکی و سەرما کوڵمە ئاڵەکانی شەق شەق کردبوو، بە لاوازی سوپاسی کردم و چاوەکانی داخستەوە و چەند ساتێك لەگەڵی دا بە بێ دەنگی مامەوە.

پاش کەمێکی تر چاوەکانی وەك پەردە هەڵهێنایەوە بەڵام برژانەکانی ئەوەندە قورس بوو پێڵووی چاوەکانی بۆ هەڵنەدەبڕا، چوومە پێشەوە خۆم پێناساند و ناوەکەی خۆمم پێ وت.

وتم: ئەی ناوی تۆ چییە بەڕێزەکەم؟ هەتاکو بچمە لای کەسوکارەکەت و هەواڵی تۆیان پێڕابگەیەنم.

کە وام وت دوو دڵۆپە فرمێسك کەوتنە خوارەوە لە چاوەکانی، بە نەرمە زەردەخەنەیەکەوە وتی: ناوم سەرهەنگ_ە ئاگام لێ بوو کە توانای قسەی نەبوو زۆر ماندوو دیار بوو حاڵەکەی بەرەو خراپی ئەڕۆشت، بۆیە بەپەلە خۆم گەیاندە پزیشکەکان و وتم: فریام کەون و وەرن سەیرێکی بکەن، ئەوان جەختیان لەسەر ئەوە دەکردەوە کە من بەپەلە فریای خۆم کەوم و بیگەیەنمە شوێنی تایبەتی و پزیشکێکی تایبەتی، بەڵکو بەوە نەوەستان زۆر بە ڕاشکاوانە پێیان وتم: کە ئەم نەخۆشییە زۆر کوشندەیە، لەوانەیە لەماوەیەکی کەم دا لەناوی بەرێت، منیش هیچم بۆ نەمایەوە تەنها ئەوەم بە خەیاڵ داهات کە هیچ نەبێت پارویەك نانی بۆ بهێنم کە سوکنایی بە دڵە سەرما بردەڵەکەی دا بێتەوە، بۆیە پرسیارم کردەوە لە پزیشکەکان وتم: ئەتوانم کەمێ خواردنی بۆ بهێنم؟

ئەوانیش وتیان: بەڵێ ئەتوانی.

چووم و کەمێك خواردنم بۆ هێنا هەر لەوکاتە دا چوومە لای پزیشکێك و بۆ دڵئارامی خۆم وتم: فریای کەوە زۆر حاڵی ناڕەحەتە و پەرێشانە چاوەکانی مت بووە بۆی هەڵنایەت، ناوی پزیشکێکم پێ بڵێ کە ناسراو بێ تا بیبەمە لای بە زوترین کات، بەڵام بێ سود بوو.

کە چووم خواردنەکەم بۆ برد بۆم کرد بە بۆڵە و تیکە تیکە هەر چۆنێك بوو کەمێکم کرد بە دەمییەوە، ئای ئەو بەسەزمانە چەندی برسی بوو ئەم بینی چۆن بە لاوازی نانەکەی دەخوارد و ئاهێکی پێدا دەهات، دوای نانخواردنەکەی پێم وت: پرسیارت زۆر لێ ناکەم ئەزانم کە ئێستا بەنجەکە بەری نەداویت بێ تاقەتیت و توانای قسەکردنت نییە، ئێستا من بەجێتدەهێڵم چونکە کارم هەیە ئەبێ بچم بەلای کارەکانمەوە، سەرهەنگ گیان کاتژمێر دووی دوای نیوەڕۆ دەگەڕێمەوە لات، دوای ئەوەی کە گەڕامەوە لات ناونیشانی کەس و کارتم پێ بڵێ باهەواڵی تۆیان پێ بگەیەنم دەچمە لایان، ئێستا بخەوە بۆخۆت ئیسرەحەت بکە، دیسانەوە بە لاچاوێك سەیری کردم و سەری داخستەوە دەستی کردەوە بەگریان، دیار بوو لە ناوچاوانی دا دەریایەکی پڕ پرسیار و وەڵام شەپۆلی ئەدا، بە ڕاستی زۆر بەزەیم پیایدا دەهاتەوە خەم و خەفەت وەك سن و کولە هەناومی خواردبوو.

زۆر پرسیارم لە خۆم دەکرد کە چی وەڵامەکان نارێکانە بە دڵم دەکەوت، بەڵی ڕۆیشتم و بەجێمهێشت، پاشان کە گەڕامەوە بۆ لای سەرهەنگ دیار بوو ماندووی شەوانی پێوە دیار بوو، چوومە لای سەریەوە و لاشەی ماندوویم بە ئاگا هێناوە و وتم: سەرهەنگ گیان چوومەتە لای پزیشکێکی تایبەتی زیرەك کاتم بۆ گرتووی، جا ئەگەر پێت دەکرێت براکەم هێز بەرە بەرخۆت و با بەرەوە ئەو پزیشکە وردە وردە بە ڕێ بکەوین.

کاتیش درەنگە دوایی ناونیشانەکەتم بدەرێ تا بگەمە لای کەس و کارەکەشت و هەواڵی تۆیان بدەمێ.

بە کەساسی و زەبوونی یەوە سەرێکی هەڵبڕی، بەڵام لە ناوچەوانی دا تورەی چەخماخەی دەبەست بورکان لە دڵ و جەستە و گیانی دەردەچوو هەروەك پڵنگێك بەسەرم دا نەڕاندی، ئازارەکەی تاوی بۆ هێنا و خێرا لە نەڕەی خست و بە ئارامییەوە پێی وتم: ئەگەر بە دوای باوکم دا وێڵی گەڕاوەتەوە بۆ ناو سکی دایکی و بە خۆڵ مەلۆتکە کراوە، ئەگەر بە دوای دایکیشم دا دەگەڕێیت لە ناو کونێك دا نێژراوە کفنەکەیشی شەکراوی تێوە پێچراوە بێزارم لە خۆم، تۆ ئەزانی ئەوە دوو ڕۆژە دایکم مردووە!کەسێک نەبوو بی شوات تەنانەت لە وڵاتەکەی خۆم دا کەسێك نەبوو گۆڕێکم بداتێ بە خۆڕایی تا لەو جێگایە دا بینێژم کەچی هێشتان دەپرسی من کێم؟ لە خۆم بپرسە بە دوای دایکم و باوکم دا مەگەڕێ، من خۆڕێکی هەڵنەهاتووم، من مانگی ئاوابووم من بەرسیلەی هەڵوەریوم، گریانی لە قورگا خنکاوم، خەسرەو گیان بۆ ناگریت؟ بۆ وا سەرسام بوویت؟

ئەزانیت من و کوردستان لەیەك دەچین؟ ئەو بێ کەس و منیش بێ کەسم، من لەگەڵ باوکم و دایکم دا مردم، لەگەڵ کوردستانا ئەوانیش مردن، ئەوان نەوەکانیان هەر بە زیندوویی زیندە بەچاڵکرا لەگەڵ کوردستان دا، بولبولیش گوێ لە چریکەی من ناگرێت، گۆڕیش نابێتە هاوڕێم، جۆزگە من بمردمایە بۆ ئەوەی خاك و گۆڕ و وڵات و سەرکردە شەرمەزار نەبوونایە، بۆ هەمووتان لە ئاستی من گیایەکی وشك بووی هاوینن، جۆگایەکی بۆگەنی وەستاون، باوکم بۆ ئەم خاکە لەناوچوو لەو کاتە دا من لەناو سکی دایکم دا چوار مانگان بووم باوکمیان شەهید کرد.

وەك بۆیان گێڕاومەتەوە دایكم لە پرسەكەی باوكم دا هاواری كردووە و وتوییەتی خەڵكی وەڵاتەكەم ئێوە زۆر بە قسە و باسن دوای بەس ناوم نەكەن من خاوەنی منالێكم لە مێردەكەم سكم هەیە.

هەموو خۆشییەكانی خۆی دابوو بە من، دایكم چاوەكانی بەسەر من دا ڕەخسابوو هەر بۆیە بە گەنجێتی مایەوە و منی بەخێوكرد.

پێی دەوتم: سەرهەنگ گیان من باوكتم زۆر خۆشدەویست تاكە دیارییەكی بۆ بەجێ هێشتووم ئەویش تۆی، دەبێت دیارییەكەی بە جوانترین شێوە هەڵبگرم و بیپارێزم بۆیە هەر لە گەنجێتیمەوە دانیشتوومەتەوە، سەرهەنگ گیان باوكت بۆ ئەم وڵاتە ژیا منیش لەبەر تۆ دەژیم، سەرهەنگ گیان تۆ دیاری دەستی هاوسەرە شیرینەكەمیت، لە چاوانت دا هەمیشە ئازایەتی چرۆ دەكات خۆشەویستم، خۆشەویستی شەونمی بەیانیان بوو.

چی بكەم دێكەمان داگیركرا و زەوی و خاكمان هەمووی داگیركرا هەرچی مەڕ وماڵاتمان هەبوو هەموو بەعسی_یە بۆگەنەكان بردیان، ئیتر هیچ چارەمان نەما و ژیان نەما بۆیە بە ناچاری لەگەڵ دایكم و بابە گەورە و دایە گەورە دا هاتینە شار، تا ئەوكاتەی دایە گەورە و بابە گەورەمان مابوو كێشەی ئابووریمان نەبوو، بە چەند ساڵێك دوای مردنی ئەوان باری ئابووریمان تێكچوو، من وازم لە قوتابخانە هێنا و دەستم كرد بە كار تا بژێوی خۆمان دەربهێنم.

كرێچی بووین لەبەر ئەوەی توانای دانی كرێمان نەبوو ناچار بووین لە خانووە بێ تاپۆكانی شەهیدانی ئازادی خانویەكمان گرت بە كرێ لەبەر ئەوەی كە كرێكەی كەمتر بوو وە ڕۆژانەش لە ژێر پردەكە حەماڵیم دەكرد، ئارد و برنج و شەكرم بۆ خەڵكی بار دەكرد و بۆم دەبردنەوە بۆ ماڵەوە، بروام پێ بكە تا توانیم كردوومە، لە دوایی دا دایكە كلۆڵەكەشم تووشی

شەکرە بوو، هەرچی یەکم پەیدا دەکرد بەس بەشی ئەوی دەکرد بیدەمە داودەرمان و خواردن، ژیان زۆر سەخت بوو ئەو پارەیە بەشی نەدەکرد بۆیە منیش تەواو خۆم هیلاك کردبوو، لەبەر خاتری دایکم، چونکە زۆر نارەحەتی بە منەوە دی بوو، زۆر ئازاری لەگەڵ من دا کێشابوو ئیتر بیرم لە خۆم نەدەکردەوە، ئەوەندە باری قورسم هەڵگرتبوو ئازار لاشەمی داگیرکردبوو، هەرگیزیش لەبەر خاتری دایکم نەمدەوێرا ڕۆژێك لە ڕۆژان بڵێم ئازارم هەیە.

لەبەر ئەوەی هەمیشە ئەو ئارام بێ، بەدەست منەوە خەفەت نەخوا، ڕۆژێکیان دوو لۆری ئارد هات منیش تاوم دایە خۆم ئاردم دادەگرت ئای لەو ڕۆژە ڕەشە، تەواو ماندووی کردبووم چەند فەردە ئاردێك مابوو لە ناو لۆرییەکە دا بێ ڕەحمانە شەڕیان لەگەڵ من دا دەکرد زۆران بازیان لەگەڵ منێکی لاودا دەکرد، تا بەدەم دا منیان دا بە زەوی دا لەبەر ئەوەی زۆرم لە خۆم کرد تەواو تاسام لە ژێر فەردەکان دا لە ناکاو بینیم چەند دڵۆپە خوێنێك لە ناوکمەوە هات، هیچ گوێم پێ نەدا، چونکە تەنها بیرم دەکردەوە کە بتوانم ئەوەندە پەیدا بکەم کە دەرزی شەکرەکە بۆ دایکم دابین بکەم، بێ سود بوو کەوتم، بەپەلە منیان بردە خەستەخانە، بەڵام نەمتوانی بهێنمەوە لەبەر خاتری دایکم چاوەڕێی ئەوەم نەکرد کە چارەسەرێکی پیویستم بۆ بکرێت هاتمە دەرەوە گەڕام هەتا کاری دیکەم دەستبکەوێ.

هەر حەماڵیم کرد، هەر کرێکاریم کرد، هەتا ڕۆژێك چریکەیەك لاشەی منی هەڵسان گوێکانم پڕ بوون لە گریەی بە کوڵی دایکە کڵۆڵەکەم بینم، هەر دوو چاوەکانی کوێر بووە بە بۆنەی نەخۆشی شەکرەیەوە، ئەوەندەی تر گلاراوم گرت، زیاتر لە جاران خۆم ماندوو تر دەکرد ڕۆژ بە ڕۆژ برینەکەم



گەورەتر دەبوو تا وام لێهات توانام نەبوو بەسەر فەردەیەکی بیست کیلۆییدا کە هەڵیبگرم.

هاوڕێم ئەو کەسانە زۆر بێ بەزەیی بوون کەسێ نەبوو کارێکی سوکم پێ ببەخشێ هێز و تواناشم نەمابوو کەسێکیش کاری نەدەدا بەمن سەرەڕای ئەو هەموو ناڕەحەتیەش پێیان دەوتم کوڕە تەمەڵەکە.

منیش تورەیی لاشەمی پێچابوو تاوام لێ هات توانای هیچم نەما ڕۆژێکیان ویستم سواڵ بکەم تا هیچ نەبێ کرێی خانوەکە دەربهێنم.

هاوڕیگیان زۆریان پێ کردم دەچوومە لای هەرکەسێك ئەم ڕستانەیان وەك سرود دوبارە دەکردەوە ( تۆ لاویت بڕۆ کاربکە بڕۆ هیلاك بە بڕۆ ئارەق بڕژە)، کەسێك لێم تێنەدەگەیشت بۆ ئەوەندە ئێوە بێ بەزەیین؟

ئەچوومە بارەگای هەر لایەنێك لە لایەنە سیاسییەکان منیان دەردەکرد و نائومێدیان دەکردم لەبەر ئەوەی شوناسنامەکەم لە دەستدابوو، بەهەمان شێوە پەیوەندی کۆمەڵایەتیشم زۆر کەم بوو، لەبەر ئەوەی هەر بەکاری ڕۆژانەوە خەریك بووم وە خۆنەکردنیشان بە خاوەنی باوکم لەسەر ئەو کێشە سیاسییانە بوو کە لایەنە سیاسییەکان کەوتبووە ناویان لەیەك جیاببوونەوە کەسیان خۆیان بە خاوەنی باوکم نەدەزانی.

بۆیە لە دەرگای هەر هەموویان دەرکرام مەخابن هەر لەو شوێنانە دەرنەکرام، بەڵکو لە خانووەکەش دەرکراین تەواو بێ لانە بووین خۆم و دایکە کوێرەکەم لەبەردەرگای ماڵان دا دەسوڕاینەوە، هەردووکمان نەخۆش من خوێن وەك کانی فوارەی بەستبوو لەناو سکم دا ئافێراکەی دایکیشم بە کلۆڵی و داماوی شەکرە و کوێری.

هیچ چارەمان نەما بەهەر شێوەیەك بوو نەم دەهێشت کە دایکم بزانێ کە من زۆر ناڕەحەتم بەدەست دەرد و نەخۆشییەوە هەر لێم دەشاردەوە بۆئەوەی خەفەت نەخوات، بەڵام واهەستم دەکرد گومانێکی بۆ دروست

بوو واهەستم دەکرد کە من بە کەسێکی ئیشنەکەر بزانێ، من هەر ئەوەم پێ باش بوو کە نەهێڵم بزانێ کە من گیرۆدەی نەخۆشییەکی سەختم.

خودایە هاوارە پاشان خەڵکی ئێوەش هاوارە، دەوڵەمەندان، سەرکردەکان فریامکەون هیچ نەبێت ئاوڕێك بدەنەوە سەیرێکم بکەن منیش وەك کوردستانەکەتان خیانەتم لێکراوە هەروەك ئەو منیش داگیرتان کردووم.

هیچ چارەمان نەما ڕوومان لە هەر شوێنێك دەکرد دەردەکراین ڕوویان وەردەگێڕا هەر جارەی بە قسەیەك دەیان تەزاندم جارێك بە ناوی ئەوەی کە لاویت جارێك بە ناوی ئەوەی کە توانای کاردکردنت هەیە، هەزاران جاریش توانجیان لێ دەدام بەوەشەوە نەدەوەستانەوە گومانی خراپیان پێ دەبردم کەسێ دەیووت ئەمە مەی خۆرە، کەسێکی تریش دەیووت ئەمە لەوانە تلیاك خۆر بێت، یان ئەمە قومارچییە هەزاران قسەی ناشرینیان خستە دوای من، کەسێ نەبوو بڵێ ئەمە کوڕە شەهیدە!کەسێکیش نەبوو بڵێ خۆ ئەمە ژنە شەهیدە!ئای، ئای کە بێ هێزم، لە پاشان دا چارەمان نەما چووینە لای کۆستەی چوم لەولا دەشتە حاجی فەتاح ناوێك باخێکی هەبوو ئەو ڕووی تێکردین خێمەیەکی بە نایلۆن لە ناو باخەکەی خۆی دا بۆ هەڵداین تا من و سەرکردەکەی دڵ و ڕۆح و گیان و دایکە کەساسەکەم بچینە ناوی.

هاوڕێ گیان ئای کە خەفەت بارم، ئای کە بێ هێزم، ئای کە لاوازم، خەسرەو چۆن دایکم بەجێیهێشتم، چۆنیش باوکم نەبینی ئەویش بەجێیهێشتم گریانیش بەجێیهێشتم دڵنیام کە تۆش بەجێمدەهێڵیت.

لە هەر هەمووی ناخۆشتر و ئەستەم تر سەد بریا ئەو ڕۆژەم نەدی بایە خۆزگەیش هەر نەبوومایە چوار ڕۆژ لەمەو پێش دایکم زۆر حەزی لە چا بوو، بە ناسکی و هێمنی پێی وتم: ڕۆڵە سەرهەنگ زۆر گلەیم لێتە هیچ

نەبێت برۆ تۆزێك كار بكە هەتا ئەوەندە پەیدا بكەی پیاڵەیەك چا بۆ من بكڕی زۆر حەزم لە چایە كوڕم تۆم پەروەردە كرد تا لە ژێر سێبەرتا بحەسێمەوە بتكەمە دیاری تا مۆمە جوانەمەرگەكانی باوكت هەموو هەڵوەرێنم، كەچی تۆ لە تەنیشتمەوە دانیشتوویت و هیچ ناكەیت كوڕم زۆر بێ هێزم خەم هێرشی بۆ هێناوم بۆنی مردن دەكەم تۆ وات لێهاتووە كە نەتوانی پیاڵەیەك چا بۆ سوكنایی ئەم دایكە كلۆڵەت پەیدا بكەی؟

سەرهەنگ گیان من قەت تورەنابم لێت، گلەیی بێ لێت زۆر گلەیی بێ لێت كە وشەكانی لە دەم كەوتنە خوارەوە وەك كریستاڵ بەسەر ڕۆحما شكانەوە قوڵپت گریان و هاواری مەئیوسی لە ناو قورگم دا قەتیس مابوو نەمدەزانی چی بڵێم هەرچۆنێك بوو وەڵامم نەدایەوە گلەییەكەم خستە سەرچاوم، بەڵام گلەییەكەی ژیلەمۆی كردم و كلۆكەی دامركاندمەوە، ئەوەندەم پێكرا لە خێمە شەق و شڕەكەمان دا هاتمە دەروە بەرەو سلێمانی ڕێگام گرتە بەر زۆر سەرما بوو ئازاریش جەستەمی هەژاندبوو خوینیش ناوسكی داگیر كردبووم.

ئەوەی كە پێم بوو تەنها سێ دینار بوو ئەویش بەشی نەدەكرد نەم دەزانی چی بكەم تەنها بیرم لەوەكردەوە كە پڕم كرد بە كیسەیەك چادا و ڕامكرد بۆ بەد بەختی من تواناى ڕاكردنیشم نەبوو هەتا گەلە كۆمەكیان لێ كردم و منیان گرت ئەو خەڵكە هەروەك سەگی هار بەربوونە جەستەم لە هەموو لایەكەوە قاچ و دەستەكانیان منیان ماچ دەكرد.

ئەی هاوڕێگیان چەندە بێزار بووم نەم دەزانی چی بكەم من بەرەو مردن ڕامدەكرد و ئەویش خۆی لێ دەشاردمەوە ناچار دەستم كرد بە هاواركردن بەدەم هاوارەكەمەوە ئەم وت: من دزی دەكەم بۆ دایكە ئافێراكەم، بەڵام ئێوە دزی لە دایكی خۆتان دەكەن لە خاكی خۆتان بۆ ئەوەی خەڵكی تری پێ دەوڵەمەند بكەن ئای سەگ و گورگەكان.

وایان دەزانی کە هۆلاکۆیان گرتووە شەوێک لە زیندان دا مامەوە زیندانیان کردم هەر چۆنێك بوو بەریاندام و گەڕامەوە بۆ کۆستەی چەم، بۆ کۆستەی خەم، بۆ کۆستەی خوێن لە ژێر خێمەکە دا سڵاوم کرد.

مەرگی دایکم پێی وتم: بەخێرهاتی، دایکیشت تۆ خۆش هاوڕێ گیان، تۆش خۆش سەرکردەکان، ئێوەش خۆش هەی دەوڵەمەندەکان چووم بۆ گۆرستان بینێژم.

نەم توانی چوونکە گۆڕەکە بە پارە بوو منیش هیچ پارەم پێ نەبوو تا گۆڕێکی بۆ بکڕم، بەڕاستی من خەڵکی ئەم وڵاتە نیم من تەنها خەڵکی گۆڕستان و ئێوەش نامۆن بە من.

هەتا ناچار بووم لە باخەکەی حاجی فەتاح ویستم گۆڕێکی بۆ گەڵبکەنم لەگەل ئەوەش دا دڵم پارە پارە بوو جەستەی دایکە نازدارەکەم پێ بوو هاتاکو بیشارمەوە، بەڵام هیچ هێزم نەبوو قەبرەکەی بۆ هەڵکەنم ناچار ئەوەندە چاڵێکم بۆ هەڵکەند تا بتوانم تیایدا بیشارمەوە کفنیش نەکرابوو هەر بە سەرپۆشەکەی خۆیم بۆ کردە کفنێك و چرکەیەك لە گۆڕستان دەمهەژێنێت هاوڕێ گیان.

گۆڕستانیش میوانداریم ناکا من سەرهەنگ_م!!دێوە زمەی خەمی دنیا لە خەڵوەتێك دا بۆ من کۆبۆتەوە هەرچی خەمەکانی خۆتە لەگەڵ دەردەکانی من دا بەبای کە بەدوای کەسوکاری منیش دا مەگەڕێ، بەڵام ئەگەر ئەتەوێت بیان دۆزیتەوە باوکم ئەنفال_ە و دایکم کیمیابارانی هەڵەبجەیە و خانەوادەکەشمان بالیسان و قەڵادزەی بریندارە یان گۆڕی شەهیدی گوم ناوە هەر ئەتەوێت بە دوایان دا بگەڕێی فەرموو بپرسە بەدوای سەرهەنگێ بگەڕێ کە ون بووە، بە خوا خێرت دەگا کە بیان دۆزیتەوە.

گەر بینیتنەوە پێیان بڵێ کە سەرهەنگ ئەوەتا لێرەیە و چاوەڕێی یارمەتی و کۆمەکی ئێوەیە، کوای دایە گیان؟ ئەی تۆ بابە گیان؟ ها خەسرەو گیان تۆ لەلام دەمێنیتەوە و دەبیتە میوانم یان تۆش بەجێمدەهێڵیت؟!

وتم: چی بڵێم سەرسام بووم بە ڕاستی شەرمەزار بووم نازانم چی بڵێم، لە کوێوە دەست پێبکەم هەرچی یەك من بیکەم ناگاتە دڵۆپە فرمێسکێکی حەسرەتی تۆ سەرهەنگ گیان، لاشەم وەك شەق شەقەی منداڵ دەلەرزێت و ئارەقی شەرمەزاری دەڕێژم.

سەرهەنگ: ئەگەر دەتوانیت تۆ یەك کارم بۆ بکە من زۆر سوپاست ئەکەم، ئەویش ئەوەیە کە گۆڕێك بکڕیت بۆ ئافێراکەی دایکم، لە ژیانی دا هەر بێ لانە بوو ئێستاش لە نەبوون و مردنیشی هەر بێلانەیە، خۆ ئەگەر تۆ ئەوەم بۆ بکەی ئەوە زۆر سوپاست دەکەم ئەگەر خۆشم نەبەیتەوە لای پزیشکەکە هیچ گریگ نییە.

وتم: سەرهەنگ گیان دڵ لە دڵ مەدە هەموو کارەکانت بۆ بەجێدەهێنم ئەشت بەمە لای پزیشکەکان.

واز لەو قسانە بێنە تۆ خۆت ئامادە بکە با بڕۆین بۆلای پزیشکەکە بە پشتیوانی خوای گەورە هەموو کارەکان ئاسان دەبێت.

کاتێ چووین بۆ لای پزیشکەکە دەستی کرد بە پشکنین و سەیرکردنی لە دوای تێڕامانێکی زۆر بە لاشەی سەرهەنگ دا پزیشکەکە وتی: ئەم نەخۆشییە پێویستی بە چارەسەرێکی گەورە هەیە، ئەم جۆرە چارەسەرکردنەش یان دەبێت ببرێت بۆ ئێران یان بەرەو هەندەران ئەویش پارەیەکی زۆری دەوێت ئەگەر بۆ ئێرانی بەرن ئەوا نزیکەی ٢٥ هەزار تا ٣٠ هەزارێکی تێ دەچێ منیش سەبوریەکم پێ هات، چونکە ئەو پارەیەم هەبوو.

بردمەوە بۆ ماڵێ خۆمان تا لاشە لاوازەکەی کەمێك بحەوێتەوە ئەو ڕۆژەمان بردەسەر و بەیانی کە ڕۆژ بوەوە بە خێرایی چوومە لای مجەوەرەکەی مزگەوتی بن تەبەقو بۆم باسکرد کە ئافرەتێ مردووە دەمانەوێت بیشۆین، وتی خێزانم ئەو کارە دەکات لەگەڵی دا ڕێکەوتم ئەوەمان ئامادە کرد دوایی چووم بۆ گردی سەیوان، لەوێش گۆڕێکم بۆ کڕی لەلای گۆڕهەڵکەنەکان هەموو کارەکانم ئەنجام دا، پاشان بۆ ئەو برا و ئازیزانە کە لە مزگەوت دا دەمناسین ئاگادارم کردنەوە لە کێشەکەی سەرهەنگ، هەموویم بۆ باسکردن ئەوانیش جوامێرانە ئامادەیی خۆیان نیشان دا و بە خۆشحاڵی یەوە، کە هەموو لەو خێرە گەورەیە بەشداری بکەن.

بۆیە هەموو ئەوبرایانە هاتنە لای سەرهەنگ بۆ دڵنەوایی و هاودەنگی ئەو.

سەرهەنگ ئەو کۆبوونەوەی بەلاوە زۆر سەیر بوو بزەی خۆشی و شادی لەسەر سنگی هێلانەیان کردبوو، بێدەنگی باڵی کێشابوو بەسەر سەرهەنگ دا هەربۆیە کاتی نوێژ بوو وتمان بۆ جەماعەتێ بکەین دوعای خێری تیا بکەن بۆ هەموو موسڵمان و ئەو برا شیرینەمان هەرچۆنێك بوو سەرهەنگ_یش لەگەڵمان بەشداریکرد و پاش تەواو بووىمان لە نوێژەکە سەرهەنگ زۆر بە قوڵی بۆ دایکی دەگریا و هەموو لە دەوری کۆبووینەوە دڵنەوایمان دەکرد.

دوو برای خۆشەویست ئامادەیی خۆیان نیشان دا بۆ ئەوەی سەرهەنگ ببەنە ئێران هەموو مەسرەفێکی بکەن تا کارەکەی بە ئەنجام بگات.

بەڕاستی من لە خەم ڕەخسام ئیتر ئارامم گرت دڵنیا بووم، بەڵێ چووین بۆ کۆستەی چەم و دایکی سەرهەنگ_مان لە چاڵەکە دەرهێنا و کفن و دفنێکی باشمان کرد پاشان بەرەو سەیوان بەڕێکەوتین تا جەستەکەی بە

خاك بسپێرین خەڵکێکی زۆر لە ئەهلی مزگەوت دوامان کەوتبوون ئامادەیی خۆیان نیشان دا مەلامان لەگەڵ بوو، بەڵام سەرهەنگ بە مات و ملولی لەو لاوە لە لێواری کۆنکرێتێکی گۆڕێك دا دانیشتبوو بە کوڵ دەگریا پاشان سوپاس و پێزانینی خۆی بۆ خەڵکەکە دووبارە کردەوە دەستی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە کە دوعای خێر بۆ تەواوی ئەو برا و دۆستانەی کە لەم مەراسیمە بەشداریان کردووە کۆمەکیان بکات، بەڵام لە پڕ سەرهەنگ بە لاداهات و کەوت هەموو لێی کۆبوونەوە منیش ڕانم خستە ژێر سەری و بە هێمنی چاوی بەرز کردەوە پێی وتم: گەردەنم ئازاکە.

وتی: دایکم ئارەزووی میوانداریم دەکا، ئەگەر گۆڕێکیش بۆ من ئامادەبکەن خێرتان دەگا.

دەستی خستە ناو دەستم چاوەکانی بەرزکردەوە بە ئارامی سەیرێکی منی کردەوە پاشان چاوەکانی لێك نا و ئەویش بۆ دواجار ماڵئاوایی لە هەمووان کرد بە میوانداری دایکی شاد بوو.

ئەمجارەیان گریان هەموومانی کردە میوانی خۆی چریکەیەك سەرهەنگ خەو لێدەخات، بۆیە هەر لەسەر گۆڕەکەی ئەم دێرەم نووسی کە:-

چریکەیەك سەرهەنگ بە ئاگا دەهێنێتەوە

سەرهەنگ و خاك

ئەم شەو

دڵم کۆچەرێکی شێتە

وەك یعقوب

مەملەکەتی عیشق

لە ترسان دا شەو ڕێ دەکەم

عاصێك

ڕاوم دەنێت

کە بژاری ڕاستی خەیاڵم دەکات

ڕۆمانێکی خۆشەویستی بە جێدەهێڵێت

یوسف

لە زندان دا پڕ شەرم دەکات

خۆشەویستی ئێمە..گوڵە

خۆشەویستی ئێمە..شەرمە

خۆشەویستی ئێمە..چییە؟

بەدوای تاجی سەری کام شا ڕێکەوتوین

ڕەهەندی کام بیر

وروژاندوینی؟

ڕەهێڵەی کام ئەندێشە

کۆیلەی کردوین؟

ڕێژینی کام ژیان

هەژاندینی؟

هێژایان من دەڵیم

بەسە با ئیتر شعر لە گۆڕنێم

لە جیاتی کێلی گۆڕەکەی خامەکەم دادەنێم

کفنەکەی پەڕاوی سپی شعرەکانمی تێوە دەئاڵێنم

بە وشەی خنکاو

گۆڕەکەت پڕ دەکەمەوە!

گوڵ بارانی گۆڕەکەت بە هەناسەی شاعیران دەکەم

شعر نانە، شعر خەمە، شعر بۆنە

شعر گوڵاڵە سورەی وەرزی بەهاری ستەمە!

من نازانم بۆ هەمیشە خەواڵوم دەکەن

لە جیاتی عەتر، مەرگ بارانم دەکەن

من دەمەوێت هۆندراوەیەك مارەکەم لە خاك

تا سەرهەنگ لە دایك بێت

بە لە دایك بوونی لە باوەشی خاکی دایکی دەمرێت.

## کۆتای سەرەتایەکی نوێی مەملەکەتی عیشق_ە

زۆر ماندوو بووم، زۆر هەوڵم داوە زۆریش گریاوم، زۆرم پەیدا کردووە و زۆریشم لە دەست داوە.

وا ئەم ساڵ لە ساڵی ٢٠١٧ یە دەبمە ٤٠ ساڵ و ژیان دەکەم، هەست دەکەم یەك سەدەیە من دەژیم.

ئەوەی خۆشەویست بوو لە دەستم داون یاخود باشترە بڵێم خۆشەویستانی زۆرم لە دەستداوە.

ئەوانەی کە ماون و خۆشەویستن هێندەی ئەوانە نین کە ڕۆشتونەتە جێگای هەقی خۆیان، ئەگەر هیوایەکی نوێ و پاشان ڕێگری نەکرایە لە مردن بەدەستی مرۆڤ خۆی دەمێك بوو ئارەزووی چوونم دەکرد بۆ لای ئازیزان.

شەوێکیان بە دەم گریانەوە ئارەزوی مردنم دەکرد، بەدەم خۆمەوە سۆزێکم دەکرد و دەموت:

ئەوا ڕۆشتن ئازیزان..بەجێهانهێشت هەوارگەی ژین

سارا و دەشت و کێوی دڵی من..لە دایەیدا بوون بە برین

مردن وەرە و لام چۆڵ مەکە..کەی میوانداری من دەکەی

من ئازیزانم هەمووی لای تۆن..کە چی تۆ خۆتم لێ ون دەکەیت

دە وەرە دەی هەوارگەی ژینی من بێ پەرژینە

"ئەم غوربەتە و سەرما و سۆڵە هەناوی منی لەتکردووە

تۆ سەرێك بدە لەم ژینەم بزانە تامەزرۆی چییە

کە تۆ هاتی بمبەرەوە بۆ خلود و دام بماڵە لەم ژینە نەهاتمەتییە

مانای وانییە کەسێکی فاشیلم لە ژیان دا، نا_ بەڵکو سوپاسی خوای پەروەردگارم دەکەم لەسەر ئەو هەموو ناز و نیعمەتەی بە منی بەخشییوە.

لە پارە، لە گەنجی، لە ژنی باش، لە منداڵی جوان، لە باشترین ژیان، لە لەشی ساغی، لە سومعەی باش...هتد.

ئاوات خواستنیش بە مەرگ تاوان نییە، لە قورئان دا چەندین کەسی باش ئاواتیان بە مەرگ خواستووە وەك خاتوو مەریەم دایکی عیسا سەلامی خوای لێبێت وەك پێغەمبەر یوسف...هتد

لێرە ئامانج لەم بەسەرهاتەی ژیان کە بۆ ئێوەی بەڕێزم باسکرد پێ پێگەیاندنی ئێوەیە، چونکە هەست دەکەم قسەی ئەکادیمی و چوونە ناو باسە ئاکارییەکان هێندەی چیرۆکێك کاریگەری ناکاتە سەر ناخی ئێوەی هاونیشتیمانیم.

لە ڕاستی دا ناخ و سایکۆلۆژیەتی ئێوەم باش ورد کردۆتەوە، لێتان ناشارمەوە ئەگەر بڵێم یەك بە یەکتان دەناسم و لە ناو ناخیشتان دا یاری دەکەم، بڕوابکەن کەمم وتوە، نەك لەبەر ئەوەی زانام یاخود خوانەخواستە لە زانستی غەیبی دەزانم یان پەنا دەگرم بەخوا فاڵ بگرمەوە، نا بەڵام دەرئەنجامی ژیانم لەگەڵتان دا و تێکەڵبوونم بە کچان و کوڕان و بە پیر و پیاوان و ژنان ئەو ئوزمونەی داومەتێ، کە بەڕاستی شانازی بە خۆمەوە دەکەم کە لە خزمەتی ئێوەدام، ئەمەش لە ئێوەوە دەستم کەوتووە، کە سوپاسی مەعبودم دەکەم لەسەری.

بڕوابکەن دەمتوانی بە زمانێك بنوسم كەس لێم تێنەگات و بڵێم ڕۆشنبیرم و دەتوانم وشە ڕێکبخەم و یاری بە ئەدەبیات بکەم، بەڵام زۆر حەزمکرد بە ناختان دا شۆڕ ببمەوە و لەگەڵ ناخی ئێوە دا قسە بکەم، هەستدەکەم سەرکەوتوو بووم، دووبارە سوپاس بۆخوا.

ئەم ئەلوبە ڕاستە ئیرتجالییە گرتومەتە بەر، واتا شتی ئاسایی و سادە و زمانی ناو خەڵکی ئاساییە.

ئەدەبی ئیرتجالی ئەدەبی کلتوری ناو شەقامە، ناوەخنەکەی پریەتی لە ڕۆشنبیری قورس، بەڵام بە زمانێکی سادە، ویستومە بۆ دکتۆرێك قسە بکەم، لە هەمانکات دا بۆ عەرەبانچییەکیش، لەگەڵ ناخی کچێك دا قسەم کردووە، هەستم کردووە کوڕیش دڵی لامە، قسەم بۆ قوتابییەکی زانکۆ کردووە، لە هەمانکات دا بۆ دەیان کەسی سەرەتایی کە تەنها توانای خوێندنەوەیان هەیە، ویستومە ئەوانیش بدوێنم، ئەم ئسلوبە_ ئسلوبی قورئانییە.

چۆن؟!

خوای گەورە ئاماژەی بەوە کردووە کە باسی چیرۆک و مێژوومان بۆ دەکات دەفەرموێت بۆ ئەوانەی کە خاوەنی بیرن و هزرڤانن ئەوانە دەبێت بیری لێبکەنەوە، کەواتە ئەم ئاماژەیە بۆ ئەوەیە کە وانەی زۆر گرینگی تێدایە وەك دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَٰهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخْلَدَ إِلَى ٱلْأَرْضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ ۚ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ ٱلْكَلْبِ إِن تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَث ۚ ذَّٰلِكَ مَثَلُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا ۚ فَٱقْصُصِ ٱلْقَصَصَ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٧٦﴾﴾ [الأعراف]

چیرۆکی بەسەرهاتەکان دەبێتە هۆکاری پەند ئامێز بۆ خەڵکی.




کەواتە مێژوو زۆر گرینگە، دەبێت هەموو ڕەهەندەکانی بیخوێنینەوە، ئەمە چیرۆك نییە، ئەمە ڕەهەندی واقعی کۆمەڵگاکەمانە و مێژووە، واتا زانستی مێژووە، ڕەهەندەکانی خوێندنەوەی من بۆ مێژوو بریتیە لە:

ڕەهەندی یەکەم: توراسی میللەت و گەنجینەیەتی

ڕەهەندی دووەم: پێوەری گەورە پیاوانییەتی بۆ دروستکردنی شارستانییەتی و ڕۆشنبیری.

ڕەهەندی سێیەم: یادگاری ئەلبومی خەڵکەکەیە وەك شێعر و ژیانی ڕۆژانەیان.

ڕەهەندی چوارەم: پەند و ئامۆژگاری لەسەر وەردەگیرێت و خەڵکی لەسەر پەروەردە دەکرێت.

ڕەهەندی پێنجەم: ئەزموونی پیاو چاك و خراپەکاران ئاشنا دەکەیت بە ئەزمونت.

ڕەهەندی شەشەم: مێژوو زانستێکی ڕابردووە سودی هەیە و پاڵپشتە بۆ ئێستا، باشترین ئەزموونە بۆ داهاتوو.

ئیستا لەوانەیە هەست بکەیت لە ناو ئەدەبیاتێکی ئیرتجالی دا، ئەدەبیاتێکی ئەکادیمیتان ناسیوە بەبێ ئەوەی مانوتان بکەم و هەمووتان حەزتان پێکردووە بە تەشویقەوە خوێندوتانەتەوە.

لە هەمووی گرینگتر وەرزشتان پێ دەکەم بۆ ئەوەی سەرلەنوێ کلتوری خوێندنەوە فێربن، کە ماوەیەکی زۆر دوور و درێژە خوێندنەوە لەناو ئێمە دا نامۆیە، ئەزانن؟

ویستم فێری ئەوەتان بکەم کە ژیان بریتی نییە لە کات، بەڵکو ژیان بریتیە لە ئێمە.

ئەوە کات نییە کە دەڕوات، بەڵکو ئەوە ئێمەین کە دەڕۆین!





ئەمەوێت پێتان بڵێم کە خوای گەورە هەمیشە خۆشیدەوێن، بەو مەرجەی تەکەبورمان نەبێت و خۆمان بە زل نەزانین لە ئاستی تەوبە کردن و تاوانەکانمان دا.

هاوینی ساڵی ١٩٩٥ زۆر تەوبەم کرد و تەوبەکانم شکاند، شەوێکیان پەروەردگارم لە خۆم ڕەنجاند ئیتر وام زانی خوا خۆشی ناوێم چوومە ناو جێگاکەم چەند دڵۆپێك لە فرمێسك بە چاوام دا هاتە خوارەوە و خەوم لێکەوت.

بەیانی دایکم خەبەری کردمەوە وتی: نازانی ئەم شەو چ بارانێك باری.

لە مەملەکەتی عیشق دا ئەوەم بۆ باسکردن ناڕاستەوخۆ کە خوای گەورە کەی پێت پێدەکەنێ.

ئەوکاتەی کە نزا دەکەیت و لات وایە مەحاڵە کە نزاکەت گیرابێت.

ویستم پێتان بڵێم ناوچاوانمان هەموو بخەینە سەرخۆڵ بۆ سوجدەبردن، تەنها شایەنی عەزەمەتی مەعبودمان الله یە، یاخود فێربن و بڵێن:

یا فتاح

واتا کلیلی دڵی من لە دەستی زاتی دۆتایە

بۆنی نایابی بەهەشتت لە هەموو ناو و سیفاتە جوانەکانتایە

ئەیانخەمە سەر برینەکانی دڵم

فەرمووتە الجبار..م

واتا تۆڵەی دڵشکاوان وەردەگریتەوە

فەرمووتە الشافی..م

واتا زاتێکە کە شیفای هەموو برینە قوڵ و بێدەرمانەکان ئەدات

هەوای دڵمان سوك دەبێت کاتێك کە زمزمەی ناوە جوانەکانت دەکەیت لەگەڵ سیفاتە بەرزەکانت.

ئەمەوێت لە مەملەکەتی عیشق دا فێربین بڵێین حەزرەتی مەعبودی ئێمە تۆ نزیکی زۆر دڵنیياین، بەڵام ئەوە ئێمەین ڕەنگی گەردنمان نادۆزینەوە، ٻمانبەخشە بە گەورەی خۆت بەجدی ویستم فێربین کە هەندێك جار خوای پەروەردگار ئەوەندە زوو بە دەم داواکاریەکانمانەوە دێت، کە بڕواناکەین ئەوە لەلایەن خوای موتەعالەوە بێت، بەڵکو دەڵێین بە خوا شانسێکی باشمان هەیە.

بۆیە دەبێت بڵێین: پەروەردگارە ئێمە هەموو بێچارەین تەنها زاتی بەرزت چارەیە.

ئێمە هەموو بێدەسەڵاتین تەنها زاتی بەرزت دەسەڵاتدارە.

مەملەکەتی عیشق بریتی بوو لە:

هەمیشە سەرم بەرزە، چونکە لای سەروومەوە خوای گەورەیە.

کەواتە پێویستە بڵێین:

اللهم اغفر لی

کە ئەمانەتەکەتم پیس و ڕەش کردۆتەوە

الهم اغفر لی

کە من ئەو منە نیم کە پێت سپاردم

الهم اغفر لی

کە زاڵم دەرچووم ئەو پەیمانەی بە تۆم دابوو شکاندم

اللهم اغفر لی

خوایە لێم خۆشبە، شکستم بە خۆم، سەربەرزم بە زاتی تۆ

کەواتە منیش ویستم لەم مەملەکەتە دا بڵێم: کاتێك دەتەوێت ژیان و هەست و نەستی خۆت بنووسیتەوە، ڕێگا مەدە کەسێکی دیکە لە جیاتی تۆ قەڵەم بگرێ بەدەستیەوە.



نمونەی وەك تۆ تەنها یەك دانە هەیە لە هەموو جیهان دا، کەواتە قەدری خۆت بزانە هاوڕێ گیان.

ئاگادار بن لەوەی کە مەملەکەتی عیشق پێی وتین: ئەوەی خوای پەروەردگار دەیبەخشێت کۆتایی نییە، ئەوەی کە خەڵکی ببەخشێت بەردەوامی نییە.

ئەم مەملەکەتە وتە ی تایبەتی هەیە بریتی بوو لەوەی کە پێی وتین:-

سەختە قەڵەم بیت و دڵتەنگ نەبیت

لەگەڵ تیغدا ڕێ بکەیت و بەرد نەبیت

سەختە کە دڵت بتاشن بە قەڵەمدادەرو پێبکەنیت

لەگەڵتا بجەنگن و تۆ هەر لە خەیاڵدا بیت

لە دەردی دڵی شاعیری عاشق بنووسیت

لەگەڵ خەڵکی سەد ڕەنگ دا هەمان ڕەنگ نەبیت

هەروەك قەڵەم پاڵبدەیتەوە بەیەك قاچ، بەڵام

هاتە سەرەی خۆت شەل نەبیت

سەختە بزانیت و لێو لە لێو نەترازێنیت

سەختە خۆت بیت و بێ ڕەنگ نەبیت

کاتێك کە قەڵەمی دایە دەستم حەزرەتی ئوستاز

وتی خوای پەروەردگار وستویەتی کە دڵتەنگ نەبیت

لێم تێگەیشتن؟ کۆتایی پێبهێنم؟

نا بڕواناکەم تۆزێکی ترتان بۆ باسدەکەم...

لێرەوە سەرەتایەکی نوێیە قۆناغێکی تر دەست پێدەکات، دەشێت لە بەشێکی تر دا بێمەوە لاتان و ژیانێکی تر بۆ ئێوە باسبکەم، کە ئەمجارە لیوان لێو بێت لە ئەزموونی پیاو و پیریەتی.

ئێستا وامان لێهاتووە لەم کۆمەڵگایە دا هەرچی دەکەین ئاساییە، بەس گرینگ ئەوەیە خۆمان نەبین، دەبێ هەوڵ بدەین کە خۆمان زیندوو بکەینەوە، چونکە ئەم جیهانە زۆر گەورەیە جێگای هەمووومان دەبێتەوە، پێش ئەوەی کە تۆ جێگای خەڵکی تر بگریتەوە، جێگای واقعی خۆت بدۆزیتەوە.

پێویست ناکات هەمو شەوێك ئەو درۆیە بکەیت و بڵێیت دەچین دەخەوین ئەو سەرینەمان لێ ببێتە سینەما و بە ڕابوردومان دا بچینەوە.

یان پەنجەرەیەکمان بۆ دەکرێتەوە بەدەم گریانی ڕابردوومانەوە سەردەنێینەوە.

کێشەکەش لەوە دایە ناتوانین تا ئێستاش ئەوەی دەمانەوێت بیڵێین.

ئینجا بە ماندووبونێکی زۆرەوە دەڵێمەوە پێتان بۆیە.

نەگەیتە مەملەکەتی ڕاستی، حەمەن خەلەلێك هەیە.

دوای تۆزێك لە ئارامی هەستدەکەم چاککردنی خەلەلەکە دەبێت بە:-

چاکسازی و ئیرادەی ئەبوبەکر بێت،

دادپەروەری عومەری لەگەڵ بێت،

بە بەخشینی عوسمان بوونی هەبێت،

بە ئارامی عەلی دروستدەبێت،

واتا بە شۆڕشی هاوەڵانی محەممەد چارەسەر دەکرێت (دروودی خوای لێبیت) تەواو بووم، بەڵام لە بەشی یەکەم دا لە کێدا کۆتایی هاتووە، لە بەشی دووەم دا لەوێوە دەست پێدەکەینەوە.

کەواتە لیرەوە سەرەتایە نەك_ کۆتایی..جاری دانیشن بەخێر....

(فستذ كرون ما أقول لكم وأفوض أمري إلى الله إن الله بصير بالعباد)





جا له ئاینده دا ڕۆژێك دێت، ئەم قسانەی منتان بێتەوە یاد، ئێستاکەش من و خۆم و کار و بارەکانم دەدەمە دەست خوا و پشت بە خوا دەبەستم، چونکە بێگومان خوا بینایە بە بەندەکان.

# پێڕست

# MAKWAN KERÎM

## MEMILEKETÎ 'ÎŞQ

# مەملەکەتی عیشق

کتێبی مەملەکەتی عیشق

ڤالانتاین بەهانەیەکە بۆ ئەوکەسانەی دنیایان خاڵییە لە مەحوی و نالی و دیلان.
واتای چییە؟
نەک بۆمن کە هەموو ڕۆژێک بەهانەیەکی دروست دەکەم، تا لە ڕووداوی چاوەکانتا شعرێ بنوسن.
نەک بۆمن کە مەحەبەت و خۆشەویستی بەتەواوی لاپەڕەکانی ڕۆژمێرەکەمدا خەتی لێدراوە، باشتر وایە بزانیت لەو دونیایەی کە منی لێ دەژیم تەواوی ڕۆژەکانی تایبەتە بەتۆ، تەنانەت ڕۆژی لەدایک بوونیش.

تەنانەت ئەو ڕۆژەشم کە نیگام بۆ هەمیشە لە بێ موحەبەتی ئەهلی ئەم زەمینە وەردەگێرم.
خەیاڵی تۆ پەرداخێک ئاوە کە هەموو شەوێک لەلای سەرمەوە دایدەنێم، نیوەی شەوان لە خەوی نەبوونی تۆ ڕادەچڵەکێم و قومێکت لێدەنۆشم و ئارامم دەکاتەوە، ئەم چیرۆکەش بەردەوامە.
نیوەی شەوە مانگ لە نیوەی ئاسماندا جێگای خۆش کردووە تۆش لە دڵی مندا، تل لێئەدەم لەملا بۆ ئەولا لەگەڵ هەر تل لێدانێکمدا لە تۆ نزیک دەبمەوە، بەم شێوەیە ئەم شەوەم لەگەڵ تۆ دەگوزەرێنم، ئەی بەیانی بێ تۆ چی بکەم؟ هەندێکجار گەرمی وتنی خۆشم ئەووێت لە هەموو جلەکان گەرمترە.

تەنهایی ڕووداوێکی سەختە کە هەموو شەوێک دێتە باوەشی من، کەم دڵتەنگم؟ کەم جێگای خاڵیم هەیە؟ ئاسمان هەر ئەبارێ و هەر ئەبارێ، شەوان کە دڵتەنگت ئەبم لەم شان بۆ ئەو شان تل ئەدەم وەکو ماسی دورکەوتووەوە لە دەریا، خۆزگە ئەتبینی چۆن گیان ئەدەم.
من وام دەزانی ساڵەکان ئەبێت تێپەڕێنت تا هەر جارەو ساڵێک گەورەتر دەبێت، بەڵام ئەمە ڕاست نییە، ئەم ڕووداوە دەتوانێک لە یەک شەودا ڕووبدات.
وتی لەبیرم مەکە، من لە هیچ شەقامێکدا لەگەڵ تۆ پیاسەم نەکردوە!
زمانم لاڵ بوو کە پێی بڵێم ڕاست دەکەیت پیاسەمان نەکردوە، بەڵام لە تەواوی کۆڵانەکانی ئەم سلێمانییە بەیادی تۆوە بووم.
ئەمەوێ لەم مەملەکەتەدا ببمە زەوی لە ڕووداوێکی گەردوونیدا لە دەورت بگەڕێنم، تا ببینی چ خۆزێکی لە ژیانی مندا، تا ببینی چۆن گیانم پێ دەبەخشێت گەرمایی بوونت.





کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی

لقی یەکەم: هەولێر - بەرانبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری

لقی دووەم: چوارڕیانی شێخ مەحموود - بەرانبەر مزگەوتی مەحموود عەللاف

٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤ - ٠٧٨٢٤٦٧١٣٩٤

M.Ktebxan

نرخ: ٨٠٠٠

Cover Design: **Braw** Al-Najjar